# کوردستان
# لە
# رۆژگارە سەختەکاندا

**کۆمەڵە وتارێکی سیاسی شیکاری رەخنەئامێزە**

**د. کامەران مەنتك**

**2021**

**وتەیەک بۆ مێژوو...**

خوێنەری بەڕێز

ئەم وتارانە لە رۆژگارێکدا نوسراون، کە کوردستان بە دۆخێکی ئێجگار سەختدا رەتدەبێت، لەدەرەوە هاوسەنگی هێزی جیهانی گۆڕاوەو ئەم ئەزموونەی نزیکەی 29 ساڵە لەکوردستان بەردەوامە، لەبەردەم مەترسیەکی جدیدایە، جێگای داخە کورد خۆی تا ئێستا لەو مەترسیانە نەگەیشتووە، بۆیە لە ناوەوە خەریکی ملشکاندنی یەکترەو ئاگای لەوە نەماوە چی لە دەوروبەریدا دەگوزەرێت! راستە ئەو حیزبانەی کوردستان نەک هەر لە ئاستی بەرپرسیاریەتی مێژوویدا نەبوون، بەڵکو ئەوەی دوژمنانیش بۆیان نەچووە سەر بەرامبەر خەڵکی کوردستان کردیان، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت جیاوازی بکرێت لەنێوان ئەو حیزبانەو قەوارەی هەرێمی کوردستان، کە بەرهەمی قۆناغێکی مێژوویی زۆر هەستیارەو ئەگەر لەدەست بچێت، رەنگ بێت بۆ چەند ساڵی تر دوویارە نەبێتەوە.

ئەم وتارانە لەرۆژگارێکدا نوسراون، کە کوردستان لەگەڕەلاوژەیەکی ترسناکدا دەژیت، شەڕێکی قێزەون بۆ تێکشکاندن و تەنانەت سووککردنی کەسایەتی تاکی کورد دەکرێت، ئەو شەڕەش لە پەنای رۆشنبیرو سیاسەتمەدارو ئۆپۆزسیۆن و دەسەڵات، بەدەستی کورد خۆی دەکرێت.

ئامڕازەکانی گەیاندن، کە بۆ زۆر لە نەتەوەکانی تر بۆتە خێرو بەرەو پێشکەوتنیان دەبات، لای ئێمە زۆر بەخراپی بەکاردەهێنرێت و دەتوانین بڵێین تارادەیەکی زۆر لەلایەن دوژمنانی کوردەوە ئاڕاستە دەکرێت، بەشێوەیەک وایکردووە هەموان کار لەسەر ناشرینکردنی ئەو کۆمەڵگایە بکەن، ئەو هەموو جوانیانە نەبینن، کە سەرباری ئەو شەڕە نەگریسە تاوەکو ئێستا کۆمەڵگای کوردی توانیوتی بیپارێزێت.

ئەم وتارانە لە رۆژگارێکدا نوسراون، کە مەسەلەی کورد لە هەموو پارچەکانی کوردستان لە پاشەکشەدایە، هێزە هەرێمی و نێودەوڵەتیەکان خوێنی کوردیان لا هەرزانەو هەمیشە وەک کارتێک بەکاریدەهێنن لەو ململانێیە ئاڵۆزەدا، هێزە کوردیەکان، بەتایبەتی هێزەکانی باشوری کوردستان ئیرادەی سیاسیان لەدەستداوەو وەکو پوشێکی دەم با لەگەڵ گۆڕانکاریەکان دەلەرنەوەو بەرپرسانی ئەو حیزبانەش هەموو مەسەلە نیشتمانیەکانیان تووڕ هەڵداوەو خەریکی دزین دادۆشینی کوردستانن!

هیوادارم ئەو وتارانە ئاوێنەیەک بێت بۆ ئەو رۆژە سەختانەو نەوەی ئایندە بتوانێت شتەکان وەک ئەوە ببینێت، کە روویداوە، لەنێو ئەو جەنجاڵی و شێواندنەدا، راستیەکان ببین وەک ئەوەی روویداوە، نەک وەک ئەوەی هێزەکانی دەیانەوێت و کار بۆ فریودانی ئایندەش دەکەن، هەوڵدەدەن راستیەکان دیزەبەدەرخۆنە بکەن و رووی راستەقینەی خۆیان لەمێژوو بشارنەوە.

بەهۆی ئەو دۆخە سەختەو ئەو قۆناغەی خوێندنەوەو تەنانەت بڵاوکراوەی کاغەز پیایدا تێدەپەڕێت، بە باشمان وەکو کتێبێکی ئەلیکترۆنی کۆی ئەم وتارانە بڵاو بکەینەوە، کە بۆ خوێنەر ئاسانتر بەردەست دەبێت و دەگاتە هەموو ماڵێک، هیوادارم بەم کارە توانیبێتمان وەک دەڵێن بەردێک بخەمە سەر بەردێک و ئاوێنەیەکی روون و بێگەرد بین بۆ ئەو قۆناغە.

**تێبینی: زۆرینەی ئەم وتارانە لە لاپەڕەی نوسەر لە فەیس بووک بڵاوکراوەتەوە، دواتر زۆربەی پێگەو ماڵپەڕە ئەلیکترۆنیەکان لێیان وەرگرتووەو بڵاویانکردۆتەوە.**

د.کامەران مەنتک

2021\1\1

هەولێر

**ئەگەر توركيا هێرش بكات، كورد پێویسته شەڕەكە فراوان بكات!.**

هاوكێشەكانی ناوچەكە ئێجگار ئاڵۆز بووەو سیستەمی جیهانی بە كردەیی وا گۆڕانكاری بەسەر دادێت، ئەوەی جێگای داخە خەریكە هاوسەنگیەكان بە پێچەوانەی بەرژەوەندیەكانی كورد لە هەموو پارچەكانی كوردستان یەكلایی دەبێتەوە. ئەو هاوپەیمانیەتیە سێلایەنیەی لە نێوان روسیاو توركیاو ئێران بە شێوەیەكی راستەوخۆ و چین بە شێوەیەكی نا راستەوخۆ دروست بووە، پێدەچێت تێكشكاندنی هەژموونی ئەمریكا لە ناوچەكە لە تێكشكاندنی كورد و ئەزموونی كوردی لە هەموو كوردستان بدۆزنەوە!. بەداخەوە دەوڵەتە ئەوروپیەكانیش، بەتایبەتی ئەڵمانیا، ئەویش بەهەڵوێستەكانی بەرامبەر كوردو مەسەلە ئاڵۆزەكانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، دەیەوێت تۆڵەی هەردوو جەنگی یەكەم و دووەمی جیهانی لە ئەمریكا بكاتەوە، لەئێستادا بەشێوەیەكی نا ڕاستەوخۆ بەرژەوەندیە ستراتیژیەكانی خۆی لە بەرەی ئۆراسیا دەدۆزیتەوە، هەرچەندە بە هەموو شێوەیەك هەوڵی شاردنەوەی ئەمە دەدات!.

دەوڵەتە هەرێمیەكان، مەبەستم ئەو دەوڵەتانەیە، كە كوردستانیان بەسەر دابەشكراوە، توركیا وەك بەشێك لە هاوپەیمانی ناتۆ پێشڕەوایەتیان دەكات بۆ لێدان و سڕینەوەی كورد، هەوڵدەدرێت ئەمجارەیان لەسەر بنەمای گۆڕینی دیمۆگرافیای كوردستان، كوردستان

دابەش بکرێتەوە و دیواری مرۆیی لە نەتەوەیی جیاواز لەسەر سنوورە دەستکردەکانی دوای جەنگی یەکەمی جیهانی دروست بکرێت!. کەواتە مەترسی ئەم قۆناغە بە تەنیا مەترسی نیە لەسەر خاک، بەڵکو مەترسیە لەسەر بنەما ئەتنیکیەکان و مرۆڤبوونی کورد. تورکیا لەسەر دوو ئاست ئەم شەڕە دەکات، ئاستێکی راستەوخۆ، کە سوپا چەکدارکراوەکەی بە چەکی ناتۆو بە پلەی یەکەم ئەلمانیاو ئەمریکا، بەم دواییە روسیا، لەسەر سنوورەکانی رۆژئاوای کوردستان کۆکردۆتەوەو هەڕەشەی داگیرکردنی دەکات. لە باشوریش بەدرێژایی سنوورەکان رۆژئاواو باشوری کوردستان، ناوچەیەکی زۆری داگیرکردوەو ئیرادەی خەڵکی باشووری هەوسار کردووە. ئەمە جگە لەوەی نیوکەوانەییەکی هەواڵگری و سەربازی لە دەوروبەری شەنگال – بەعشیقە – خەبات (کەلەکی یاسین ئاغای) – تا مەخمورو لەوێشەوە بۆ کەرکوکو ناوچەکانی دەڤەری سەوز ئامادەکردووە. لە لایەکی تر کار لەسەر خۆشکردنی شەڕی ئاگرێکی تری کوردی – کوردی دەکات، بۆ ئەوەی مەسەلەکە بکاتە مەسەلەیەکی ناوخۆیی کوردو رەهەندە سیاسی و جیۆپۆلەتیکیەکانی بشارێتەوە. ئەمەی لەم قۆناغەدا روودەدات مەترسی زۆر جدین، ئەگەر رێگای پێینەگیرێت و دەوڵەتانی رۆژئاواو بە تایبەتی ئەمریکا رێگا بەو کارەساتە نەگرن، پێویستە کورد هەوڵبدات چوارچێوەی شەڕەکە فراوان بکات و چیتر ناوماڵی خۆی نەکاتە گۆرەپانی شەڕ. پێم وایە ناکرێت لە ترسی دایسانی جەنگێکی تری جیهانی رێگا بدرێت کوردستان بکرێتە قوربانی!. ئەگەر بڕیار بێت ئەو جەنگە هەر رووبدات با

فراوان بێت و هەموو ئەوانەش بسوتینێت، کە دەیانەوێت کوردستان بسووتێنن. لە دۆخێکی ئاڵۆزی هاوسەنگی هیزی وەکو ئێستای ناوچەکە، ئەگەر لەکورد بدرێت، رەنگە زۆر گران نەبێت بۆ کورد، کە هەوڵ بدات چوارچێوەی شەڕەکە فراوان بکات!. باهەموو ناوچەکە بە دەردی کورد بچێت. دەبێت لەو بارەیەوە بڕیاری بوێرانە بدرێت. کە شەڕ کەوتە سەرخاکی ئێمە با بکەوێتە سەر خاکی ئەو وڵاتانەش، کە دەیانەوێت شەڕەکە بگوازنەوە ناو ماڵی کورد.

2018\8\6

## تیرۆری یاسایی

مەبەستم لە تیرۆری یاسایی ئەوەیە، کە دەسەڵاتی سیاسی دام و دەزگایاساییەکان بەکاربهینیت لەپێناو چاوترساندنی خەڵکو سەرکوتکردنی رای گشتی، نمونەی ئەو جۆرە تیرۆرە لە زۆرلە وڵاتانی جیهان، بەتایبەتی ولاتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەیە، بۆ نمونە ئەو جۆرە تیرۆرە لە تورکیا بە شێوەیەکی زۆر فروان بەکاردەهێنریت، دەسەڵاتی تورکیا یاسا بەکاردەهێنێت بۆ سەرکوتکردنی رکابەرەکانی، بەتایبەتیش کورد، رۆژانە دەبینین لە میدیاکاندا چۆن تێکۆشەرانی کورد راپێچی دادگاکان دەکەن و تەنانەت بە شێوەیەک لە شێوەکان لە پەنای یاسای تیرۆرەوە مافە دەستوریە بنەڕەتیەکان لە هاوڵاتیانی کورد دەسەننەوە. لە ئێرانیش بە هەمان شێوە، رۆژانە دەیان گەنجی کورد لە سیدارە دەدرێت. لەعێراقیش چ لەسەردەمی رژێمی بەعس و چ لەکاتی ئێستادا ئەم تیرۆرە بە شیوەیەکی بەرفراون، وەک ئاماژەم پێکرد لە پەنای یاسای تیرۆردا پیادە دەکرێت. دیارە لە هەریمی کوردستانیش دەسەلاتی کوردی ئەم جۆرە تیرۆرەی بەکارهیناوە و سوودی لیپوەرگرتوە، بۆ نمونە لە ساڵانی 2011-2012 پارتی دیموکراتی کوردستان دادگای بەکارهێنا بۆ ئەوەی رای ئازاد لە کوردستان سەرکوت بکات، یاخود نووسەران چاوترسای بکات بە داواکردنی بڕی پارەی خەیاڵی، وەک قەرەبوو لەو نوسەرانەی شتیان بە پێچەوانەی بەرژەوەندیەکانی ئەو نووسیبوو، لەکاتێکدا دەبوایە دادگاکانی کوردستان ئەو جۆرە داوایانە رەتبکەنەوە، لەبەر ئەوەی ئەمە هەوڵێک بوو بۆ بەکارهینانی دادگا بۆ مەبەستە حزبیەکان، لە مادەی حەوتی یاسای

مەدەنی عیراقی داهاتووە: بەکارهێنانی ماف ریگا پێدراو نیە ئەگەر هاتوو مەبەست تیایدا تەنیا زیان گەیاندن بێت بە خەلکانی تر، یاخود ئەو بەرژەوەندەی بەدەستی دینیت، بەبەراورد لەگەڵ ئەو زیانەی بە بەرامبەرەکەی دەکەوێت کەمتر بێت ، بۆیە دەبێت برِی ئەو قەرەبووەی داوا دەکریت بگونجێت لەگەڵ ئەو تاوانەی ئەنجام دراوە.

دەسەڵات تیرۆری یاسایی بە مەبەستی ئەوە بەکاردەهێنێت بۆ ئەوەی شەرعیەت بداتە ئەو تاوانانەی بەرامبەر خەڵک ئەنجامی دەدات، کەسایەتی دەسەلاتە دیکتاتۆریەکان دەیانەوێت رووی راستەقینەی خۆیان لە پەنای ئەو بە یاسایی کردنە بشارنەوەو خۆیان وەک دیموکراسی خوازیک نیشان بدەن. بە کورتی دەمەوێت بڵێم مۆدێلێکی تر لە تیرۆر لە ئارادایەو دەسەڵاتە سیاسیەکان بەکاریدەهێنن بۆ بچووکردنەوەی چوارچێوەی ئازادیەکان و چاوترساندنی خەڵک، ئەم تیرۆرە لە تیرۆری سیاسی مەترسیدارترە، چونکە لە بەشیکیدا تیرۆری سیاسیش و تەنانەت تیرۆی ئاسایش لە خۆوە دەگرێت!.

2018\9\4

## پێشبڕکێ لەسەر خیانەت!

چەند ساڵێک لەمەوبەر وتارێکم لە ژێرناوی لە رەخنەوە بۆ ئەلتەرناتیڤ نووسی و لە رۆژنامەی هاوڵاتی بڵاوکرایەوە، لەو وتارەدا ئاماژەم بەوە کردبوو کەوا قۆناغی رەخنەگرتن لەو دووحیزبە بە کۆتا هاتووەو پێویستە رۆشنبیرو ئەلیتی کوردی (ئەگەر هەبێت)، بە دوای ئەلتەرناتیڤدا بگەڕێ و چیتر لە مەداری ئەو دوو بنەماڵە سیاسیەی کوردستان نەخولێتەوەو زیاتر نەیانکات بەسەنتەر، لەبەرئەوەی رەخنە ئەگەر قۆناغی زەمەنی خۆی تێپەڕاند، هەم خۆی و هەم هەموو کایەو بەهاکانی تری ناو کۆمەڵگاچرووک دەکات! چونکە کاتێک رەخنە دەگیرێت، کە بوارێک مابێت بۆ چاکسازی و شوێنێکی بێ پەڵەی خیانەت مابێت لەسەر جەستەی ئەو دوو هێزەی کوردستان!.

ناکرێت رەخنە بەردەوام بێت لەسەر هێزو کەسان و بنەمالەیەک، کە پێشبڕکێیان بێت لەسەر خیانەت، تەنانەت مانەوەی خۆیان لەسەر دەستی داگیرکەران و دوژمنانی کوردستان ببیننەوەو شەڕی مەسەلەی کوردیان لەهەموو پارچەکانی کوردستان بۆ بکەن!،وایدەبینم، کە لە لایەک ئەو هیزانە خۆیان پاڵپشتی ئەو گەڕەلاوژەو مەهزەلەیە بکەن، کە بەناوی رەخنەو رەخنەکاریەوە دەکرێت و لە پشت پەردەوە دەستی یارمەتی بۆ درێژ بکەن، کە بازاری ئەوان گەرم دەکات و وەک سەنتەر دەیانهێڵێتەوە،

وا نیشانی خەڵک دەدات، کە ئەوان تاکە هێزی نەتەوەیی و نیشتمانین و ئەلتەرناتیڤیان نیە، تەنانەت لەو هێزانەش باشترن، کە دەیانەوێت وەک ئەلتەرناتیڤ بێنە پێشەوە. لە لایەکی تر نیشانەی ئیفلاسی سیاسی و هزری خودی رەخنە گرەکانە! تۆ چ رەخنەیەک لە هێزێک دەگری، کە پیرۆزترین بەهاکانی نەتەوەیەک لە پێناو مانەوەو بەرژەوەندیەکانی خۆیدا بەکاردەهێنێت، ئەو رەخنە چرووکانە، خۆیان هۆکاری سەرەکین بۆ ئەوەی خەڵکی کوردستان بەو شێوە ترسناکە دووچاری بێ ئومێدی بووبێت!، گومانی تیا نەماوە کەوا ئەو هێزە بێ ئیرادانەی کوردستان دەست لەناو دەستی داگیرکەران شەڕی میللەتی کورد دەکەن، کاتێک بەردەوام رەخنە لەو هێزانە دەگیرێت و وەک هێزی سەرەکی وێنا دەکرێن و دەخرێنە بەرچاوی خەڵک، واتای ئەوەیە رەخنەگرتنیش لەو جۆرە دەسەڵاتە پاشاگەردانیەکی بیرکردنەوەیەو دەرگا بە رووی گەڕان بەدوای هەر ئەلتەرناتیڤێگی تر دادەخات، رەنگ یەکێک لە هۆیە سەرەکیەکانی ئەو فەوزاو بێ هیواییەی لە هەرێمی کوردستان هەیە، ئەو بەناو رەخنانە دروستیان کردوە! کە جگە لە قسەی بازاڕی و جوێنی مەدەنی و شارستانیانە زیاتر هیچی تریان پێ نیە! گۆڕینی میکانیزمی بەناو خەباتێک، کە نزیکەی سەد ساڵ لەتەمەنی ئەو میللەتەی داگیر کردبێت، بەو جۆرە رەخنانە چارەسەر ناکرێت، کە لەهەمان ژینگەو بە هەمان شێوازی بیرکردنەوە هەناسە دەدات! هەر ئەمەشە وایکردووە ئۆپۆزسیۆنیش لەو هەریمە بەقەدەر دەسەڵات چرووک بووبێت، ئەگەر

زیاتریش نەبێت!!! وازیان لێبێنن با بەردەوام بن لە خیانەتەکانی خۆیان، لە جیاتی ئەوە رەخنەیان لێبگرین، با هەوڵ بدەین بە شێوازیکی تر هەوڵەکانی ئەو میللەتە ئاڕاستە بکەین، پێویستە لەسەر بنەمایەکی ئەقلانی ئەو ژێرخانە ئایدیۆلۆژیە دیماگۆکیە هەڵتەکێنین، کە نزیکەی سەد ساڵە رەگی لە کوردستان داکوتاوە، پێویستە وازیان لێبینین بۆ خیانەتەکانی خۆیان، تازە ئەوانە بواری چاککردنەوەیان تیادا نەماوە، تاکە رێگا ئەوەیە وەکو خیانەتکارێکی نیشتمانی بخرینە بەردەم دادگاکان، بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە هیزی نوێ و لەسەر بنەماو میکانیزمێکی نوێ لە هەریمی کوردستان دروست بکرێت، کە ئەو میکانیزمەی لە سەد ساڵی رابردوودا گیراوەتە بەرو، توورِ هەڵبدات و بیخاتە زبڵدانی مێژووەوە!، بەمەش دەتوانریت هێزی خەڵک لەو بێ هودەیی و پاشاگەردانیە رزگار بکرێت، ئەوانە دەبێت وەکو جاش و مەفرەزە تایبەتیەکانی سەردەمی بەعس تەماشا بکرێن، کە هەر رۆژەی قۆنتەرات لە دەوڵەتێکی هەرێمی دەگرن، نەک وەک هێزێکی نیشتمانی و رەخنەیان ئاڕاستە بکرێتا!!! کاتی ئەوە هاتووە خاڵیک بۆ رەخنەگرتن دابنریت و سەرەتایەک بۆ قۆناغێکی نوێ دابڕێژێت.

2018\11\28

## کوردستان و ئەگەرە ترسناکەکان

شتێکی ئاشکرایە، کە سیستەمی نوێی دنیا شکستی هیناوەو بە کۆتا هاتووەو زیاتر لە دوو ساڵیشە بە شێوەیەکی کرداری ئەمریکا هەژموونی جیهانی خۆی لە دەست داوە، بەڵام کشانەوەی ئەمریکا بەو شیوە کت و پڕە، ڕەنگ بێت شکستێک بێت، کە تەنیا بە کشانەوەی هێزەکانەوە نەوەستیت و بەرەو ناوەوەی ئەمریکاش هەڵکشێت، واتە ساڵی (2019)، بە گوێرەی ئەمریکاییەکان وەک قۆناغی روخانی شکستی سۆڤیەتیەکان دەبێت لە قۆناغی بە کۆتا هاتنی شەڕی سارد! ئەمریکا لەرووی داراییەوە لە قەیرانە، بە ملیاران دۆلار تەنیا قەرزاری وڵاتی چینە، دەربارەی زۆر لە مەسەلە جیهانیەکان لە پاشەکشەدایە، لە کاتێکدا پێششتر وەکو هیزێکی گەردوونی رەفتاری دەکرد، بۆ نمونە لە ساڵی (2017) لە یەکێک لەمەسەلە جیهانیە گرنگەکان، کە رێکەوتنامەی پاریس بوو بۆ دۆخی کەش و هەوای جیهانی کشایەوە!.

لە سوریا هاوپەیمانیەتیکی سێلایەنەی هەرێمی لە نیوان روسیا و ئێران و تورکیا بە شێوەیەکی ناواخنی دروست بووە، ئەورووپا، بە تایبەتیش ئەڵمانیا، کاردەکات پردێک لەنێوان ئەورپاو ئاسیا دروست بکات، واتە بە شێوەیەک لە شێوەکان کار لەسەر سەرکەوتنی پڕۆژەی ئۆراسیا دەکات، کە روسیا پێشەنگایەتی دەکات!، لە پێناو تۆڵە کردنەوە لە ئەمریکیەکان، کە هۆکاری سەرەکی بوون بۆ ئەوەی ئەوان هەردوو

جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانی بدۆڕێنن، بۆ ئەم مەبەستەش پەیوەندیەکانیان لەگەڵ روسیاو چین زۆر بەرەو پێش بردوە. کەواتە ئەمریکا لە دۆخێکدایە شایەنی ئێرەیی پێ بردن نیە، تورکیا بە دەست لە پشتدانی ئێران و روسیا دەیەویت پەلاماری رۆژئاوای کوردستان بدات، پێم وا نیە ئەمریکا ئاما دەبێت لە پێناو مەسەلەیەکی تەکتیکی، کە شەڕی داعش و بەکارهێنانی کوردە، بچێتە ناوشەڕێکەوە، کە رەنگ بێت ببێتە سەرەتای جەنگیکی جیهانی گەورە، بۆیە مەسەلەی کشانەوە لە رۆژئاوا دەروژێنێت بۆ ئەوەی رای گشتی جیهانی لەو هێرشە دوور بکاتەوە، کە تورکیا بە یارمەتی هاوپەیمانەکانی لە باشووری کوردستان رەنگ بێت ئەنجامی بدات، بۆیە گریمانەی رێک کەوتنێک لە نێوان تورکیاو ئەمریکا لە ئارادایە، بۆ ئەوەی چوارچێوەی شەڕەکە هیندە فراوان نەبێت و مەترسی جەنگێکی جیهانی لێ نەکەوێتەوە، شەرەکە بکەنە شەڕی کوردی — کوردی، تورکیا لە شکری رۆژی ئەنەکەسە، کە پارتی دیموکراتی کوردستان پاڵپشتیان دەکات، بکاتە قەڵغانی خۆی و شەڕەکەی پێ بکات، بۆیە یەکێک لە ئەگەرە ترسناکەکانی ئەو دۆخە شەڕێکی کوردی کوردیە، بۆ ئەوەی سۆزی رای گشتی جیهانی بەرامبەر مەسەلەی کورد سفر بکرێت و شەڕەکە وەک شەڕێکی ناوخۆ سەیری بکرێت، بەمەش لە لایەک تورکیا بە ئامانجەکانی خۆی دەگات، لە لایەکی تر ئەمریکاش خۆی لە تیوەگلان لە شەڕێکی وا گەورە دووردەخاتەوە!؟

2018\12\19

## توركیاتان هەرگیز پێ رازی ناكرێت!!!

دەتانەوێت توركیا رازی بكەن، فەرموون ئەوە هەموو رێگاكان، نەوت و سامانی كوردستانی تەسلیم بكەن. وەک تەسلیمتان كردووە، زەوی بۆ كۆمپانیا سیخوڕییەكانی بەناوی وەبەرهینانەوە تەرخان بكەن، وەک تەرخانتان كردووە، فەرموون ببن چاوساغی سوپاو میتی تورک و شوێنە گرنگەكانی پایتەختی كوردستانیان پێ بفرۆشن، بازاڕ بۆ كۆمپانیاكانیان لەناوشاری كەركوک بكەنەوە، فەرموون شەڕی پارتی كرێكاران و دنیای بۆ بكەن، وەكو پیشەیی هەمیشەییتان چۆن سەری شوانەكانی كوردستانتان دەبڕی و بەناوی پێشمەرگە تەسلیمی رژێمەكەی (×دام حسین) تان دەكردەوە، گەریلاكان لە شاخەكان بڕفێنن سەریان تەسلیمی ژاندرمەكانی توركی بكەنەوە، وەک كردووتانە و دەیكەن! فەرموون هونەرەكان ریسوا بكەن، فلیمەكان قەدەغە بكەن، شەهیدەكان سەدان جار شەهید بكەنەوە، فەرموون پاركی ئازادی بكەنە زیندان و نەک پەنجاو دوو كەس هەزاران هەزاری تیا بئاحنن، فەرموون پێش سوپای تورک بكەون و بنەكەكانی كوردی هەرچوارپارچەیان پێ نیشان بدەن، سنورەكان لە بەردەم رۆژئاوا دابخەن، پێشمەرگەكانی رۆژهەلات تیرۆر بكەن، فەرموون ئەوەی پیتان دەكرێت بیكەن، تاجە گوڵینە لەسەر گۆری ئەتاتورک دابنین، دەست لەسەر سنگ و بەسەرشۆڕی بەرامبەر ئەردۆگان بوەستن، وەک وەستاون، هەرچی دەكەن بیكەن، هەرگیز ناتوانن توركەكان و، هەرگیز دوژمنەكانی

کوردستانتان بۆ رای ناکرێت، تەنیا لەبەر یەک هۆی بچووک، ئەویش ئەوەیە، کە ئەوان هەرگیز ئێوە وەک کوردێک نابینن، دەزانن ئیوە کوردبوون و تەنانەت مرۆڤ بوونتان لە دەستداوە، ناتوانن هەرگیز تورکەکان رازی بکەن، چونکە ئەوان لە چاوساغێک و وڵات و فرۆشێک و خائینێک بەگەل و وڵاتەکەی خۆتان زیاتر ئێوە نابینن! ئەوان دەزانن کێشەی راستەقینەی کورد لای گەلی کوردە خۆیەتی. ئەوان دەزانن تەنیا خەڵکی کوردستانە گەورەو خاوەنی راستەقینەی خۆیەتی، ئەوان دەزانن، کە ئێوە تەنانەت بۆ دوژمنانیش، جگە لە خائینێک بە گەل و نیشتیمانەکەتان شتیک زیاتر نین!!!

2019\1\11

## یاریکردن بە ئاگرێکی ترسناک

سەرۆکی ئەمریکا، دوا بەدوای ئەو وەزیری دەرەوەی ئەمریکا، لە ماوەیەکی زۆر کەمدا سەردانی بەغداو ئەوەی دواتر سەردانی هەولێریشی کرد، بەر لەم سەردانانەو دوای ئەو سەردانانەش گۆڕانکاری گەورەو مەترسیدار لە ناوچەکە هەستی پێدەکرێت، بەرلە هاتنیان (ترامپ) لە رێگەی تویێتێکەوە بڕیاری کشاندنەوەی هێزەکانی دا لە سوریا، بەمە هەموو جیهانی پەشۆکاندو سەرقاڵکرد، دوای هاتنیشیان، خەریکە لەسەر زەمین، ئاڵوگۆڕکی بەهێزەکانی ئەمریکا دەکرێت لە عێراق و هێزی زیاتر بەرەو ئەو ناوچەیە دەهێنرێت، ئەمانە هەمووی ئاماژەی مەترسیدارن بۆ دۆخی ناوچەکە، بەڵام ئەوەی دۆخەکە گوماناوی تر دەکات، هاتنی وەزیری دەرەوەی ئێرانە بڕیاریشە لە ئایندەیەکی نزیکدا سەرۆکی ئێران (حەسەن روحانی) یش سەردانی بەغدا بکات، سەردانی وەزیری دەرەوەی ئێران بۆ بە غداو باشوور(هەولێرو سلێمانی) و بە مامەڵە کردنی بە شێوازێک، گومان لە هەموو جوولەیەکی بکرێت! جێگای هەڵوەستە کردنە!!!

وا پێدەچێت ستراتیژیەتی نوێی ئەمریکا ئەوە بێت لە عیراقەوە دەستی ئێران لەو ناوچەکە ببڕێت و باڵی بکات، ئێرانیش دەیەوێت تا بۆی بکرێت گۆڕەپانی شەڕو ململانێکە لە خاکی خۆی دوور بخاتەوە، دیارە دوا خەندەقیش بۆ ئەو لە دەرەوەی سنورەکانی هەرێمی کوردستانە!

سەرۆکی ئەمریکا دەڵێت پێمان ناخۆشە کورد نەوت بفرۆشێتە ئێران، دوای ئەوە ئێران لە پایتەختی هەرێم بەشداری لە کۆڕبەندی ئابوری دەکات و داوای پتەوکردن وفراوانکردنی پەیوەندیەکانی وڵاتەکەی و هەرێم دەکات لە هەموو بوارەکانەوە، هەواڵەکان رادەگەیەنن ئەمریکا ناوی ژمارەیەکی زۆر لە گرووپەکانی (حەشدی شەعبی) بۆ حکومەت ناردوەو داوای چەک کردن و هەڵوەشانەوەیان دەکات، بێگومان زۆرینەی ئەو هێزانەش سەرە رمی ئێرانن لە عێراق و بەو ئاسانیە چەک دانانێن، کەواتە دەبێت چاوەڕوانی جەولەیەکی نوێی شەڕ بکەین لە عێراق، هەڵوێستی سیاسی هەرێم لەو چەند رۆژەی رابردوو بەرامبەر ئێران، لەگەڵ هێزەکانی (حەشدی شەعبی) دەیخاتە یەک سەنگەرەوە، سەنگەری ئێران! لێرەدا پرسیارێک دێتە ئارا، ئایا ئەو هێزانەی هەرێم ناتوانن لە مەداری ئێران دەربچن؟، ئەگەر ئەوە بۆ یەکێتی راست بوو بێت، ئەوا پارتی لە ژێر هەژموونی تورکیادا بووە، ئایا ئەو وەرچەرخانەی پارتی بە لای ئێران تۆڵە کردنەوەیە لە ئەمریکاو لە هەڵوێستی بەرامبەر ریفراندۆم، ئەگەر وابێت ئێران و ئەمریکا هاوبەش بوون لە هەڵوێستیان بەرامبەر ریفرادۆم، کەوا بێت بەهۆی هەنگاوێکی نا ئەقڵانیەوە هەموو کوردستان دووچاری مەترسی دەکەنەوە، رووبە رووبوونەوەی ئەمریکا لەو ناوچە هەستیارەو پشت بەستن بەو هێزە هەرێمایەتیانەی، کە ئەگەر لەسەر هەموو شتێک ناکۆک بن، لە لێدان و لەناوبردنی کورد کۆکن، تەنانەت ئەگەر تەنیا بە مەبەستی دروستکردنی فشاریش بێت، (یاریکردنە بە ئاگر)، تێنەگەیشتنە لە ئاڵۆزی

ململانێیە جیهانی و هەرێمیەکانی ناوچەکەو هەڵسەنگاندنێکی نا واقعیانەیە بۆ دۆخەکە، کە زۆر ڕێی تێدەچێت ئاگرەکە راستەوخۆ بهێنرێتە ناو ماڵی کورد لە باشووریش، بەم چەشنە، ئەو پانتاییەی لەسەر دەریای سپی ناوەڕاست درێژ دەبێتەوە تا دەگاتە سنوورەکانی ئێران لە رۆژهەڵات، واتە رۆژئاوا باشوری کوردستان دەکرێتە گۆڕەپانی شەڕێکی خوێناوی، بۆیە باشتر وایە سەرانی کورد یاری بەو ئاگرە ترسناکە نەکەن!.

2019\1\16

## کرۆکی سیاسەتی ئەمریکاو ساویلکەیی کورد

سیاسەتی ئەمریکا بەرامبەر کورد زۆر راشکاوانەیە، ئەمریکا کورد وەکو کارتێک بەکاردەهێنێت لە پێناو فشار خستنە سەر رکابەرەکانی و مسۆگەرکردنی بەرژەوەندیەکانی خۆی، (دۆناڵد ترامپ) سەرۆکی ئێستای ئەمریکا لە هەموو سەرۆکەکان و سیاسەتمەدارەکانی تری ئەمریکی ئەو راستەقینەی راشکاوانەتر دەربڕی، کاتێک گوتی :" کورد گەلێکی ئازان، پێویستە بەکاریان بێنین"، ئەمریکا بە درێژایی سەدەی بیستەم ئەو سیاسەتەی بەرامبەر کورد پیادەکردوەو هیچی بۆ کورد پێ نەبووە، لەو هەموو جینۆسایدەی بەرامبەر کورد کراوە، ئەگەر لەبەرژەوەندی خۆی نەبووبێت، نوقەی لێوە نەهاتووە، یەکێک لە فاکتەرەکانی رووخانی کۆماری مهاباد، فشاری ئەمریکا و رۆژئاوا بوو بۆ سەر سۆڤیەت، مێژووی ئەو مەهزەلەیەی کورد ناوی شۆڕشی ئەیلوول تەماشا بکەی، بۆت دەردەکەوێت ئەمریکا چۆن وەک کارتێکی چرووک مامەڵەی لەگەڵ مەسەلەی نەتەوەیەکی بندەستی وەکو کورد کردووە، لە ساڵی (1988) هاوپەیمانە سەرەکیەکەی ئەمریکا لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست (سەدام حوسێن) کوردی جینۆساید کرد، ئەمریکا نەک هەر هیچی نەگوت، بەڵکو هەرساڵێک دوای ئەوە وەفدێکی کۆنگرێسی ئەمریکی سەردانی سەدامیان کردو پێیان راگەیاند، کە " تەنیا ئەوە دەتوانێت مافی مرۆڤ لە عێراق بپارێزێت!" بۆیە ناکرێت چاوەڕوانی لەمە زیاتر لە ئەمەریکا بکرێت، ئەمریکا زلهێزێکەو کار

بۆ هەژموونی جیهانی خۆی دەکات، ئەوەی لەو خاڵەدا لەگەڵی یەکبگرێتەوە، ئەوە وەک هاوپەیمان دەیبینێت، هەر گۆڕانێک رووبدات، ئەوا لێی وەردەچەرخێتەوەو دەبێتە دوژمنی، بۆیە ئەمریکا ئەسپێکی تۆپیوەو کورد ناکرێت گرەوی لەسەر بکات، رەنگ بێت لێرەو لەوێ پاڕانەوە نامەیەکمان لە ئەندامێکی کۆنگرێس بەرگوێ بکەوێت، بەڵام ئەمانە رووی راستەقینەی سیاسەتی ئەمریکا ناشارنەوە! سەیر لەوەدایە کورد خۆشی نایەوێت ئەمریکا وەک ئەوە ببینێت، کە هەیە، بەلکو هەمیشە وەک ئەوە دەیبینیت، کە خۆی دەیەویت، وەک ئەوەی حەزی لە فریوخواردن بێت، بڵاوبوونەوەی ئەوگرتە ڤیدیۆییەی ئەندام کۆنگرێسی ئەمریکا (جۆن کەنەدی) دەکەوێتە دوو توێی ئەو بابەتەوە، راستە کەنەدی بەرگری لە کورد دەکات و بۆی دەپاڕێتەوە، بەڵام کێشە سەرەکیە لێرەدا نیە، بەڵکو مەسەلەی راستەقینە ئەوەیە هەمدیس ئەمریکا کوردی بێبەش کردووە لەو پرۆژە یاسایەی تاتوێی دەکات بۆ بەرگریکردن لە هاوپەیمانەکانی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، کەواتە لێرەدا ئەوە روون دەبێتەوە ئەمریکا هەرگیز وەک هاوپەیمانێک سەیری کوردی نەکردوەو ناکات، خەیاڵ پڵاویە ئەگەر کورد بەو شێوەیە لە ئەمریکا تێبگات، جێگای داخە خەڵک و تەنانەت رۆشنبیرانیش پاڕانەوە نامەکەی (کەنەدی) دەبینن و بانگەشەی بۆ دەکەن، لە کاتی ئێستادا کۆڕی تۆڕە کۆمەڵایەتیەکانی گەرمکردوە، بەڵام خودی کێشە سەرەکیە فەرامۆش کراوە، کە ئەمریکا وەکو کۆتاییەکانی نیوەی یەکەمی حەفتاکانی سەدەی بیستەم (ئەیلوول) خەریکە کاری بە

کورد نامێنێت فرێی دەداتەوە بەردەم گورگان، بۆیە دەبێت کورد لە هەموو قۆناغێدا هوشیارتربێت چیتر بە گۆرانیە قێزەون و ئاوازی ناسازی ئەمریکا، نەکەوێتە هەولێری گوتەنی هەلەکەسەما، ئەوەی کورد رزگار دەکات و ئازادی بۆ بەدەست دێنێت دەبێت ئیرادەی کوردی خۆی بێت، وەک زۆر جاری تر نووسیومەو گوتوومە، ئەو میللەتەی چاوەڕوان بێت خەڵکی تر رزگاری بکات و قەوارەیەکی سیاسی بۆ دامەزرێنێت، ئەو میللەتە لە بنەڕەتدا شایەنی رزگاری و بوون بە خاوەنی هیچ قەوارەیەکی سیاسی نیە.

2019\2\2

## گۆڕانکاریە خێراکانی ناوچەکە

ڕۆژئاوای ئاسیاو بە تایبەتیش ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەگۆڕانکاریەکی زۆر خێراو مەترسیداردایە، ئەوەی چاودێری ڕووداوەکان بکات بە ئاسانی هەست بە بەرزبوونەوەی ئاستی گرژییەکان دەکات، دوای نەمانی ، یاخود لاوازکردنی داعش، ناوچەکە بەرەو تەقینەوەیەکی تر دەچێت، هێزی هەموو لایەنە جیهانییەکان لەم ناوچەیە وا کۆدەکرێتەوە. هەڕەشەکانی ئەمریکا ترسنۆکی ئەو وڵاتە لە جێبەجێکردنی ستراتیژییەتە جیهانیەکەی، دەرفەتێکی گەورەی بە هاوپەیمانیەتی سێلایەنە (روسیا و تورکیاو ئێران) داوە بۆ ئەوەی زیاتر لەیەکتر نزیک ببنەوە. لە کۆتایی (2018) تورکیا نەخشە ڕێگای منبجی لەگەڵ ئەمریکیەکان مۆرکرد، کە دەبوایە کورد، ڕاستتر هیزەکانی پەیەدە لەو منبج و دواتریش ڕۆژهەڵاتی فورات)، واتە ڕۆژئاوای کوردستان بکرێتە دەرەوە، بەڵام تا ئێستا سەرباری بەڵێنەکان ئەمریکا ئەو نەخشەیە ڕێگایەی بەدڵی تورکیا جێبەجێ نەکردووە!.

بۆیە تورکیا پەنای بۆ روسیا بردووە بۆ جێبەجێکردنی ئەو نەخشە ریگایەو لێدانی ئەزموونی ڕۆژئاوای کوردستان. کە ئەردۆگان دەیهەویت بیکاتە ئامرازێک بۆ ئەوەی کێشەکانی ناوخۆی تورکیای پێ بەرێتە دەرەوە!. کەواتە تورکیا بەدەست قەیرانی ناوەخۆی گەورەو قەیرانی دەرەوە دەناڵێنێت، هیچ بەدەست ئەمریکاو ڕۆژئاوا نەماوە جگە لەگەڕاندنەوەی هیزە ئەنتی ئیسلامییەکان، واتە ئەو هیزانەی لە ڕۆژئاواوە

نزیکن، بۆ نمونە وەک (جەهەبە)، کە لەدوای جەنگی دووەمەوە هاوپەیمانی سەرەکی ئەمریکا بووە، ئەمەش ئەگەری نزیک بونەوەی کودەتایەکی تر لە تورکیا زیاتر دەکات!.

بۆخۆدوورخستنەوە لەمە، تورکیا دەشێت سەرەڕۆییەک ئەنجامبداو بە پشت بەستن بە روسیا (ئەدلب بەرامبەر منبج و رۆژئاوای فورات) واتە رۆژئاوای کوردستان ئالوگۆڕی پێبکرێت!، ئەمەش واتای جەنگێکی تر لەناوچەکە، کە ئەگەر دەستپێێکی دیاربێت ئەوا کۆتاییەکەی دیارنییە! تەنانەت زۆر ئاڵۆزو مەترسیدارە! ئەوەی دۆخەکە ئاڵۆزتر دەکات، روسیا پاڵپشتی ئێرانیش دەکات، یاخود ئێران بەکاردەهێنێت بۆ فراوانکردنی بەرەی شەری دژ بە ئەمریکا لەعێراق!، ئەمەش بێگومان سەرباری شەڕە هەرێمیەکە، دەبێتە هۆی شەڕو بەیەکدادانی ناوەخۆش لەعێراق، هیزە شیعییەکان پاڵپشتی ئێران دەکەن و بەشێک لەکوردو سوننەش پاڵپشتی تورکیا دەکەن، بەمەش بەرەیەکی تر دژ بە رۆژئاوای کوردستان لە زۆنی زەردو ناوچە سوننەکانی عێراق دەکرێتەوە. بە لایەنی کەم ئەگەری ئەوە دەکرێت تورکیا بۆ ئابلۆوقەدان و لێدانی رۆژئاوا، ئەو بەرەیەش بەکاربێنیت، هەرچۆنێک بێت وەک ئاماژەم پێکرد، گۆڕانکارییەکان خیراتربووینەوە ئاڕاستەیەکی مەترسیداری تریان گرتۆتە بەر، ئەوەی جێگای داخە لە باشوری کوردستان لەو قۆناغە هەستیارەدا، بنەمالە سیاسیەکانی کوردستان گفتوگۆ لەسەر ئەوە دەکەن هێلکە لە جوجەڵەیە یاخود جووجەڵە لە هێڵکەیە!!!

2019\4\8

## رستەیەکی ئەنفالکراو لە یادی ئەنفالدا

ئەنفال پرۆسەیەکی بەردەوام بووە دژی کورد، بەڵام لە ژێر ناوی جیا جیا، تاوێ لەژێر ناوی بڵاوکردنەوەی ئاین و دەمێکی ترلە ژێر ناوی راگوێزان و بە شارستانی کردن و، جارێکی تر لە ژێر چەتری تەبعیس و تەعریب و تەتریک و تەفریسدا. بۆیە ئەگەر بەخیرایی چاوێک بە مێژووی کورد بخشێنین، دەبینین پرۆسەیەک هەیە لە هەموو قۆناغەکان و لەژێر پەردەی جیاوازدا خۆی نوێ دەکاتەوە، ئەویش پرۆسەی قڕکردن و سڕینەوەی ناسنامەی نەتەوەیەکە، داڕمان و خاپوورکردنی کەلتوورو کەسایەتی و رابردو و ئایندەی هەزاران مرۆڤە، کە پێیان دەگوتریت کورد .

سەرباری گۆڕانکاری لەقۆناغەکانی مێژوو، سەرباری ئەو پەرەسەندنانەی مرۆڤ بە خۆیەوە بینیویە، سەرباری چاخەکانی کشتوکاڵ و ئاسن و تەکنەلۆژیا و ئەلیکترۆنی، ئەو ئاوەزو بیرکردنەوەی کاری لەسەر سڕینەوەی ئەو نەتەوەیە ستەمدیدەیە کردووە، تۆزقاڵێک گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە، درێژکراوەی ئەمەش ئەنفالی بەعس بوو لە کۆتایی دەیەکی هەشتەمی سەدەی بیستەم. رژێمی بەعس، کە رەنگدایەوەیەکی تەندروست و راشکاوانەی کەلتوورو بیرکردنەوەی عەرەبی و شۆفینیزمی ئاوێتەکراوی ئاینی- ناسیونالیستی عەرەبی بوو، لە ژێر ناوی ئەنفال، بە پشت بەستن بە ئاین و گەڕانەوە بۆ دەقەکانی قورئان، میللەتی کوردی موسڵمانیان

کردە ئامانج، بە پلانیکی تۆکمە، بە شێوەیەکی هۆڤیانە، کەوتنە وێران کردنی گوندەکانی کوردستان و کوشتنی منالآنی کوردو بەتالآنبردنی ئابوری کوردو بە سەبایەکردنی کچ و ئافرەتی کوردو فرۆشتنەوەیان لە بازاڕی مرۆڤ فرۆشی دەولّەتە دواکەوتووەکانی ناوچەکە، کە هەلّگری هەمان کەلتووری ئەنفال و سەبایاو کەنیزەک و کۆیلەکردن بوون! ئەم ئەنفالە نوێیە بەگوێرەی جوگرافیای کوردستان، دابەشکرا بۆ هەشت قۆناغ، کە لە سنورەکانی دۆلّی جافایەتییەوە دەستیپێکردو لە ناوچەی بادینان بە کۆتا هات، لەو ئەنفالەدا تۆپ و تانک و مەتریالیۆزو چەکی قورس و سووک و چەکی کیمیاوی جێگەی شمشێرەکانی گرتەوە، بەلاّم ئەنجام هەمان ئەنجام بوو!، لە ماوەیەکی کەمدا، 182هەزار مرۆڤی کوردیان لەو ناوچانەی، کە پێی دەگوترا قەدەغەکراوەکان لەناوبرد و لە بیابان و گۆڕە بەکۆمەلّەکان تووڕیان هەلّداو دیزە بە دەرخونەیانکرد. جێگای داخە ئەنفال هەر لەسەر دەستی دوژمنانی کورد نەوەستا، تەنیا چوار سالّ دوای ئەنفالی بەعس، لەسەردەمی حکومەتی بەناو کوردیدا، ئەنفالی نۆ دەستپێکرد، کە تەواوکەری هەشت قۆناغەکانی پێشووتر بوو، بەلاّم ئەمجارەیان لەژێر ناوی برا کوژی! ئەو جاش و مەفرەزە خاسانەی ئەنفالیان بۆ بەعس ئەنجامدا، جلی پارتی و یەکێتیان لەبەرکردو کەوتنە وێزەی کوردەکانی باکور، دواتر روویان لەیەکتر کرد، لە ئەنفای نۆدا هەمان پرۆسەی ئەنفالەکانی ترو هەمان شیواز، لە تالآنکردن و زیندە بەچالّکردن و ئەتککردنی مرۆڤ، بە دەستی هەمان جاش و کوردکوژەکانەوەو لە ژێر

پەردەی ئەو دوو حیزبە ئەنجامدرا، بۆیە پێویستە کە باس لە ئەنفال دەکرێت، قۆناغی نۆیەمی ئەنفال، وەک لە نوسینیکی پێشووتردا ناوم ناوە، هەرگیز نابێت فەرامۆش بکرێت، کە رەنگ بیت لە هەموو قۆناغەکانی تر قێزەون تربێت، چونکە ئەمجارەیان لە ژێر ناوی کوردایەتیەوە ئەنجامدراوە، دوا قۆناغیش، قۆناغی ئەنفالی دەیە، کە تا ئێستا بەردەوامەوە لە کاتی ئێستادا لەناوی دەژین! هەموو حیزبەکانی باشووری کوردستان، بەوانەی پێیان دەگوترێت دەسەڵات و ئۆپۆزسیۆن، دژی تێکڕای میللەتی کورد لە باشوور ئەنجامی دەدەن، ئەویش ئەنفالی بەهاکان و ئەنفالی زانست وئەنفال وشەو رستەو زمانی کوردی، ئەنفالی قوتی خەڵک و ئەنفالی برسیکردن و ئەنفالی دزینی نەوت و سەرو سامانی کوردستان و ئەنفالی ریزی تاکی کوردوسووککردنی بەرامبەر دوژمنەکانی و ئەنفالی لێدانی کەسایەتی و چرووکردنی تاکی کورد، ئەنفالی......، ئەنفالی.... هتد، بۆیە کاتیک یادی ئەنفال دەکەین، وا باشترە یادی هەر دە قۆناغی ئەنفال بەیەکەوە بکەینەوە، نەک بە تەنیا ئەنفالەکانی بەعس و ئەوانی پێش بەعس و ئەوانەی لەتەک بەعس!، ئەگەر خویندنەوە بۆ کۆی ئەو دە ئەنفالە بەیەکەوە نەکەین، هەرگیز ناتوانین لەمێژوو تێبگەین و هەمدیس وەک سەتان ساڵ بەر لە ئێستا، مێژوو فریودەدەین و لە دواجاریشدا مێژوو فریومان دەدات!

2019\4\14

## کاکەشین، دیوەجوانەکەی پێشمەرگایەتی

بەهۆی سیاسەتی سەرکرادایەتی حیزبەکانی باشور، رۆژانە حیکایەتێکی رەفتارە قێزەون و درزێوەکانی پێشمەرگەمان گوێ لێدەبێت، لە قۆناغی ئەوەی پێی دەڵێن خەباتی شاخ. جێگای داخە بەشێکی زۆری ئەو حیکایەتانە راستن. زۆرینەی ئەو بەرپرسانەی لەو قۆناغە سەختەدا مانەوەو قۆناغی شاریان بینی و بینیمان چۆن هەموو پیرۆزییەکانی کوردستانیان بێ بەهاو چرووک کرد، لە شاخیش هەمان مەعدەن بوون، وەلێ زوڵم و زۆرەکانی رژێمی بەغدا، جۆرە پەردەیەکی بۆ دروست کردبوون، کە راستەقینەیان بە دیارنەکەوێت، یاخود ئەگەر بەدیاریش کەوێت، لە پێناو بەرژەوەندی گشتی لە لایەن خەڵکە دڵسۆزەکەوە دیزەبەدەرخونە بکرێت و بشاردرێتەوە. ئەگەر هەوڵی ئاشکراکردنیشی درابێت، ئەوا ئەو بەرپرسانە بە جەولەیەک ئەو کەسەی رەخنەی هەبووە لەگەڵ خەڵکی تریان ناردۆتە ناوشارەکان وە کو خۆیان پێیان دەگوت بۆ چالاکی، جا لە رێگای بەعسەوە بەگرتنیان دەداو دواتر بە کوشتنیان دەدا، یاخود پیاوە نزیکەکانی خۆیان رادەسپارد لە رێگا لە شوێنێکدا دەیانکوشت و لەناویاندەبرد!!! ئەم جۆرە نمونانە لەناو هەموو حیزبەکانی باشوور زۆرە. بەڵام ئەوەی من لێرەدا دەمەوێت باسی بکەم ئەمە نییە، بەڵکو ئەو مرۆڤە جوان و لە خۆبوردوانەیە، کە بەدڵسۆزانە بۆ خزمەتکردنی میللەتەکەیان چووبوونە دەرەوەو ببوونە پێشمەرگە. ئەو دیوە

جوانهی پێشمەرگایەتی بە هەمان شێوە لەناو هەموو حیزبەکان بە دیدەکرێت. بە داخەوە گێڕانەوەی بە تەنیا حیکایەتە ناشرینەکانی ئەوەی پێی دەڵێن کوردایەتی، زیانی بە خەڵکانیکی دڵسۆزی زۆر گەیاندووە، ئەمانە دوو جار بوونەتە قوربانی، لە لایەک لە پێناو خزمەتکردنی میللەتەکەیان ژیانی خۆیان لەسەر داناوە، لە لایەکی ترەوە بەهۆی کارە دزێوەکانی مرۆڤە دزێوەکانیش، ئەو قوربانیدانەشیان بێ بەها کرداوە. ئەمە بابەتێکە نابیت پێنووسی کوردی فەرامۆشی بکات.

یەکێک لەو کەسانە دەمەویت لێرەدا باسی بکەم، کاکە شینە، کاکە شین پێشمەرگەی (هەرێمی 9) باڵەکایەتی حزبی سوسیالیسی کوردستان (حسک) بوو، لە دوای دەستپێکردنەوەی شۆڕشەوە ببووە پێشمەرگە. کەسێکی سادەو نەخوێندەوار بوو، بەڵام مرۆڤێکی بە ئەزموون و خۆڕاگر بوو. پێشمەرگەیەکی خۆشەویست بوو نەک بە تەنیا لای برادەرەکانی، بەڵکو لای حزبەکانی تریش. هەموو ئەو پێشمەرگانەی لەگەڵیدا بوون خۆشیان دەویست و گاڵتەیان لەگەڵ دەکرد. زۆر جاران توورەیان دەکرد. کە توورەش دەبوو هەرچیەکی بکردبوا و بگوتبوا لێیان قبوڵ دەکرد. خێراش ئاشت دەبووەو هیچی لەبەردڵ نەدەما. جارێکیان لە بناری چیایەک جگەرەیەک دادەنێنەوە نیشانەی لێدەگرن، کە ئەو نیشانە دەگرێت پیی دەڵێن تۆ لە چیایەکەی پشتیشت نەدا! بەم شێوەیە توورەیان دەکرد. کاکە شین خۆی جارێکیان بۆی گێڕامەوە، کە چۆن لە ناو ڕەشماڵەکانی بناری هەڵگورد تووشی هەلیکۆپتەرێک دەبێت و بە چ زەحمەتیەک خۆی

دەرباز دەکا!. خاڵێکی گرنگ و دیاری کاکە شین، ئەوەبوو کەسێکی زۆر راستگۆ بوو، زۆر باوەڕی بە پرەنسیەکانی خۆی هەبوو، هەرگیز نەیدەزانی درۆکردن چییە، ئەگەر سوێندی بەکوردستان و بە خوێنی شەهیدان بخواردبوایە، ئیدی تەواو، ئەنجامەکەی هەرچی بوایە لای گرنگ نەبوو، ئەوەی لای گرنگ بوو ئەوەبوو تەنیا سوێندەکەی نەشکێنێت. کاتێک پرۆسەی ئەنفال دەگاتە ناوچەکەی ئەوان، کاکە شین لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی هاوڕێی رێگای دەربازبوون و چوون بەرەو سنوورەکانی لێدەگیرێت. بۆیە ماوەیەک لە ناوچەکە دەمێنێتەوە، پاشان لەگەڵ پێشمەرگەیەکی تر، شەهید نادر هەنارەیی، پێدەچێت لەسەر پێشنیاری شەهید نادریش بووبێت، چونکە ئەو خۆی خەڵکی گوندی هەنارە بووە. دەچنە گوندی هەنارە. ماوەیەک دەمێننەوە. پاشان لەلایەن سیخوڕێکەوە خەبەریان لێدەدرێت و هەردووکیان دەگیرێن. بۆ ئەوەی خۆیان رزگار بکەن، دەڵێن ئێمە گەڕاوینەتەوە بۆ ئەوەی خۆمان تەسلیم بکەینەوە، دیارە ئەو کاتە لێبوردنێکی گشتیش لە ئارادابوو!. دوای لێدان و ئازارێکی زۆر، جگە لەمە هیچی تر نادرکێنن. پاشان لە رێگای سیخورەکانیانانەوە، وەک هەندێک دەڵێن لە رێگای موختارێکەوە، دەزانرێت، کە کاکە شین ئامادەنیە بە درۆ سوێند بە کوردستان و بە خوێنی شەهیدان بخوات. بەڕێوەبەری ئەمن بانگی دەکات و پێی دەڵێت باشە من دەزانم ئێوە هاتوونەتەوە خۆتان تەسلیم بکەنەوە، بەڵام یەک پرسیارت لێدەکەم، وەڵامم بدەوە دوای ئەوە ئازادت دەکەین. ئێمە باوەڕت پێدەکەین

هاتوویتەوە تەسلیم بیەوە، بەڵام بڵێ بە کوردستان بە خوێنی شەهیدان هاتوومە تەسلیم ببمەوە؟ کاتێک ئەو پرسیارەی لێدەکەن کاکە شین دۆش دادەمێنیت و ماوەیەک بێدەنگ دەبێت، دوای ئەوەی پرسیارەکەی لێ دووبارە دەکەنەوە، لە وەڵامدا درێ بە بێدەنگییەکە دەداو دەڵێت نەخێر من پێشمەرگەم و نەهاتوومەتە خۆم تەسلیم بکەمەوە. دۆخەکە چۆن بووە وا باس دەکات و دەگێڕێتەوە. وەک باس دەکرێت مدیر ئەمنەکە خۆی باوەڕی بە گوێچکەی خۆی نەکردوەو زۆر سەرسام بووە بە بوونی کەسانی وا لەناو ئەوەی پێی دەگوترا شۆڕش. دوای ئەوە کاکە شین و هاوڕێکەی نادر هەنارەیی، کە ئەویش گەنجێکی لاوازی هەژاری روح سووک بوو، لە سێدارە دەدرێن. کاکەشین نمونەی سەدان و هەزاران کەسی دڵسۆزە، کە راستگۆییانە بوونە پێشمەرگە، هەموو شتێکی خۆیان پێشکەش وڵات و نیشتمانەکەیان کرد. ئامادەنەبوون بە هیچ شێوەیەک دەستبەرداری بیروباوەڕەکەی خۆیان ببن. بۆیە ناکرێت بە هۆی ناپاک دەرچوون و خیانەتی بەناو سەرکردەکان، کە بەشێکی زۆریان لە ژێرەوە فایلدار بوون و دەستیان لەگەڵ رژێمەکانی ناوچەکە تیکەڵ کردبوو، کاکە شینەکان فەرامۆش بکرێن. ناشرینی و دزێوی ئەوان نابێت ببێتە هۆی شاردنەوەی جوانی و پاکی کاکە شینەکان، دەبێت نمونەی کاکە شینەکانیش بێنە ناو مێژووی کوردو فەرامۆش نەکرێن، دەبێت کاکە شینەکانیش ببنە بابەتی شیعرو چیرۆک و رۆمانەکان، دەبێت چیرۆکی کاکە شینەکان بۆ نەوە نوێیەکان بگێڕدرێتەوە و منداڵەکانی پێ گۆش بکرێت، نەک بە تەنیا

چیرۆکی خیانەت و دزیکردن و داوێن پیسی و خۆفرۆشی، ئەوانەی وڵاتیان فرۆشت و بەردەوامیش دەیفرۆشن.

2019\04\25

## خەمی رۆژنامەکان و خەمی خەڵکی ئێران

رۆژنامەکان پڕن لە هەواڵ دەربارەی ئێران، سەرۆکی ئەمریکا هەمدیس هەڕەشە دەکاتەوە. چەک و تفاق و کەشتیگەلییەکانی ئەمریکا رۆژانە بەرەو ئەو ناوچەیە لە رێگادان. چاودێرە سیاسیە نەخویندەوارەکان بە ئارەزووی خۆیان و بە بێئەوەی چاودێرێک لەسەر ئاخاوتنە بێبەهاو سواوەکانیان هەبێت، شاشەی تیڤیەکانیان داگیرکردووە و چۆنیان حەز لێبێت و بێتە سەر زمانیان دەیڵێن و نایگێڕنەوە. لە ئیران دەدرێت، هاتنی ئەو هەموو چەکە بێ هۆ نیە!، رژێمی ئاخوندەکان دەڕوخێت، ناوچەکە نەخشەی سیاسی دادەڕێژرێتەوە!. نەخێر ئەمریکا لە ئێران نادات، ئێران دەوڵەتێکی گەورەیەو ئاسان نییە وەکو عێراق مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، هاتنی ئەو هێزە بەمەبەستی فشاری زیاترە بۆ سەر رژێمی ئێران، بۆ ئەوەی بێتە ژێر باری داواکانی ئەمریکا! داواکانی ئەمریکا چیە؟ دەبێت ئێران رێکەوتنیکی تری ئەتۆمی و بە مەرجی ئەمریکا واژۆ بکات!. دوای ئەوە. دوای ئەوە دۆخەکە بەردەوام دەبێت دەبێت لە گرژی و ئەمریکا داوای تر دەدۆزێتەوە!.کەواتە داواکانی ئەمریکا بەردەوام دەبێت و بەکۆتا نایەت! لەبەرئەوەی کێشەکە لە بنەڕەتدا ئێران نییە! بەڵکو ئێران لاوازترین خاڵە بۆ سەپاندنەوەی هەژموونی ئەمریکا لە ناوچەکەو ئابڵووقەدانی روسیا و کۆسپ دروستکردن بۆ چین!. ئەمریکا دەیەوێت لە ئێران پاریزگاری

لەسیستەمی تاک جەمسەری بکات، ئەمریکا دەیەوێت لە ئێران شەڕی جیهانەکەی تر بکات. دوای ئەوەیش وەک تیوری سیاسی یاری دۆمینۆ، لەدوای ئێران هێزی تریش دەکەونە خوارەوە، بە تایبەتیش ئەو هیزانەی هاوسەنگی ناوچەکەیان لەگەڵ ئێران پێڕاگیراوە، لەوانە تورکیا!. کەواتە دەبێت دوای رووخانی سەفەوییە نوێیەکان عوسمانییە نوێیەکانیش، کە ئێستا لە ئەمریکا و رۆژئاوا یاخیبووینە، بڕوخێن!. لە رووی جیۆپۆلەتیکیەوە ئەمە راستەو ئەگەر ئەمریکا بیەوێت هەژموونی تاکلایەنەی جیهانی بگەڕێنیتەوە دەبێت ئاڕاستەی هەنگاوەکان بەو شیوەیە بێت! بەڵام ئەمریکا پەلەی نییە! دەشێت لەناوەڕاستی سەرکەوتنەکان، ئەگەر گریمانی ئەوە بکەین سەرکەوتن بە دەستدێنیت شەڕەکە لەبەرژەوەندی رژێمی ئێراندا بوەستینیت، وەک ئەوەی لە ساڵی 1991 لە عێراق روویدا، بە پێچەوانەی خواستی هەموو گەلی عێراق نەک بە تەنیا رژێمی عیراقی نەرووخاند، بگرە دەستی ئەو رژێمەی کردەوە بۆ ئەوەی جارێکی تر لە باشوورو باکووری وڵاتەکەیدا جینۆسایدی گەلەکەی بکات!. کەواتە زنجیرەی رووداوەکان بەو شێوەیە نییە پلانی بۆ دادەڕێژرێت، چونکە ئەمریکا پێویستی بەشەڕە، بۆ ئەوەی عەمباری چەکە کۆنەکانی، لەو ناوچانە بفرۆشیت و بەتاڵیان بکاتەوە. ئەمریکا بۆ ئەوەی هەمیشە لە پێشەوە بێت دەبێت هەمیشە لەشەڕدا بێت!. راستە پرۆژەی جیهانگەرایی و داڕشتنەوەی نەخشەی سیاسی ناوچەکە لەسەر بنەمای دەوڵەت و قەوارەی سیاسی بچووکترەوە لە بەرژەوەندی زۆربەی گەلانی ئەو

ناوچەیەدایەو دەبیتە سۆنگەی رزگاربوونیان لە دەست ئەو رژیمە سەرکوتکارانەی، کە ئەمریکا خۆی دەستی هەبووە لە هاتنە سەر حوکمیان پاڵپشتیانی کردوە. بەڵام ئەمریکا هەرگێز نایەوێت ئەو رژێمانەی، کە جێگای رژێمە کۆنە دەگرنەوە دێنە سەر دەسەڵات خزمەتی گەلەکانیان بکەن. زۆربەی رژێمەکانی ئەو ناوچەیە، ئەمریکا لە تووڕەیی خەڵکانی خۆیان و دژی بەرژەوەندییەکانی خەڵکانی خۆیان دەیانپارێزێت، بۆیە لەجیاتی ئەوەی بیر لەوە بکەینەوە لە ئێران شەڕ دەبیت یاخود شەڕ نابێت، تومەن زیاتر دادەبەزیت یاخود دانابەزێت، روسیا پشتی ئێران بەردەدات یاخود نا، بیر لەوە بکەینەوە گەلی ئێران چەندە ئازار دەچێژیت، چەند تاوانە بۆ شەڕکردن لەگەڵ رژێمیک، کە خۆیان پاڵپشتی بوونە، بە ناوی رزگارکردنەوە گەلێک برسی بکەن، دەبێت ئێمە زیاتر خەمی خەلکانی بێچارەی ئێرانمان بێت تا بۆمان دەکرێت یارمەتیان بدەین، کە بۆ هەزاران ساڵە لەو پانتاییە جوگرافیاییەدا بەیەکەوە دەژین.

2019\05\11

## بێدەنگیەکی ترسناک و پڕ شەرمەزاری

چەند رۆژێکە تورکیا لەباشوری کوردستانەوە هێرشێکی چڕی کردۆتە سەر پارتی کرێکارانی کوردستان. بە ئاگرو ئاسن هەرێمی کوردستان سوتماک دەکات و ئەوەی هەناسەی بێت و بچێت، لەمرۆڤ و گیانلەبەرو زیندەوەرو داردرەخت دەیکوژێت. تەنانەت ئاو و هەوای کوردستانیش پیس و ژاراوی دەکات. تورکیا لە پەنای شەڕی پارتی کرێکارانی کوردستانەوە شەڕی و ژیان و مرۆڤ و هەموو شتێکی زیندوو دەکات لە کوردستان. بەلام ئەوەی جێگەی سەرنجە لە باشووری کوردستان هیچ دەنگێکی نارەزایی نابیسترێت، تەنانەت رۆژنامەو میدیاکان، ئەوانەی سەر بەدەسەلاتن و ئەوانەش خۆیان پێ ئازادە متەقیان لێکردوەو دەمیان وەک تەڵەی تەقیوی لێهاتووەو ئامادەنین تەنانەت هەواڵێکی ئەو سوتماککردن و کوشتن و بڕینە بڵاو بکەنەوە. لە باشوری کوردستان دەسەڵات و بەناو ئۆپۆزسیۆن، رۆشنبیرو نا رۆشنبیر، میدیای سێبەرو بەرهەتاو. قرقەپ بیدەنگن و نوزکەیان لیوە نایەت!. ئەمە بەراستی کارەساتیکی زۆر گەورە و پڕ شەرمەزاریە بۆ میللەتێک بەو شێوەیە بەرامبەر لەناوبردنی ولاتەکەی بێدەنگ بێت!. زۆر سەیرە بەشێک لە رۆڵەکانی نەتەوەکەت و تەنانەت خاکی خۆشت دەستدرێژی بکرێتە سەر، تۆ باسی نەکەیت و هەرخەریکی ئەوە بیت، قەوانی بەناو پەرلەمانی

باشوور دانیشت یاخود دانەنیشت!. حکومەت پێکهات یاخود پێکنەهات لێدەیتەوە. بەناو نوسەرو رۆشنبیرانی کوردیش هەر خەریکی رەخنەگرتن بن لە یەکێتی و پارتی، وەک ئەو دوو بنەماڵە سیاسیە تۆزقاڵێک بواری رەخنە لیگرتنیان مابێتەوە. ئەو جۆرە بێباکی و بێهەڵوێستیە پاساودانە بە تورکیای داگیرکەر، بۆ ئەوەی دڕندانەتر بکەوێتە وێزەی کورد. ئەمە بە شێوەیەک لە شێوەکان داننانە بەوەی ، کە مافی تورکیایە بە بیانگەی پارتی کرێکارانی کوردستانەوە پەلاماری باشوری کوردستان بدات. لەکاتێکدا تورکیا سنووری دەوڵەتێکی خاوەن سەروەری بڕیوەو لەو دیو سنوورەکانی خۆیەوە هاتووەو زوڵم لەکورد دەکات!. لە لایەکی ترەوە رەوادانە بە قەتل و عامکردنی پارتی کرێکارانی کوردستان. کە پارتێکە هەزاران رۆشنبیرو رۆڵەی کوردی دڵسۆزو لەخۆبوردو و قارەمانی لە خۆوە گرتووە. ئەمە چ شەرمەزاری و کارەساتێکە لە کوردستان دەگوزەرێت!. ئەگەر پێشتر باسمان لەگەلە کۆمەی هەرێمی کردبێت لەسەر کورد، ئێستا دەبێت باس لە گەلەکۆمەی ناوەخۆ بکەین دژی کورد خۆی، کە ئەمە خۆی لەو بنەماڵە سیاسیانە دەدۆزێتەوە بە پێش تورکیا و ئێران دەکەون و کوردستان دەسوتین!. بێدەنگ بوونی رۆژنامەنووسان و رۆشنبیران هیچی لە هەڵوێستی ئەو بنەماڵە بەکرێگیراوانە کەمتر نیە، کە هۆزو عەشیرەتەکانی خۆیان خستۆتە خزمەت سوپای تورکیا و لە ژێر باڵی پارتی و یەکیتی و بە تایبەتیش پارتی، چاوساغی بۆ جەندرمە تورکە مرۆڤکوژەکان دەکەن و مەتەرێزو سەنگەرەکانی گەریلاکانیان پێ

نیشاندەدەن!. چ جیاوازیەک هەیە لە نێوان بێدەنگ بوون بەرامبەر راستی و رەوایی و قبووڵکردنی ناحەقی، لەگەڵ سیخوڕی و جاشایەتیکردن و پێش سوپای داگیرکەران کەوتن!؟؟ کاتی ئەوە هاتووە واز لە پارتی و یەکیتی بێنن، ئەوان هیچیان بە بەرنەماوە جگە لەوەی فڕێ بدرێنە زبڵدانی مێژووەوە. شەرمە چیتر باسی پێکهینانی حکومەت و پەرلەمانێک بکەن، کە لەسەر زبڵ و ساختەکاری و فڕوفێڵ و گزی و فزی بیاتنراوە. شەرمە گفت و گۆ لەسەر هەڵوێستی یەکێتی و پارتی بکەن و وتاریان لەسەر بنووسن و بازاری خۆتانی پێگەرم بکەن. وەک رۆژی رووناک دیارەو منداڵێکی ساوای کورد دەزانیت ئەوان هیچ شەرعیەتێکیان نەماوەو لە ریزی نیشتمانیدا دابڕاون تا هەتایەش لە دەرەوەی ئەو مێژووە دەمێننەوە، وەک رۆژی رووناک ئاشکرا بووە، کە ئەوەی ئەوانەی هێشتۆتەوە دەنگ و هەڵبژاردن و دڵسۆزی و نیشتمان پەروەری نیە، بەڵکو ئەوە سەرەنیزەو تۆپ و مەتەرالیۆزی داگیرکەرانە سواری ملی خەلکی کردوون!. ئەوان هیچ جیاوازیەکیان نەماوە لەگەڵ فەوجی جاشەکان و مەفرەزە تایبەتیەکانی سەردەمی سەدام، وەکو ئەوان و زیاتریش بە پێشی دوژمنان دەکەون سەری براکانیانیانی بۆ دەبەن، ئەوەی لە ماوەی ئەو بیست و هەشت سالە ئەوانە بەسەر کوردیان هیناوە هیچ جاش و خائنێکی تر لەمێژووی کورد وای بەرامبەر میللەتەکەی خۆی نەکردووە، نەک هەزار جار، بگرە ملیۆنان جار رەحمەت لەو کفندزانەی راستەوخۆ بەناوی جاشایەتیەوە کاریان بۆ دوژمن کردووە خەلک وەک جاش تەماشای کردوون. ئەوان جاش بوون و

دانیان بەجاشایەتی خۆیان دەنا، بەڵام بیست و هەشت سالە بە ناوی کوردایەتیەوە قێزەونترین جاشایەتی دەکرێت، کە لەمێژووی کورددا نمونەی نەبووە. بۆیە قۆناغی نوسین و رەخنەگرتن و تەنانەت ناوهێنانی ئەوانەش بەسەر چووە، ئەوانە تەنیا هێندەیان ماوە گۆڕانکارییەکی کەم لە ناوچەکە رووبدات تاوەکو بەر توورەیی خەڵک بکەون، ئەوانە هێندە تاوانیان بەرامبەر ئەو میللەتە کردووە جێگەی شرۆڤە کردن و لێکدانەوە بۆ رەفتارەکانیان نەماوەتەوە. شوورەییە سوپای وڵاتیکی تر پەلاماری وڵاتەکەت بدات، کەسێک نەبێت دەنگی لێوە بێت، شەرمەزاریە رەوایی بدەیتە داگیرکەرێک، کە بێت رۆڵەکانی گەلەکەت بکوژێت و لە ناوبەرێت، با مردن بۆ ئەو دەنگ و میبدا درۆزنانە بێت، کە بەناوی میدیای ئازادو کەسانی رۆشنبیرو سەربەخۆ گوێچکەی خەڵکیان کاس کردووە. میدیایەک، یاخود بەناو رۆشنبیرێک، لە رۆژێکی وەکو ئەمڕۆدا راستیەکان نەڵێت، تەنیا بۆ شەرمەزاربوون و ریسوایی نەبێت بۆ هیچی تر باش نیە!. دەبێت ئەوانیش وەکو خائینەکانی تری نیشتمان بخرێنە بەردەم دادگاکان و وەک تاوانبار مامەڵەیان لەگەل بکرێت.

2019\5\30

## دیاردەیەکی قێزەون

هەرگیز حەزم نەدەکردو نەمدەویست لەسەر بابەتێکی لەو شێوەیە بنووسم، بەڵام حاڵەتەکە بۆتە دیاردەیەکی ئێجگار قێزەون خەریکە هەموو کۆمەڵگای کوردی دەەتەنێت. ئەو دیاردەیە بە داخەوە خەڵکی سادەی کورد نایکات، بەڵکو ئەو ئەفەندی و بۆینباخ لەبەرو ستریژو قژ لوولانە ئەنجامی دەدەن، کە ناوی رۆشنبیرو رۆژنامەنووس و ئەکادیمیست .. و .. و .. لە خۆیان ناوە، ئەو دیاردەیە دزیکردنێکی بێ ئەدەبانەیە بە شێوەیەکی بە ئەدەبانە!. لە وڵاتانی پێشکەوتوو یەک پەرەگراف، تەنانەت یەک تاکە دێریش ئەگەر لە نوسین یاخود کۆڕو کۆبوونەکانی کەسێکی تر وەربگرن، بە ئەمانەتەوە ئاماژەی پێدەکەن. بە شێکی زۆر لە کتێبەکانی هیگل ئەو سەرنج و تێبیانەن، کە قوتابیەکانی لە کاتی گوێگرتن لە وانەکانی تۆماریان کردووە. کەچی لەم وڵاتەی ئێمە هەر هێندەی وتارێک دەنووسی، سیمینارێک پێشکەش دەکەی، یاخود بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی یاخود رادیۆیی ئەنجام دەدەی، دوای ماوەیەکی ئێجگار کورت، لە ژێر تایتلی جیا جیا دەکرێتە وتارو نوسین و بەرنامەو ... هتد، بەڵام بە ناوی کەسێکی ترەوە، کە لەبەر زەقەی چاوانت دزیت لێدەکات. رۆژێک قوتابیەک هاتە لام گوتی دکتۆر وتارێکم لە فلان رۆژنامە بڵاو کردۆتەوە رات چیە، کە بینیم وانەیەکی خۆم بوو!. ئەم دیاردەیە لە زانکۆکان و

میدیاکان و رۆژنامەکان و .... هتد دووبارە دەبێتەوە بە ئاسانی بەرچاوم دەکەوێت!. ئەم دیاردە قێزەونە پێویستە لە کۆمەڵگای ئێمە بنەبڕ بکرێت، دڵنیابن ئەگەر ئاماژە بۆ سەرچاوەی ئاخاوتنەکانتان یاخود نووسینەکانتان بکەن بچووکی نیە بەڵکو گەورەییە، هەم رێزی خۆت دەگریت و هەم رێزی بەرهەمی ماندوو بوونی خەڵکی تر، هاوکات متمانەشت لای خوێنەرو گوێگرو ... هتد زیاتر دەبێت. راشکاوانە ئەمجارە دەیڵێم ئەگەر ئەو دیاردەیە ببینم، ناوەکان دێنم و ...!!!. بەراستی کاتی ئەوە هاتووە رێز لە خۆتان و ماندووبوونی کەسانی تر بگرن و دەستبەرداری خووە پڕ شەرمەزاریە بن!.

2019\6\18

## سەرکەوتنی جەهەپەو دیدێکی تر!

دوای نزیکەی 19 ساڵ، یەکەم جارە ئیسلامیەکان رووبەرووی ئەو شکستە سیاسیە ببنەوەو پایتەختی راستەقینەی تورکیا، ئەستەنبۆڵ لە رێگای هەڵبژاردنەوە لە دەست بدەن. ئەوە بە شێکە لە گەمەیەکی سیاسی ناوەخۆی تورکیا، لە دوای جەنگی دووەمی جیهانەوە جەهەپە یەکەمین جارە لە رێگای دەنگدانەوە، نەک لە رێگای کودەتاوە رکابەرەکانی وەلاوەبنێت. ئەوەی ئەو هەڵبژاردنەش لە هەڵبژاردنەکانی تر جیا دەکاتەوە، سەنگی راشکاوانەی کوردە، بوونی نزیکەی دوو ملیۆن و نیو دەنگدەری کورد لەو شارە، سەرکەوتنی بۆ جەهەپە مسۆگەر کردو حزبەکەی ئەردۆگانیشی دوچاری ئەو شکستە گەورەیە کردەوە. لە راستیدا پیادەکردنی هاوسەنگکردنی سیاسی بە حزبێک و دژی حزبێکی تر، گەمەیەکی لەبار بوو بۆ دیارکردنی سەنگی سیاسی کورد لە تورکیا لە لایەک و لەلایەکی تریش تۆڵە کردنەوەیەک بەرامبەر ئەو زوڵم و زۆرداریەی ئەردۆگان و حزبەکەی بەرامبەر کوردیان کردوەو دەیکەن. ئەمە وەک نیوەی هاوکێشەکە شتێکی گونجاوەو سیاسەتێکی تا رادەیەک سەرکەوتوانە بووە.

بەڵام کێشە بنەڕەتیە لەم بەشەی هاوکێشەکەدا نیە بەڵکو لە نیوەکەی تردایە!. ئەویش سیاسەتی فەرمی دەوڵەتی تورکیایە!. کە رۆژئاواو ئەمریکا بە توندی پاڵپشتی دەکەن و لە ماوەی یەک سەدەی

رابردوودا هەموو ئامڕازێکیان خستۆتە بەردەم بۆ جینۆسایدو ڕەشە کوژ کردنی نەتەوەی کورد. جێگای سەرنجە سێ لەسەر چواری ئەو سەد ساڵە جەهەپە دەسەڵاتی لە دەست بووە. ئەو تاوانانەی لەو ماوەیە ئەنجامدراون، هەر لە تێکشکاندنی ڕاپەڕینەکانی شێخ سەعیدو ئاگری داخ و کیمیا بارانکردنی دەرسیم، تادەگاتە دانانی یاسای دوورخستنەوە پەرتەوازەکردنی کورد لە ساڵی 1932 و ڕاگواستنیان بە هاریکاری هێزە هەرێمایەتیەکانی تر بۆ ڕۆژئاوای تورکیا، بە مەرجێک ڕێژەی 5% دانیشتوان تێنەپەڕێنن، هەمووی لەسەر دەستی ئەو حیزبەدا بووە!.

جەهەپە بوو لە ماوەی جەنگی دووەمی جیهانیدا، ئابڵووقەی ڕاگەیاندنی خستە سەر باکوری کوردستان بە ئاشکراو بە نهێنی دەیان هەزار گەنج و ڕۆشنبیری کوردی کوشت و شوون بزر کرد. جەهەپە بوو کوردی بە تورکی کێوی ناساندو لە ماوەی هەموو تەمەنی خۆیدا کاری بۆ تواندنەوەو سڕینەوەی ناسنامەی کوردی کرد و دروشمی ئەوەی بەرزکردەوە، کە لەهەر شوینیک سەرەنیزەی تورکی لێبیت شتیک نیە بە ناوی کوردو مەسەلەی کورد. ژاندارمەکانی جەهەپە بوون زیندانی ئامادیان کردە گۆڕستانی شۆڕشگێڕانی کورد. جەهەپە بوو ...، ...،... ئێستاش ناکرێت ئەو خاڵە فەرامۆش بکرێت، کە سەرباری ئەو مێژووە ڕەشەی، جەهەپە زۆر زیرەکانە سوودی لە تووڕەییەکانی کورد لە ئەردۆگان و ئاکپارتی وەرگرت و لە پێناو گەڕانەوەی بۆ دەسەڵات بە کاریهێنا، بۆیە سەرکەوتنی یەکەم لەو هەڵبژاردنەدا بەر ئەو کەتووە!. ناکرێت لەبەر زوڵم

و زۆری دوژمنێکی ئەمڕۆ دوژمنێکی شاراوەی دوێنی و بەیانی فەرامۆش بکەین!. سیستەمی سیاسی لە تورکیا هەرچیەک بێت، سیاسەتی بەرامبەر کورد هەمان ئەو سیاسەتە دەبێت، کە لە ماوەی رابردودا پیادەی کردوە. چونکە لە بنەڕەتدا تورکیا وەکو دەوڵەتێک لەسەر بنەمای ئەوە دروستکراوە، کە پاسەوانی ئەو دۆخە جیۆپۆلەتیکیە بکات، کە رۆژئاواییەکان لەو ناوچەیە دایانڕشتووە. تورکیا جگە لە پاسەوانێکی دۆخی جیۆپۆلەتیکی رۆژئاو ئەمریکا زیاتر نیە!. بۆیە بە گۆڕینی سیستەمی سیاسی و گەمە سیاسیەکانی ناوخۆی تورکیا هیچ شتێک لە مەسەلەکە ناگۆڕێت. کورد پێویستە کار لە سەر تێکشکاندنی ئەو بنەمایە جیۆپۆلەتیکیە بکات، کە دەوڵەتی تورکیای لەسەر بنیاتنراوە. ئەمەش لە رێگای دۆزینەوەی میکانیزمێکی تر بۆ خەبات و کارکردن!. ئەم گەمە کردنە سیاسیەی ئێستای کورد واتای ونکردنی وێناکردنی جیۆپۆلەتیکی دەگەیەنێت لای کورد. کە لە هەموو کاتێک زیاتر پێویستی بەوە هەیە کاری لەسەر بکات. کورد پێویستە لە هەموو پارچەکانی کوردستان ستراتیژیەتێکی دوورە مەودا دابڕێژێت بۆ بەیەکەوە کۆکردنەوەو لکاندنەی قووڵایی جیۆپۆلەتیکی خۆی، کە دوای جەنگی یەکەمی جیهان لە لایەن رۆژئاواییەکانەوە پەرتەوازەو دابەش کراوە. بۆیە نابێت لەگەمەیەکی سیاسی روکەش و قێزەوندا، کە رەنگ بێت رۆژئاوا خۆی دەستی تێدابێت بۆ تۆڵە کردنەوە لە ئەردۆگان بەرامبەر هەوڵەکانی بۆ تێکشاندنی دۆخی جیۆپۆلەتیکی ناوچەکە لە رێگای نزیک بوونەوەی لە روسیا!. فریو بخوات

و گرەو لەسەر ئەسپێکی تۆپیو بکات. کاتی ئەوە هاتووە دوورتر بڕوانێت و

وردتر شتەکان لێکبداتەوە.

2019\6\24

## مەترسیەکانی رۆکێتی S-400 لەسەر کورد

یەکێک لە بوارەکانی ململانێی نێوان ئەمریکاو روسیا، ئەگەر بکرێت ناوی بنێین لە قۆناغی دووەمی شەڕی سارددا، سەپاندنی هەژموونیە لە رێگای هاوپەیمانیەتیەکانەوە. جا ئەو هاوپەیمانیەتیانە جیهانی بن یاخود هەرێمی. وەلێ هەندێک لەو هاوپەیمانیە هەرێمیانە رەهەندێکی جیهانی مەترسیداری هەیە. وەک ئەو هاوپەیمانیەتیە سێلایەنەی بە شێوەیەکی نا راستەوخۆ لە نێوان روسیاو تورکیاو ئێران دروست بووە. کە پێگەیەکی جیۆپۆلەتیکی زۆر مەترسیدار بە گوێرەی هەژموونی جیهانی دەگرێتەوە و دەتوانین بڵێین بەردی بناغەی پرۆژەی ئۆراسیایە لە ئاسیا بە گشتی و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە تایبەتی. لەبەرئەوەی ئەو دوو وڵاتە بە بەشێک لە قووڵایی ستراتیژی روسیا دادەنرێت بۆ گەیشتن بە ئاوە گەرمەکان، دیارە ئێران بەهۆی ناکۆکی لەگەڵ ئەمریکا، هەر لەزووەوە بۆتە هاوپەیمانێکی بەهێزی روسیا. بەڵام کێشەکە لە تورکیادایە، کە لە لایەک ئەندامێکە لە هاوپەیمانیەتی ناتۆ و زیاتر لە حەفتا ساڵە لە بەر دەرگای یەکێتی ئەورووپا وەستاوە بۆ ئەوەی ببێتە ئەندام، لە لایەکی تر بە هۆی باڵادەستبوونی ئاکپارتی، کە پارتێکی ئیسلامییە هەوڵدەدات بەرەو رۆژهەڵات بگەڕێتەوە ولەسەر بنەمای هەر سێ رەهەندی ( ئاینی- ئەتنیکی-مێژوویی و جوگرافی) خەونی دامەزراندنەوەی ئیمپراتۆریای عوسمانی بکاتەوە راستەقینە. کەواتە

تورکیا قاچێکی لە رۆژئاوایەو قاچەکەی تری لە مۆسکۆ، هەر دوو وڵاتیش، ئەمریکاو روسیا گرەو لەسەر راکێشانی تورکیا دەکەن، ئەمە وایکردووە تورکیا هەوڵبدا گەورەترین سوود لەو رکابەریە وەربگرێت. لە راستیدا تورکیا لە مێژووی نوێیدا بەردەوام ئەو سیاسەتە، یاریکردن لەسەر دوو پەتەی پیادەکردوە. کە کورد لەم سیاسەتدا زەرەرمەندی یەکەم بووە. روسیا هەوڵیدا لە رێگای تورکیاوە رێگاکانی گواستنەوەی وزە بۆ رۆژئاوا بۆ خۆی بە مسۆگەری بهێڵێتەوە. هاوکات مەترسیەکانی ئەمریکاو رۆژئاوا لە سنوورەکانی باشوریدا لە خۆی دوور بخاتەوە. بەرامبەر ئەمەش تورکیا هەوڵیداوە، سەرباری دەسکەوتە ئابوریەکانی دەستکەوتە ستراتیژیەکانیشی لەم رێگایەوە دابینبکات!. بە تایبەتیش لە سوریا. گرێبەستی کڕینی رۆکێتی S-400 لە روسیا یەکێکە لەو گەمە مەترسیدارانەو هەندێک پێیان وایە یەکێک بوو لەو فاکتەرە گرنگانەی روسیا دەرگای عەفرینی لە رۆژئاوای کوردستان بۆ تورکیا کردەوە. کە ئەمەش بێگومان دەستکەوتێکی ستراتیژی گرنگ بوو بۆ تورکیا. لەو کاتەوە ئەمریکا کار لەسەر ئەوە دەکات و فشار دەخاتە سەر تورکیا بۆ ئەوەی ئەو گرێبەستە هەڵوەشێنێتەوە. دیارە تورکیا بەرامبەر ئەمەش مەرجی هەیە، ئەو مەرجانەش لەسەر حیسابی بزووتنەوەی کوردە. راستە ئەمریکا گڵۆپی سەوزی بۆ تورکیا دایساندووە بۆ ئەوەی بە بیانووی پەلاماردانی پارتی کرێکارانی کوردستان ناوچەیەکی فراوان لە باشوری کوردستان داگیربکات و لە کاتی ئێستادا بەردەوامیشە لە داگیرکردنی. بەڵام تورکیا دەیەوێت

زیاتری دەستکەوێت و ئەمریکا ناچار بکات نەخشە ڕێگای منبج جێبجێبکات، کە لەگەڵ تورکیا لە سەری ڕێک کەوتووە. لە ڕێگای ئەو نەخشەیەوە تورکیا دەیەوێت چۆن روسیا دەرگای عەفرینی بۆ کردەوە، ئەمریکا دەرگای منبج و ڕۆژهەڵاتی فوراتی بۆ بکاتەوە. بەمەش بزمارێکی گەورە لە تابووتی بزووتنەوەی کورد دەدات لە هەموو پارچەکانی کوردستان. لە لایەک ڕۆژئاوای کوردستان کۆنترۆڵدەکات، باشوری کوردستانیشی بە شێوەیەکی کردەیی داگیر کردووە، ڕێگا لە هەر مەترسییەکی کوردیش دەگرێت لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان ئەگەر هەر گۆانکارییەکی سەربازی و سیاسی لە ئێران رووبدات. لەو روانگەیەوە کۆبوونەوەی سەرۆکی ئەمریکا و سەرۆکی تورکیا لە دوو توێی کۆبوونەوەکانی G-20 لەم چەند ڕۆژەی دادێ، مەترسی گەورەی لەسەر کورد هەیەو پێویستە بە وریاییەوە تێیبگات و خۆی بۆ ئامادە بکات.

2019\6\27

## دەهۆڵی شەڕی ناوخۆ بوەستێنن

## پێویستە (PKK) و (PDK) دەست بە گفتوگۆبکەن

شەڕێکی نا تەندروست و ترسناکی میدیایی لەنێوان دوو باڵی گەورەی کورد (PKK) و (PDK) لەو قۆناغە دەستپێکردووە، تەنانەت لە هەندێک شوێن لە ژێر فشاری تورکیا (PDK) لەو شەڕە تێوەگلاوە، بەڵام ئەوەی هێڵێکی هێشتۆتەوە بۆ گەیشتن بە ئاشتی ئەوەیە تاوەکو ئێستا شەڕەکە بە شێوەیەکی راستەوخۆ رووینەداوە. تا ئێستا پانتاییەک هەیە بۆ دانوستان و گفتوگۆکردن و رێگە نەدان بە دایسانی شەڕ، دەبێت هەوڵ بدرێت کێشەکان نەگەیەنرێتە ئاستی شەڕ، چونکە ئەوان دەتوانن شەڕ دەست پێبکەن بەڵام هەرگیز ناتوانن بیوەستێنن. ئەوەی جێگای داخە میدیاکان و تەنانەت میدیاکانی سێبەری ئەو دوو حزبەو حزبەکانی تریش لە هەستیاری و مەترسیداری دۆخەکە تیناگەن و ناتوانن لە بەرپرسیاریەتی ئەو قۆناغە تێبگەن، دەهۆڵ لێدان بۆ شەڕی ناوخۆ هەرگیز لەبەرژەوەندی کورد نیە، جگە لە چەند بازرگانێکی شەڕ سوودمەندی یەکەم تورکیاو داگیرکەرانی کوردستان دەبێت. هەرکەسێکیش ئەو دەهۆڵە دەکوتێت با خۆی یا کوڕی یا براکانی و خێزانەکەی راستەوخۆ بنێرێتە شەڕ، نەک خۆی لەسەر خوانی رازاوەو پارەی دزیاری دانیشتبێت و شوێن و خانووی لە دەرەوە کڕیبێت و کەسە نزیکەکانی خۆی لە دەرەوە بێت، داوا لە منداڵی هەژاری کورد بکات لە پێناو بەرژەوەندیەکانی ئەودا خۆیان

به کوشت بدەن. ئەوەی حەزی لەشەڕە با خۆی بچێتە بەرەی شەڕ نەک هانی خەڵکی تر بدات!.

پێویستە خەڵکی کوردستان ئەوە بە باشی بزانێت، کە ئەو شەڕە ئەگەر رووبدات، دوا شەڕی ناوەخۆ دەبێت و هاوسەنگیە نێودەوڵەتیەکە بە شێوەیەک گۆڕاوە، کە کورد تیایدا بە سفر دەردەچێت. تورکیا لە کاتێکدا خۆی بۆ پەلاماری رۆژئاوای کوردستان ئامادەکات و بە دەیان هەزار سەربازو چەکدارە توندرەوەکانی بە ناوئ ئۆپۆزسیۆنی سوریاوە لەسەر سنوورەکانی رۆژئاوا کۆکردۆتەوە، دەیەویت لەگەڵ دەستپێکردنی هێرش لە باشوریش شەڕی ناوخۆ دروست بکات، کە ئەمە لە لایەک لەرویی واتاییەوە زیانی زۆری بۆ رۆژئاوا بۆ هەموو کورد دەبێت، لە لایەکی تر بە ئاسانی باشور دەدەنەوە دەست حکومەتی عێراق و هیچ شتیک نامێنیت بە ناوی مەسەلەی کورد لە باشور. رەنگ بێت زۆرکەس بۆ ئەو خوێندنەوە تێبینی ئەوە بکەن، کە رۆلی ئەمریکا پشتگوێخراوە!. لە راستیدا ئەگەرتورکیا بەکارێکی وا هەڵسێت ئەوەی پەیوەستە بە رۆڵی ئەمریکا لە دوو ئەگەر زیاتر بە خۆوە ناگرێت، یاخود لە پیناو گەڕاندنەوەی تورکیا بۆ باوەشی رۆژئاوا ئەمریکا مەسەلەی کورد دەکاتە قوربانی و باجی ئاسایی کردنەوەی پەیوەندیەکانی لەگەڵ تورکیا بە کورد دەدات، ئەمەش واتای جێبەجێکردنی نەخشەرێگای مەنبەجە، کە لە مانگی شوباتی ئەمساڵەوە لەگەڵ تورکیا لەسەری رێک کەوتووە، یاخود تورکیا ئالنگاری ئەمریکا دەکات، وەک ئەوەی ئێران دەیکات و مەسەلەی ماوەی هەڵبژاردنەکانی

سەرۆکی ئەمریکا وەک دەرفەتیک دەقۆزێتەوە، بۆ ئەوەی سیاسەتەکانی خۆی جێبەجێ بکات!. لە هەموو حالەتەکاندا ئێستا ئەمریکا وەک گورگێکی بریندار دێتە بەرچاو، لە هەموو لایەکەوە پەلاماری دەدرێت، بۆ ئەوەی رایبکێشنە ناوڤێتنامیکی ترەوە!. تا ئێستا ئەمریکا دانی بەخۆیدا گرتووە، ئەو دان بەخۆداگرتنەش دەرئەنجامی سیاسەتی گەڕانەوە دواوەو لاتەریککردنی ئەمریکایە، کە (دۆناڵد ترامپ) پەیڕەوی دەکات و ئەمریکا لە ئەرکە جیهانیەکانی دووردەخاتەوە. لە هەموو دۆخیکدا نابێت گرەو لەسەر ئەمریکا بکرێت. بۆیە کورد نابێت لەو دۆخە هەستیارەدا بەو ئاڕاستەیە کاربکات و پێویستە تاکی کوردو حزبەکانی کوردی لەو مەترسیە گەورەیە تێبگەن!.

راستیەک هەیە پێویستە ئاماژەی بۆ بکەین، پارتی ئێستا کەوتۆتە ژێر رەحمەتی تورکیاو دەستی لە خنخنۆکە نراوە، ئامادەیە هەموو کاریک بکات لە پێناو مانەوە، بۆیە پێویستە دەروازەی رزگاربوون لای تورکەکان نەدۆزێتەوە، بەڵکو پێویستە کورد خۆی ئەو دەرگایەی بۆ بکاتەوەو دەست بە دانوستاندن بکرێت، ئەگەرچی دەرفەتەکە زۆر کەم ماوەو رۆژ بە رۆژیش بچووکتر دەبێتەوە، بەلام گرنگ ئەوەیە ئەو دەرفەتە تا ئێستاش ماوە، لە جیاتی تۆمەتبارکردنی پەکەکە بە تیرۆریست و لیدانەوەی قەوانی تورکەکان، پێویستە هێزەکانی تری کوردی رۆڵی ناوەندگیر بگێڕن. ئەگینا هەر شتیک رووبدات، بەر لەیەکێتی پارتی ئەوان دەکەونە بەر سزای گەل. ئەم شەڕە ئەگەر رووبدات وەک شەڕەکانی نەوەدەکانی سەدەی رابردوو

نابێت، ئەم شەڕە وەک شەڕەکانی هەشتاکانی سەدەی رابردوو دەبیت، چونکە سیستەمی جیهانی تاک جەمسەری نەماوەو پێگەی جیۆپۆلەتیکی کوردستان بە شیوەیەک گۆڕاوە، کە لە دۆخی قۆناغی شەری سارد دەچێت و خەریکە دەبێتەوە ناوچەیەکی تامپۆنی، بۆیە ئەو گۆڕانکاریانەی دێن، ئەگەر بەو ئاڕاستەیە بڕوات، ئەوا دۆخی کورد بە شێوەیەک نابیت ئێرەیی پێ ببردرێت.

2019\7\21

## نه شینیان بۆ بگێڕن نه یادی ئەو تاوانه بکەنەوە!.

### له یادی کارەساتی شەنگالدا

ئێوه، که به هەزاران چەکدارتان به ناوی پێشمەرگه کشاندەوەو بەرامبەر چەند سەد کەسێکی چەکدارانی داعش چۆکتان داداو راتان کرد، هەزاران ژن و منداڵتان دایه دەست داعش  بۆ ئەوەی بیانکاته سەبایاو له بازاڕەکانیدا بیانفرۆشێت. ئێوه، که لەگەڵ داگیرکەرانی کوردستاندا دەستتان تێکەڵ کردو هەزاران گەنج و ژن و منداڵی برایانی ئێزدیتان به جینۆساید کردن دا. ئێوه، که بەدرێژایی مێژووی خۆتان لەیەک شەڕی چارەنووس ئامیز نەتانتوانیوه بەرگری له گەلەکەتان بکەن. ئێوه، که له چرکەساتەکانی بڕیاردانی مێژوویدا تەسلیم بوونەتەوه چەکتان داناوە. ئێوه، که شەرمتان به خۆتان نەبوو ئەو چەکه گەورەو مام ناوەندو سوکەتان به دوای خۆتان راکێشاو گۆڕەپانی شەڕتان به بێ تەقه بۆ چەند منداڵێکی تراکسوت لەبەرو نەعل لەپێی داعش چۆل کرد. ئێوه، که شەرمتان به خۆنەبوو، فەرمانی کشانەوەو راکردنتان دا. ئێوه، که بەقسه زل و قارەمان و  پاڵەوان و شەڕ کەن بوون،  ئێوه، که به جل و بەرگی سەربازی له ئاهەنگەکان و لەنێو ژن منداڵاندا خۆتان نمایش دەکرد. ئێوه، که له پەنای مەتەرێزی بەرگریدا له دوورەوه به دووربین سەیرتان دەکرد و وینەتان دەگرت و له میدیاکاندا بڵاوتان دەکردەوه. ئێوه، که جۆرەها چەکتان به خۆوه دەکردو لەبەرچاوی کامیراکان به لەنجەولار دەهاتن و

دەچوون، به کردەوە نەتانتوانی تەنیا یەک کاتژمێر بەرامبەر هەرزەکارەکانی داعش خۆتان رابگرن و راتان کرد. ئێوە، کە به کردەوە لە راکردن و بەجێهێشتنی خەڵکی بێ چەک و هەژاردا نمونەتان نیە!. ئێوە، کە لە خۆهەڵواسین خۆ هەڵدانە ناو ترۆمبێلە گەورەو زەبەلاحەکانتاندا بۆ راکردن شەرمتان بە خۆ نەبو و نیە. ئێوە، کە تا ئیستا نەتانتوانیوە لێکۆڵینەوە لەگەڵ یەک بەرپرسی بەرپرس لەم شەرمازیە بکەن. کەواتە ئیوە خۆتان بەرپرس و شەرمەزاری یەکەمن. کەواتە تاوانی رەشەکوژی برا ئیزدیەکان لە ئەستۆی ئیوە دایە!. کەواتە ئێوە، لە هەموو دوژمنەکانی کوردستان مەترسیدارتر بووینە بۆ سەر کورد!. ئای چەند شەرمەزارن ئێوە بەرامبەر برا ئێزیدیەکان. ئای چەند شەرمەزارن ئیوە، بەرامبەر جینۆساید کردنی بارزانیەکان. ئای چەند شەرمەزارن ئێوە، بەرامبەر هەڵەبجە. چەند شەرمەزارن بەرامبەر ئەنفال، بەرامبەر ئەو پێشمەرگە قارەمانانەی فەرمانەکانی ئێوەیان جێبەجێنەکردو بەرگریان لە ئێزدیە لێقەوماوەکان کرد، بەرگریان لە مرۆڤ بوونی خۆیان کرد!. ئێوە تەنیا جارێک، تەنیا بۆیەک جار لەمێژووی پڕشەمەزاری خۆتان، تەنیا یەک جار شەرم لە خۆتان بکەن و لە یادی ئەو شەرمەزاریەتان لە پێشەوەی رێزی هۆڵەکان دامەنیشن و بە ئازاری خەڵکە کۆست کەوتووەکە پێمەکەنن. تەنیا جارێک شەرمتان بە خۆتان بێت شانازی بەوە مەکەن، کە لە پەرلەمان ئەو قەتل و عامە بە جینۆساید بناسینن، کە خۆتان بەرپرسی یەکەم بوون لێی!. خۆزگە تەنیا جارێک

شەرمتان دەکردو کورسیەکانی پێشەوەی ئەو یادەتان بۆ خەڵکە کۆست کەوتووەکە بەجێدەهێشت و لەو یادەدا چاو و رووتان نەدەبوو بێنە ناو خەڵک. ئای لە ئێوە، نازانم چ جۆرێکن لە بوونەوەر ئێوە؟!.

2019\8\3

## له ململانێی سیاسیەوە بۆ ململانێی خێڵ

ڕەسول حەمزاتۆڤ، لەکتێبی داغستانی مندا وتەیەکی جوانی نوسیوە:" ئەگەر خەنجەرت لەبەر پشتی خۆت بینی، بزانە خەڵکیش پیاوە! ". ئەمەش واتای ئەوەیە هەرچەندە بەهێزیش بیت، پێویستە حیساب بۆ بچووکترین شتیش بکەیت و ڕێزی هەموو شتیک بگریت. بەلام لە کوردستان نەک هەر ئەمە ناکرێت، بەڵکو ڕێک پێچەوانەکەی ئەنجام دەدرێت، هەر کاتێک هێزێک هەست بە بەهێزبوونی دەسەڵاتی خۆی دەکات، هەموو ئەوانەی تر نەک پشتگوێ دەخات، بەڵکو سوکایەتیان پێدەکات و تەنانەت هەوڵی سڕینەوەشیان دەدات!. هەرچەندە ئەو بەهێزبوونانەی هێزەکانی کوردستانیش، دەرئەنجامی گەشەسەندنی خودی خۆیان و پێگەیشتنی خۆیان وەک ئەقلێکی پێشکەوتو و ئەفراندە نیە، هێندەی ئەنجامی بە کۆیلە بوون و پاشکۆبوونی هێزە هەرێمیەکانی ترە. ئێمە دەبینین لە پەنای هەر کۆیلەیەکی خۆ بەهیزو بەزلزان، زڕتەسۆرێکی هەرێمی وەستاوە، کە داری داوەتە دەست و داریشی لەسەر بەرزرکردۆتەوە!. ڕەفتارەکانی هەموو هێزەکانی کوردستان ئەمڕۆ بە ئاشکرا ئەو مۆرکەی پێوە دیارە، بە تایبەتیش یەکیتی و پارتی!. بەڵام ئەوەی دەرهاویشتەکانی مەترسیدارتر دەکات و خەریکە ترسناکتر بەدیاردەکەوێت، لە خۆبایی و بەخ بوونی پارتیە، کە خەریکە بەڕاستی باوەڕ بەخۆی بکات، کە بەهێزترین حیزبی کوردستانەو خاوەنی 45

کورسیە!. لە خۆبایی بوونی ئەو هێزە، وایکردووە، کە کرۆکە خێلەکیەکەی خەریکە چوارچێوە حیزبەکەی بە ئاشکرا هەڵدەدڕێ و لە ململانێی نێوان حیزبەکانەوە، دۆخەکە بە ئاڕاستەی ململانێی نیوان خێڵەکان و گەڕانەوە بۆ خاڵی سفردەبات!." هەموو شتێک لە پێناو مانەوەی بنەماڵەکەم و بنەماڵەکەشم لە پێناو مانەوەی خۆم". ئەم زەنگە زۆر مەترسیدارەو کاریگەریەکی ترسناکی لەسەر کۆی مەسەلەی کورد لە قۆناغی ئێستادا هەیە.

ململانێی پارتیەکان لەگەڵ خێڵە گەورەکانی کوردستان، لە مێژووی ئەو حیزبەدا، خاڵێکی بەرچاو و دیاربووە، تەنانەت فاکتەرێکی گرنگ و سەرەکیش بووە لەسەر دابەش بوونی خێڵەکان بەسەر دوو بەرە، بەرەی حکومەت و بەرەی دژە حکومەت، بەشێکیان ناویان لە خۆیان نا پێشمەرگەو چەتری خەباتی نەتەوەییان خستە خزمەتی خۆیانەوە، بەشەکەی تریش ناوی جاشیان پێبڕا. کە بەداخەوە لە کرۆکدا ئەوەی هەردوو لای دەبزواند، ململانێ خێڵەکیەکە بوو نەک شتێک بەناوی مەسەلەی کورد و گیانی نەتەوایەتی. لە قۆناغی ئێستادا پارتی دیموکراتی کوردستان، یاخود وردتر بنەماڵەی بارزانی، خەریکە حکومەت و ململانێ سیاسیەکان بە ئاڕاستەی جلەوکردنی خێڵە گەورەکانی تری کوردستان ئاڕاستە دەکەن، کە ئەمە وایکردوە و بە داخەوە، بەشێکی گرنگ خێڵە گەورەکانی تری کورد، کە هەموویان ئەگەر خۆیان پێ لە بارزانیەکان گەورەتر نەبێت کەمتر نیە، بە ئاڕاستەیەکی تر کاربکەن و هەوڵبدەن بۆ

تێکشکاندنی ئەو بنەماڵەیە پەنا بۆ هەموو شتێک ببەن، دیارە لە دۆخێکی هەستیاری وەکو ئەمڕۆی ناوچەکەو کوردستانیش، زۆر باوەشی گەرمتر کراوەیەو زیاتر ڕێزیان پێشکەش دەکات. ئەمەش لە کۆتایدا کورد لە جیاتی شەڕی نیوان حیزبەکان بە شەڕی نێوان بنەماڵەو خێڵەکان خەریک دەکات. بڵاوبوونەوەی دمگۆی دروستکردنی فەوج لە لایەن کۆمەڵێک خێڵ و هۆزی گەورەی باشووری کوردستان، دەکەوێتە ئەو چوارچێوەیەوە. بۆیە دیسان بۆ ئەوەی نیو سەدەی تر گوێی ئەم میللەتە بەشەری جاش و پێشمەرگە کاس نەکرێت، پێویستە ئاڕاستەی ململانێکان بە ئاقارێکی تری وادا بڕوا، خزمەت بەیەکڕێزی و بە سیاسی کردنی هێزەکانی سەر گۆڕەپانی باشوور بکات. با ئەمجارەیان شەڕی نێوخۆیی حیزبەکان بچووکتر نەکرێتەوە بۆ شەڕی نێوان بنەماڵەو خێڵەکان. کە زۆر مەترسیدارو ترسناکترە.

2019\9\1

## هەمووان دژی کوردو کوردیش دژی خۆی!!؟

ئەو ململانێیەی لەناوچەکە دەگوزەرێت، ململانێیەکی جیۆپۆلەتیکیەو لەسەر دابەشکردنەوەی نەخشەی سیاسی جیهانەو دارِشتنەوەی شێوازێکی تره له سیستەمێکی جیهانی ، که تیایدا ئەمریکا باڵا دەست نەبێت، ململانێیەکان هەر بەرگێکی ئایدیۆلۆژیان پۆشی بێت، هەر پرەنسیپ و دروشمێک دژی یەکتر بەکار بهێنن، تەنیا شتێکی رووکەشانەیەو ململانێیە بنەرِەتیەکە ناشارێتەوە، که ململانێیەکی جیۆپۆلەتیکیە، رووسەکان دەیانەوێت له رێگای پرۆژەی ئۆراسیاوە، که چەمکێکی جیۆپۆلەتیکیەو کار لەسەر دارِشتنەوەی سیستەمێکی نوێی جیهان دەکات، رادەیەک بۆ هەژموونی ئەمریکا دابنێن، ئەمریکاش دەیەوێت له رێگای پرۆژەی جیهان گەرایی و پرەنسیپەکانی دیموکراسی لیبراڵەوە، هەژوومونی خۆی بەسەر گۆی زەوی بچەسپێنێت. هەردوو بەرەکەش کار لەسەر ئەوە دەکەن گۆرەپانی شەرِەکان له ولاتی خۆیان دوور بخەنەوە، تەنانەت هیزە هەریمایەتیەکانی سەر بەو دووبەرەیەش کار لەسەر هەمان شت دەکەن، بۆیە ئەو ناوچانەی قەیراناوین، وەکو عێراق و سوریا له رۆژهەڵاتی ناوەراست، بۆ نمونه بوونەته گۆرەپانی یەکلاییکردنەوەی شەرِەکان، دیاره خاکی کوردستانیش هەر له کەنارەکانی دەریای سپی ناوەڕاستەوە، تا دەگاته دوا خاڵ له رۆژهەلاتی کوردستان، به شیوەی

نیمچە لاکێشەیەک بۆتە  بنکەی سەرەکی ئەم جەنگە، کە ئەگەرچی لە بنەرەتدا وەک جەنگێکی نیوخۆیی لە نێوان دەسەلات و ئۆپۆزسیۆنی پەرتەوازەی ئەو وڵاتانەدا نیشان دەدریت، بەڵام لە بنەرەتدا جەنگێکی جیۆپۆلەتیکی جیهانیە!.

لەو جەنگەدا هەموو ئەو لایەنانەی کوردستانیان بەسەر دابەشکراوە، ئەگەر لە سەر هەموو شتێک ناکۆک بن، ئەوا کۆکن لەسەر لێدانی هەموو هەوڵێکی کورد بۆ رزگار بوون، بۆیە دەبینین، لەو ماوەیەدا، سەرباری هەموو ناکۆکیەکانیان، تورکیا و ئێران روسیا کار لەسەر دروستکردنی هاوپەیمانیەتیەکی سیلایەنە دەدەن، کە ئەمەش بەشێکە لە دروستکردنی پرۆژەی ئۆراسیا، بۆ ئەوەی رێگا لە هەلوەشانەوە و سەرلەنوێ دارشتنەوەی ناوچەکە بگرن، واتە ئەو هاوپەیمانیەتیە بە شیوەیەک لە شێوەکان دژی هەر هەوڵێکی سەربەخۆیی کوردانە، ئەمە ئەوە دەگەیەنیت، هەرچەندە هەڵگرانی پرۆژەی ئۆراسیا رایدەگەنن، کەوا ئەگەر کورد لە ئەمریکا دوور بکەویتەوەو بچێتە ژێر سایەی ئەو هاوپەیمانیەتیە دەگاتە مافی ئۆتۆنۆمی خۆی، بەلام ئەوەی لە راستەقینەدا روویداوە، ریک پێچەوانەی ئەو بانگەشەیە بووە! هەرئەو هاوپەیمانیەتیە بوو رێگای بۆ تورکیا خستە سەر پشت . کە نەک بە تەنیا شاری عەفرین داگیر بکات، بگرە هەوڵ بدات لە رێگای گۆرینی دیموکرافیاوە، بە دیوارێکی مرۆیی  لە رەگەڤی تورک و عەرەب سنوور لەنیوان کوردستان دابرێژیتەوە!

ئەمریکا، کە خۆی بە هەڵگری پرۆژەی جیهانگەرایی و پرەنسیپەکانی لیبراڵ دیموکرات پێناسە دەکات، جوانترین و راستەقینەترین ترین سیاسەتی بەرامبەر مەسەلەی کورد لەسەر زاری سەرۆک ترامپ دەربڕی، کاتیک گوتی:" کورد نەتەوەیەکی ئازان، پێویستە بەکاریان بهێنین" ،زۆر لە رۆشنبیرو ئەوانەی لە سیاسەت کاردەکەن ، تا ئێستا واتیدەگەن کەوا ئەمریکا کوردی پاراستوەو ئەگەر ئەمریکا نەبوایە، ئەوا هیزە هەریمایەتیەکان کوردیان لە ناو دەبرد، لە راستیدا ئەو بیرکردنەوەیە شتیکی لە راستی تیدا نیە، چونکە ئەمریکا لەو پانتاییە جوگرافیەی، کە پێی دەگوتریت کوردستان تەنیا هەوڵی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی خۆی داوە، ئەمریکا هەرگیز پشتگیری کوردی نەکردوە، هەرکاتیکیش بەرژەوەندیەکانی کەوتبیتە مەترسیەوە، ئەوا ئەو کاتە بە گەرمی کەوتۆتە لێدانی کورد، بینیمان چۆن لەگەڵ تورکیاو بەریتانیاو ئێران و ... هتد رێک کەوت بۆ ئەوەی کەرکوک لە ژێر دەستی کورد دەربینێت، تەنانەت یەکیک لە فاکتەرەکانی دورژمنداریکردنی کورد لە لایەن هیزە هەریمایەتیەکانەوە، ئەوەیە کەوا کورد بە ئەسپی تەروادەی ئەمریکا تیدەگەن! نابێت هەرگیز ئەوەمان لە یاد بچیت کەوا لە هەشتاکانی سەدەی بیستەمدا رژیمی بەعس بە دەستخۆشی و پاڵپشتی ئەمریکا کوردی کیمیا باران و ئەنفال کرد!.

کەواتە ئەو دوو بەرەیەی ئێستا لەسەر شیوازی دارشتنەوەی سیستەمی جیهانی کاردەکەن، هیچ شتیکیان بۆ کورد پی نیەو لەو

خاڵانەی، کە دژی یەکگرتنەوەو رزگاربوونی کوردە کۆک و تەبان، بە واتایەکی تر دوژمنانی کورد ئەگەر لە هەموو شتێک جیاواز بن، ئەوا لەسەر دوژمنداری کورد و رێکن و هیچ کێشەیەکیان نیە، بەرامبەر ئەمەش کورد بۆتە چەند پارچەیەک و بە هەموو شیوەیەک دوژمنداری بەکتر دەکەن! پیم وایە هۆکاری بنەڕەتی ئەمە، جگە لەوەی کۆمەڵێک مافیاو پیاوی ئەو هێزانەی دوژمن بە کورد جڵەوی دەسەلاتی کوردیان گرتۆتە دەست، هاوکات شێوازی خەباتی کورد، کە تا ئێستا خاوەنی ستراتیژیەتیکی نەتەوەیی خۆی نیەو لە بایەخی جیۆپۆلەتیکی خاکی خۆی تێنەگەیشتوە، تا ئێستا لەسەر بنەمای ئایدۆلۆژیا کاردەکات، کە دیارە لە ململانێیە جیهانیەکاندا ئایدیۆلۆژیا تەنیا وەک وەک سۆفت پاوەریک بەکاردەهێنریت و ململانێیە جیۆپۆلەتیکیە راستەقینەی پێ دەشاردریتەوە!، کەواتە بۆ ئەوەی کورد کێشەی ناومالی خۆی چارەسەر بکات، پێویستی بە گۆڕینی میکانیزمی خەبات و دنیابینی و سیاسەت کردنی خۆی هەیە، ئەگەر بەو شیوەیەی ئێستا بیر بکاتەوە و نەتوانیت پێگەی جیۆپۆلەتیکی کوردستان (کوردستانی گەورە) لە ململانیکان دیاری بکات، ئەوا هەمیشە بەو شێوە دەمێنیتەوە، کە تیایدایەو رۆژ بە رۆژیش دۆخەکەی بەرەو خراپتر دەچێت، بۆیە لە کاتیکدا لەناو جەنگێکی جیهانیدایانە، کە رۆژ بەرۆژ ئەو جەنگە مەترسیدارت دەبیت، دەبیت کورد بە شیوازکیی تر سیاسەت بکات و چیتر لە دووتوێی چەند حزبیکی ستۆک بوەوە سەیری رووداوەکان نەکات! دەبیت رۆشتبیران و نەوەی نوێی کورد شیوازی

بیرکردنەوە و خەباتی خۆی لە بناغەوە بگۆڕێت، کە نەخوێندەوارو سیاسیە بازرگانەکانی کوردستان، بە هاوکاری دوژمندان و داگیرکەرانی کوردستان، بە ماوەیەی دەیان سال کاریان لەسەر دروستکردنی کردووە.

2019\9\9

## کێشەی هەرێم و بەغدا لە کوێ دایە؟

ساویلکەییە وا تێبگەین کێشەکانی نێوان هەولێرو بەغدا پەیوەندی بە مەسەلەی تەسلیمکردن و تەسلینەکردنی نەوتەوە هەبێت، لەبەرئەوەی کێشەکانی نێوان هەرێم و بەغدا کێشەیەکی قووڵەو تەمەنی لەگەڵ تەمەنی دەوڵەتی عێراقە، هێنانە پێشەوەی مەسەلەی نەوت و بەستنەوەی بە مەسەلەی بۆجە، تەنیا هەوڵێکە بۆ فریودانی رای گشتی خەڵکی کوردستان و نادیدەگرتنی کێشە قووڵەکانە، کە رەهەندێکی هەرێمی و نێودەوڵەتی هەیەو بەغدا ناتوانێت بە هیچ شێوەیەک لە دەرەوەی ئەو مەنزوومە هەرێمیە مامەڵە لەگەڵ کورد بکات. چەندەی دۆخەکە لەسەرئاستی هەرێمی و نێودەوڵەتی ئاڵۆزە، هێندەش زیاتر لەسەر ئاستی ناوخۆ، هێزەکانی کوردستان متمانەی خەڵکیان لە دەستداوە، لە ناوەخۆش متمانەیان بە یەکتر نەماوە. ئەمەش شتێکی ئاساییە دوای ئەو مێژووە ناشیرینەی لە نێوانیان هەیە. پارتی دەیەوێت کێشەکان بە لەسەرسک راکێشانی خەڵکی کوردستان چارەسەر بکات و دادو فیگانی برسیەتی و نانبڕاوکردنی خەڵکی کوردستان وەک ئامرازێکی سیاسی بەکاربێنێت، یەکێتی پێی وایە پڕۆسەی 16 ئۆکتۆبەری هێشتا تەواو نەکردووەو هەمیشە بەغدای وەک هێڵی سەرەکی هێشتۆتەوە بۆئەوەی شەڕی پارتی پێبکات. گۆڕان و پارتەکانی تری ئۆپۆزسیۆن، رۆڵێکی زۆر خراپیان بینی

لە تێکشکاندنی ئیرادەی ئۆپۆزسیۆن بوون و خەڵکیان خستە بێ ئومێدیەکی گەورەوە. بەرامبەر ئەم لاوازییەی ناوەخۆی کوردستان، گۆڕانکاری هەرێمی مەترسیدار روودەدات، کە ناکرێت بۆ خوێندنەوەی دۆخی هەرێمی کوردستان و مەسەلەی کورد بە گشتی بە هەندی وەرنەگرین. عێراق بەهێزبۆتەوەو لەسەر هێڵە هەرێمیەکان و بەسەنتەرکردنەوەی دەسەڵات کاردەکات. سوریا خەریکە دەسەڵاتی بۆ سەر ناوچەیەکی زۆری وڵاتەکەی دەگەڕێنێتەوە، ئەگەر مەسەلەی ئەدلب تەواو بێت سوپای سوریا راستەوخۆ رووبەرووی رۆژئاوای کوردستان دەبێتەوە. لەمەشدا روسیا پاڵپشتی دەکات و وەک لێدانی پێگەیەکی ئەمریکا لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست تەماشای دەکات، یاخود دەیەوێت وای ببینێت بۆ گەڕاندنەوەی سەروەری سوریاو دەوڵەتە هەرێمیەکانی تر، کە لەدوای روخانی سۆڤیەتەوە کاڵ ببووەوە. روسیا پێی وایە لێدانی ئەزموونی رۆژئاوای کوردستان بە بەرژەوەندی ئەو تەواو دەبێت. تورکیا ناوچەیەکی زۆری لە پشتێنەی سنووری هەرێمی کوردستانی داگیر کردووە، خەریکە هێزە کوردیەکان داخنێتە نێو بازنەی خۆی و حکومەتی عێراقەوە، بە پلەی یەکەم پارتی دیموکراتی کوردستان خەریکە بە تەواوی ئابڵووقە دەدرێت و تۆڵەی ریفراندۆمی لێدەکرێتەوە. لەو دۆخە ئاڵۆزەدا هەولێر نەک 250 هەزار بەرمیل نەوت بگرە هەموو نەوتی کوردستانیش تەسلیمی بەغدا بکات کێشەکە چارەسەر نابێت و بەغدا مەبەستی سەرەکی تێکدانی دۆخی هەرێمی کوردستانە، کە لەمەدا تورکیاو ئێران و سوریاش لەرووی

سیاسیەوە یارمەتی دەدەن و ئەم ستراتیژیەتەش تەنانەت لە دەرەوەی دەسەڵاتی حکومەتی بەغدایە!. بۆیە دۆخی کوردستان زۆر لەوە مەترسیدارترە وەک میدیاو رۆشنبیرو خوێندەوارەکانی کورد باسی دەکەن و بچووکیان کردۆتەوە لە مەسەلەی نەوت و بۆجەو مووچەی فەرمانبەران.

2019\9\17

## هونەری خوێندنەوە و خوێنەری کورد

## ڕەخنەیەک لە شێوازی خوێندنەوەو ڕەحنەگرتن لای تاکی کورد

خوێندنەوە بە تەنیا پرۆسەیەکی مەعریفی نیە، بەڵکو هونەرێکیشە لەچۆنیەتی تێگەیشتن لە وشە چنراوەکان و تەماشاکردنی ڕستەکان لەو گۆشەنیگایەی، کە دەبێت تیایدا تەماشا بکرێت!. خوێنەری زیرەک هەرگیز لە ڕوانگەیەکی تەسک و بچووکەوە سەیری پەرەگرافەکان و کۆی تابلۆی نووسینەکە ناکات، بەڵکو دەیەوێت هەموو وێنەکان بەیەکەوە ببەستێتەوەو بەوردی لێی بکۆڵێتەوە ئینجا بیری لێبکاتەوە بڕیاری لەسەر بدات. بەداخەوە تێبینم کردووە لەناو خوێنەری کورددا، ئەگەر بتوانین ناو لەو کەسانە بنێین خوێنەر، کە سەیری نوسینەکان دەکەن و بەرلەوەی تەوای بکەن و تێێ بگەن بڕیاری پێشوەختەی خۆیانی لەسەر دەدەن. یەکێک لە ئامانجەکانی میتۆدی هارمۆنەتیکی تێگەیشتنە لە دەق وەک ئەوەی نووسەر ویستوویەتی، نەک وەک ئەوەی خوێنەر خۆی دەیەوێت و بەگوێرەی دنیابینی خۆی واتایەکی بۆ دابڕێژێت و شیکردنەوەی بۆ دەکات. تێگەیشتن لە دەق وەک ئەوەی نووسەر نووسیویەتی زۆر گرنگە بۆ تێگەیشتن لە بیرباوەری نوسەرو گفتوگۆکردن لەگەڵیدا. ناکرێت لە چوارچێوەیەکی بچووکەوە سەیری مەسەلەی زۆر گەورەو ئاڵۆز بکرێت، بۆ نمونە لە

نوسینیکدا نووسیومه کێشەی نێوان بەغداو هەرێم بە شێوەیەکی سەرەکی پەیوەندی بە مەنزوومەیەکی هەرێمیەوە هەیەو سیستەمی سیاسی لە عێراقدا هەرچیەک بێت ناتوانێت لەدەرەوەی ئەو سیستەمە بیربکاتەوە، ئەو مەنزومە هەرێمیەش لە دووتوێی سیستەمیکی جیهانیدا کاردەکات، کە ئێستا لە وروژانەو سەقامگیری لە دەستداوە. تەماشاکەرێکی ئەو دەقە نووسیویەتی تۆ بەم نووسینە خزمەتی پارتی و بنەماڵەی بارزانی دەکەیت، کەواتە خوێنەری کورد لە دووتوێی چەند بنەماڵەیەکی سیاسیدا، وەک لەنووسینیکی پێشوومدا ناوم لەو حیزبانەی کوردستان ناوە. نووسینەکە دەخوێنییێتەوە، ئەمەش بچووک نیشاندانی دنیابینی و بیرکردنەوەی خوێنەری کوردە، بەداخەوە، کە هەندێکیان خۆیان بە دەستەبژێرو ئیلیتی کوردیش هەژمار دەکەن!. تۆڵە کردنەوە لە پارتی لەمەسەلەی ریفراندۆم هەرگیز بەرگریکردن نیە لە پارتی، بەڵکو سیناریۆی ریفڕاندۆم لە رێگای پارتییەوە ئەنجامدرا بۆ لێدانی مەسەلەی کورد، هەر وڵات و هێزێک لە پشت ریفراندۆمەوە بوو بێت، واتای ئەوەیە هەوڵێکە بۆ ئەوەی هێزێک بەرەو ئەو ئاڕاستەیە ببەیت، کە خۆت گەرەکتە بۆ ئەوەی دواتر وەکو مەترسیەک نیشانی بدەیت و لەرێگای ئەوەوە کۆی مەسەلەی نەتەوەیەک بە ئامانج بگریت. کە دەڵێی کێشەی هەرێم و بەغدا کێشەی مووچە نیە، واتای ئەوە نییە پاکانە بۆ دەسەڵاتی کوردی دەکەی!. کەوا ماڵ و سامانی کوردستانی بەهەدەر نەداوە، مەسەلەی بەهەردان و تەخشان و پەخشانکردنی سامانی سەرزەوی و ژێر زەوی کورستان، مەسەلەیەکە

تەنانەت خودی هێزەکەکانی ناودەسەڵاتیش داننیان پیاناوە، مەگەر سیناریۆی چاکسازی و نەهێشتنی گەندەڵی لەمە زیاتر چیتر دەگەنێت!.
ناکرێت ئەمە واتلێبکات ئەو راستەقینە نەبینیت، کە شەڕی مووچە لە چوارچێوەی شەڕێکی زۆر گەورەترەوە ئەنجامدەدرێت، کە هێزە هەرێمییەکان ئەنجامی دەدەن بۆ تێکشکاندنی ئیرادەی تاکی کوردی و برسیکردنی، ئەمە هیچ لەمەسەلەکە ناگۆڕیت، ئەگەر دەسەلاتی هەرێمیش لەو یاریە ترسناکە تێوەگلابێت، چونکە ئێمە باسی شەڕێک دەکەین دژی میللەتێک نەک چەند حیزبێک!.

بەداخەوە ئەوانەی رەخنە لەو حیزبانەی دەسەڵاتیش دەگرن وەک مۆدێلێکی دژە باو کاری لەسەر دەکەن، نەک وەکو مەسەلەیەکی هزری، کە پەیوەندی بە چارەنووسی میللەتێک و نیشتمانێکەوە هەبێت، سەیر لەوەدایە ئەوانەی بەناوی رەخنەوە ئەو شەتەحاتە سیاسیانە دەنووسن، هەر خۆشیان لە روانگەو لەژێر چەتری دنیابینی ئەو حزبانە بیردەکەنەوە، کە گوایە رەخنەیان لێدەگرن، بۆ نمونە ئەو بەناو کوردایەتیەی، کە لە ماوەی زیاتر لەنیوسەدەی رابردوودا، واتا دوای جەنگی دووەمی جیهان، لە لایەن ئەو حیزبە کۆنە پارێزانەوە داهێنرا، دەکەنە پێوەرو لە ژێر رۆشنایی رەوشێکی سەقەتی لەم جۆرەدا خویندنەوە بۆ تەواوی مەسەلەی کورد دەکەن، لە پەنای ئەمەش بەناوی رەخنەگرتن لەکوردایەتی ئەو حیزبانەوە، کە من پێم وایە کاری ئەو حیزبانە لە زیاتر لەحەفتا ساڵی رابردوودا هەرگیز ناکەوێتە دووتوێی کوردایەتی و ئەوانەی بەناوی رێچکەی

کوردایەتیەوە شرۆڤەیان بۆ دەکرێت، تەنیا بازرگانێکی مەسەلەی کورد بووینە، کە رۆژگار ئەوەی سەلماند پڕ قازانجترین بارزرگانی بووە لەم وڵاتەدا. لە پەنای ئەو خوێندنەوە سەقەتەشدا کۆی خەباتی میللەتێک ریسوا دەکەن، خەریکە لە پەنای رەخنەگرتن لە کوردایەتیەوە مرۆڤ بوونی کورد ریسوا دەکرێت، خەریکە جنێودان و وشە دزێوەکانی ناو فەرهەنگی کوردی رێزی پێشەوەی نووسینەکان دەگرن و رێگا لە وشە جوانەکان و بیرکردنەوە جوانەکان دەگرن و لە گۆڕەپانەکەی تووڕ هەڵدەدەن!. تەنانەت زۆر کەس وایدەبینن کورد بوون عەیبەیەکی گەورەیە، لەکاتێکدا ئەو دەیان نمونە جوانەی مرۆڤی کورد فەرامۆش دەکەن، کە لەدەرەوەی میتۆدی ئەو حزبانە زۆر بەدڵسۆزیەوە کاردەکەن و دەیانەوێت لە ئاستی بەرپرسیاریەتی قۆناغە مێژووییەکەی خۆیان دابن.

سووککردنی مەسەلەی نەتەوەیەک لەکوێی خەباتی مرۆڤایەتیدایە؟،

ئەگەر گریمانی ئەوە بکەین، کەوا لە چوارچێوەیەکی فراوانتر لە ناسیونالیزمەوە بیردەکرێتەوە. ئەو تێگەیشتنە ناتەندروستە لە ناسیونالیزم و جوێنەکردنەوەی ناسیونالیزم لە ناسیونالیزمی توندڕەو، یاخود وەک بەهەڵە ناوی دەنێن فاشیزم، یاخود فاشیزمی کوردی، وایکردووە بەناوی دڵسۆزیەوە خەباتی میللەتێک چرووک بکرێت، ئێستا هێندەی میدیاکان و بەناو رۆشنبیران و سیاسەمەتدارە ستۆکەکانی کوردی کار لەسەر تیکشکاندنی ئیرادەی کورد دەکەن، دوژمنانی کورد لە ماوەی دەیان ساڵی رابردوودا ئەمەیان بۆ نەکراوەو بۆیان نەچۆتە سەر.

کەواتە بە نەزانی بێت یاخود بەزۆرزانی لە پەنای ئۆپۆزسیۆن بوون و رەخنەگرتنەوە، خەریکە ئامڕازێک دروست دەبێت بۆ خزمەتکردنی داگیرکەرانی کوردستان. ئەو بەغداو عیراقچیەتیەی ئێستا خەریکە لەناو خویندەواری کورددا دروست دەبێت و دروست بووە، وایکردووە ئەو بەغدایەی، کە کوردی ئەنفال کردو لەهەر دەرفەتێکشیدا بۆی برەخسێت ئەنفالی دەکاتەوە بکرێتە فریشتەو وەک نمونە سەیر بکرێت!. ئەمە کارەساتە، کاتێک ئەو راستیە دەڵێیت واتای ئەوە نییە بەرگری لە دەسەلاتی کوردی دەکەیت، لەبەرئەوەی دەسەڵاتی کوردی خۆشی لەماوەی رابردوودا گەورەترین دوژمنداری مەسەلەی کوردی کردووە، بەڵام هەر حەقیقەتەی بەگوێرەی خۆی پێویستە تەماشا بکرێت.

شکستهێنانی کۆمەڵێک بازرگانی چاوچنۆکی سیاسی، کە بەهەلە ناویان دەنێن نوخبەی سیاسی، واتای شکستهینانی خەباتی میللەتێک نییە، ناکرێت رۆشنبیرو خوێندەوارو خوێنەری کورد هێندە ساویلکە بێت تەنیا لە روانگەی یەکێتی و پاریتی و حیزبە ستۆکەکانی ترەوە سەیری شتەکان بکات و خوێندنەوەیان بۆ بکات، کە ئەو هێزانە لەناو هاوکێشە هەرێمیەکان لەرۆڵی سەرۆک هیزێک، یاخود وردتر لە رۆڵی سەرۆک جاشێک زیاتر نابینن!. لە راستیدا ئەمە کارەساتیکی گەورەیە گۆرەپانی هزری و میدیایی و ئەوەی ناویان رۆشنبیری کوردی تێیکەوتووە، خوێنەری کورد پێویستە واگا بێتەوەو هوشیار بێتەوە و لەژێر کاریگەری ئەو شەڕە دەروونیەدا خۆی رزگار بکات ، چیتر نەبێتە ئامڕازێک بۆ سڕینەوەی خۆی.

پێویستە خوێنەری کوردو رۆشنبیری کورد بەر لەهەموو شتێک خۆی فێری خویندنەوە بکات، بۆئەوەی شتەکان وەک ئەوە ببینیت، کە هەیە نەک وەک ئەوەی خۆی دەیەوێت!.

2019\9\19

## خۆنیشاندانەکانی بەغداو دەرئەنجامەکانی لەسەر هەرێمی کوردستان

ئەو خۆنیشاندانانەی چەند رۆژێکە بەغدای پایتەخت و ژمارەیەک لە شاری تری لە ناوەڕاست و باشووری ئێراق گرتۆتەوە، بەر لەهەموو شتێک دەرئەنجامی ئەو گەندەڵی و پاشاگەردانی و نا دادپەروەرییە، کە لەو ناوچانە دەگوزەرێت، سەرباری ئەو هەڵبژاردنە ساختەو بێهیوایانەی ئەنجام دەدرێت، دەسەڵاتی سیاسی لە بەغدا هیچ رەوایەتیەکی نەماوە، بۆیە هەموو مرۆڤێکی ئازادیخواز پێویستە پاڵپشتی و لایەنگری ئەو خۆنیشاندانانە بکات. بەڵام ئەمە تەنیا دیوێکی مەسەلەکەیە، دیوەکەی تری پەیوەندی بە رەهەندە هەرێمی و جیهانییەکەوە هەیە، کە چۆن ئەو مافە رەوایانانەی خەڵک دەخەنە دوو توێی بەرژەوەندە سیاسی و هاوسەنگیە هەرێمایەتیە ئاڵۆزەکان!.

بێگومان ئەمەش شتێکی ئاساییە، لەبەرئەوەی ئێستا ئێراق وەکو دەسەڵاتی سیاسی و جوگرافی کەوتۆتە ژێر کاریگەری راستەوخۆ و نا راستەوخۆی هێزە هەرێمی و جیهانیەکان، کە هەر لایەنەی دەیەوێت بەرژەوەندیە ستراتیژیەکانی خۆی بپارێزێت. دەرئەنجامی ئەو خۆنیشاندانانە هەرچیەک بێت هیچ لە بایەخی ئەوە ناگۆڕێت، کە سەرەتای قۆناغێکی نوێیە لە ئێراق بە رێوەیە، ئەو سەرەتایە بەرەو دوو ئاڕاستەی پێچەوانەی یەکتر کاردەکات، لە لایەک بۆ نەهێشتنی گەندەڵی دامەزراندنی دەسەڵاتێکی دادپەروەرانەتر، لەلایەکی تر بۆ قووڵکردنەوەی نا

سەقامگیریەکان و بە سوریا کردنی ئێراق هەنگاو دەنێت. بەهۆی بوونی میلیشیاو هێزی چەکداری زۆرو جیاواز، بۆ ماوەیەکی رەنگ بێت زۆر دوور نا، ئەگەری دووەم بەهێزترە، کە بە داخەوە ئەمە دۆخەکە زۆر ئاڵۆزتر دەکات و دواتر دەگاتە ئەو ئامانجانەی خەڵک کاری بۆ دەکات، ئەمەش ماوەیەکی دەوێت و دەوەستێتە ئەو مامەڵە سیاسی و جیۆپۆلەتیکانەی لە پشت پەردەکانەوە لە نێوان هێزە هەرێمی و نێودەوڵەتیەکان ئەنجام دەدرێت. بڵێسەی سەرکەوتنی ئەو خۆنیشاندانانە گومانی تیا نیە بۆ زۆر شوێن دەپەڕێتەوە چوارچێوە جوگرافیەکەی خۆی دەبەزێنێت و رەنگە بێت لە کۆتایدا سیستەمی سیاسی هەموو ناوچەکە بخاتە مەترسیەوەو گۆڕانکاریەکی بنەڕەتی لە فەزای سیاسەتی هەرێمی دروست بکات. بەڵام ئەوەی گومانی تیانیە ئەو بڵێسەیە بەر لە هەموو شوێنێک دەپەڕێتەوە هەرێمی کوردستان!. ئەگەر لەبەغدا دەستکەوتی باش بە دەست بێت!.

راستە دۆخی هەرێمی کوردستان بە بەراورد لەگەڵ پارچەکانی تری ئێراق جۆرە جیاوازیەکی هەیە، بەڵام لە رووی سیاسەوە دەسەڵاتدارانی ئەو هەرێمەش دووچاری هەمان ئەو نەخۆشیانە هاتوون، کە دەسەڵاتدارانی ئێراق تووشی بوون، تووڕەیی و بێزاری خەڵکی کوردستان هەرگیز لە تووڕەیی و بێزاری ناوچەکانی تری ئێراق کەمتر نیە، وەکو ئەوان متمانە بە دەسەڵاتداران و پرۆژەی هەڵبژاردن نەماوە، دوا هەڵبژاردن رێژەی بەشدارینەکردنی خەڵک، کە زۆرینەیەکی رەها بوو ئاماژەیەکی روونە بۆ ئەوەی خەڵک لە کوردستانیش باوەڕی بە خەباتی سیاسی و پەرلەمانی

نەماوە، ئەمە ئەگەری توندو تیژی و ڕووبەڕووبوونەوەی چەکداری زیاتر دەکات لەهەر گۆڕانکاریەک لەهەرێم بێتە ئارا. بە داخەوە زۆر لە خوێندەواران و چاودێرانی کورد پێیان وایە بەهۆی بێهیوابوونی خەڵکی کوردستان، ئەگەری پەڕینەوەی خۆنیشاندانەکان بۆ هەرێم زۆر نیە، بەڵام بە پێچەوانەوە، بێهیوابوونی خەڵک بەهۆی ملکەچ بوونەوە نیە بۆ ئەو دۆخە سیاسی و ئابوورییەی سەپێنراوەتە سەری، بەڵکو تەنیا بێ متمانەییە بەو هێزانەی لەسەر گۆڕەپانی سیاسیدا وەک گەڕۆکێک (مهرج) ێک نواندن دەکەن، نەک بێ متمانە بوون بە زەرورەتی گۆڕانکاری و دامەزراندنی دەسەڵاتێکی تر، کە ڕەنگدانەوەی ویست و خەونەکانی خەڵک بێت. ئەو هێزانەی لە گۆڕەپانەکەدان، هیچ کامێکیان ناتوانێت سەرکردایەتی و پیشەنگی گۆڕانکاریەکی لەو شێوەیە بکات، بەڵام گۆڕانکاریە پۆزەتیڤەکانی ئێراق، ئەگەر لەبەرژەوەندی خەڵک بشکێتەوە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی خەڵک و دروست بوونی سەرکردایەتی مەیدانی نوێ، ئەو کاتە ئەو هێزانەی لە ئارادان، بە هەموو ڕەنگەکانیانەوە دەخرێنە بەردەم دادگای خەڵک و بەرپرسیاریەتی ئەو هەموو تاوان و گەندەڵی و نادادپەروەریەیان دەخرێتە ئەستۆ. دەسەڵاتدارانی کوردی بە تەواوی درکیان بەمە کردووە بۆیە هەر لە ئێستاوە سیناریۆ بۆ کەمکردنەوەو بڕینی هێڵەکانی ئەنتەرنێت و تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان دادەنێن.بەڵام لە کۆتایدا، کە زەنگی حەشرەکە لێیدا هیچ شتێک فریایان ناکەوێت!.

2019\10\5

## تورکیا لەنێوان سەرەڕۆیی و ڕێکەوتندا

## لە پەلاماردانی ڕۆژئاوای کوردستان

تورکیا ماوەیەکە هەڕەشەی پەلاماردانی ڕۆژئاوای کوردستان دەکات، لەم چەند ڕۆژەی دوایی سەرۆکی تورکیا ڕایگەیاند، ئەمڕۆ یا سبەی هێرشەکە ئەنجام دەدەین، سەرباری ئەوەی هێزەکانی سوریای دیموکرات بەگوێرەی ریککەوتنی ئەمریکاو تورکیا دەربارەی ناوچەی ئارام هیزەکانی خۆیان لە هەندێک ناوچە کشاندەوە. ئەمشەو سەرۆکی تورکیا پەیوەندیەکی لەگەڵ سەرۆکی ئەمرکیا ئەنجامداوە، ئێستا هەواڵی ئەوە بڵاوبۆتەوە ئەمریکا لە چەند خاڵێکدا هێزەکانی خۆی لە سەرسنوورەکانی تورکیا لە ڕۆژئاوای کوردستان کشاندۆتەوە، ئەمەش ڕێگا کردنەوەیە بۆ سوپای تورکیا بۆ ئەوەی پەلاماری ڕۆژئاوا بدات، واتە دووبارە بوونەوەی سیناریۆی عەفرین، کاتیک بەر لە ڕۆژێک لە هێرشی سوپای تورکیا رووسەکان هیزەکانی خۆیان کشاندەوە! ئەم دۆخە لە دوو ئەگەر زیاتر هەڵناگرێت، یاخود ڕێککەوتنیک لەنێوان تورکیاو ئەمریکا کراوە و بەرژەوەندیەکانی خۆیان لەسەر حیسایی کورد یەکخستووە، یاخود ئەمریکا دەیەوێت تورکیا بکەوێتە ناو گێژەنی ڕۆژئاوای کوردستانەوە، بە داخەوە بەگوێرەی ئەزموونی ئەمریکا لە ناوچەکە، وەک لە جۆرجیاو چەچان و ئۆکرانیا بینیمان، ئەگەری یەکەم زیاتر بە هەند وەردەگیرێت. لەبەرئەوەی لەم ڕۆژانە لەسەر خاکی سوریا گۆڕانکاری جدی لە هاوسەنگی هیز

بەدیدەکریت. دوای ئەوەی رووسیا یارمەتی رژێمی بەشار ئەسەدی دا بۆ ئەوەی زۆربەی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئەوەی پێی دەگوترا ئۆپۆزسیۆنی سەربازی بگەڕێنیتەوە ژێر دەسەلاتی خۆی، لە ناوچەی ئەدلەب لەسەر داوای روسیا و بۆ لەیەکگەیشتن لەگەڵ تورکیا ماوەیەک هێرشەکانیان راگرت، لە دونێوە هێزە ئاسمانیەکانی روسیا ناوچەی ئەلب بۆردومان دەکەن، ئەمەش جۆرە سازشکردنیک نیشان دەدات لە نێوان تورکیاو روسیا، ئەدلب بەرامبەر رۆژهەڵاتی فورات، کە دەکاتە رۆژئاوای کوردستان. کەواتە لەو هاوکێشەیەدا ئاڵوگۆڕیک بەدیدەکرێت ( ئۆپۆزسیۆنی سوریا بەرامبەر کورد)، ئەمەش زەنگێکی مەترسیدارە بۆ کورد و واتای گەڕانەوەی هاوسەنگی هێزە بۆ دۆخی بەر لە هەڵوەشانەوەی بلۆکی رۆژهەڵات، واتە گۆڕانی هاوسەنگی هێزی جیهانی دەستپێکردنەوەو جێگیربوونەوەی قۆناغێکی تر لە شەڕی سارد!. کە ئەمەش واتای گەڕاندنەوەی سەروەری و یەکێتی خاکی ئەو دەوڵەتانەی کوردستانیان بەسەر دابەشکراوە، کە بەداخەوە وا پێدەچێت دیسان پەردەیەکی رەش بەسەر قۆناغێکی تر لەمێژووی کورددا دابدرێتەوە!.

2019-10-7

## دیسان گەلەکۆمەکیەکی هەرێمیە لەسەر کورد

زۆر لەمێژە ئاماژە بەوە دەکەم، کە دەولە هەرێمیەکان لە بەهێزبوونەوەدان و خەریکی رێکخستنی گەلەکۆمەکیەکن دژی کورد، ئێستا وا پێدەچێت ئێمە لەو قۆناغهدا بژین، کە هەوڵدەدەن پلانەکەنیان جێبەجێ بکەن، وادیارە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیش تێگەیشتنیک بۆ ئەو دۆخە هەرێمیە نوێیە هەبێت، کە دەگوزەرێت، لەپاڵ هەواڵی ئەوەی ئەمڕۆ هیزەکانی ئەمریکا لەسەر سنوورەکانی رۆژئاوا کشانەوەو دەرگایان بۆ هێرشی سوپای تورکیا خستە سەر پشت، ئێستا هەواڵی ئەوەش هەیە هیزەکانی رژیمی سوریا هێزەکانیان ئاڕاستەی شاری مەنبەج کردووەو خۆیان بۆ پەلاماردانی ئەو شارە ئاما دەکەن، ئەگەر ئەوە بچێتە سەر ، واتای ئەوەیە سەرەتای قۆناغێکی ترسناک بۆ کورد لە ئاسۆ بە دیارکەوت، بەدڵنیاییەوە دوای ئەوە نۆرەی هەرێمی کوردستان دێت!.

رەنگ بێت لەسەرەتادا وەک نیشاندانی نیازپاکی و فریودانی کورد لەو بەشە وا نیشان بدەن، کە ئەوانیش بەشێکن لە هاوپەیمانیەتی نیودەوڵەتی و تەنانەت تورکیا بەشداری شەڕێشیان پێبکات دژی هیزەکانی کوردی رۆژئاوا، بە تایبەتی پارتی دیموکراتی کوردستان و ئەنەکەسە، وەلێ لە دواجاردا وەکو یاری دۆمینۆ، ئەوانیش وەک داشێک دەکەونە خوارەوەو دۆخەکە ئەوانیش سەرنگون دەکات، بۆیە یەکرێزی کوردو

بەشدارینەکردن لە هیچ پلانێکی هەرێمی دژی یەکتر، ئەرکێکی بە پەلەو ستراتیژی ئەو قۆناغەیە.

2019\10\7

## تورکیا شەڕی پەیەدە دەکات یا شەڕی سڕینەوەی کورد!؟

## ڕۆژی هێرشکردنی تورکیا بۆ سەر ڕۆژئاوای کوردستان

بەداخەوە ئەو شەڕەی لێی دەترساین و پێشبینیمان بۆ کرد دەستیپێکرد، لەو شەڕەدا ڕێکەوتنێک لە پشت پەردە بەدیدەکرێت لە نێوان زلهێزەکانی جیهان و هێزە هەرێمیە دڕەندەکان. ئەو شەڕەی تورکیا ئێستا دژی کورد دەیکات، جیاوازە لە هەموو شەڕەکانی تری دژ بە کورد لە مێژوودا!. تورکیا شەڕی پاکتاوکردنی ڕەگەزی و سڕینەوەی دیمۆگرافیای کوردستان دەکات، ئەوەی لە هەر پارچەیەکی کوردستان پێی وابێت لەو شەڕەی تورکیا بە دوور دەبێت هەڵەیە، لەبەرئەوەی شەڕەکە شەڕی سڕینەوەو نەهێشتنی ناسنامەی کوردیە. تورکیا بەدرێژایی 534 کم لە سنورەکانی نێوان ڕۆژهەڵات و باکووری کوردستان دیوارێکی کۆنکرێتی دروستکردووە، هاوکات بە درێژایی 711 کم دیوارێکی تری هاوشێوەی لە نێوان ڕۆژئاواو باکوور دروست کردووە، پلانی هەیە هەمان دیوار لە نێوان باکوورو باشووری کوردستان، واتە لەگەڵ هەرێمی کوردستان دروست بکات. هەموو ئامێرێکی ئەلیکترۆنی و چاودێریکردنی سەردەمیانەی تیا داناوە، بۆ چاودێریکردن و لێدانی هەموو بوونەوەرێک لە کوردستان. تورکیا بە تەنیا لە رووی سەربازیەوە نا ، بگرە لەمێژە شەڕی بایۆلۆژی دژی کورد دەستپێکردووە. لە ڕێگای ئەو کەل و پەل و خۆراکەی

دەینێرێتە کوردستان، پڕەنسیپی دۆلار بەرامبەر نەخۆشی لەگەڵ باشووری کوردستان پیادەکات، نەخۆشخانەکانی ئێراق، ئێران، تورکیا، ئوردن، ئەورووپا، هەموو تژە بووە بە نەخۆشی کوردی!. تورکیا شەڕی دەرروونی رۆشنبیری و زانستی و مەعریفی و .... هتد کورد دەکات، کەچی جێگای داخە تاوەکو ئێستا کورد هەیە وا بیردەکاتەوە، کە تورکیا شەڕی پەیەدە دەکات، بەوە تۆمەتباری دەکەن تاکڕەوانە سیاسەت دەکات و رێگا بە پارتەکانی تر نادات لە رۆژئاوا کاربکەن، وەک ئەوەی خۆیان لەوپەڕی دیموکراسیدا دابن و دەرگایان بۆ هەموو هێزو حیزبەکانی تر لە ناوچەکانی خۆیان کردبێتەوە!. لە کاتێکدا ئامادەنین نەک حزب، بەڵکو سەرکردایەتی حیزبەکانیان بازگەکانیان ببڕێت و بێتە ناوشارەکانیانەوە!. ئەو شەڕە شەڕی تورکیاو پەیەدە نیە، ئەو شەڕە شەڕی لەناوبردن گۆڕینی دیموگرافیای کوردستانە، چەند ساڵێک بەر لە ئێستا لەیەکێک لە کۆنفرانسەکان ئاماژەم بەوە کرد، کە ئەمجارەیان کوردستان لەسەر بنەمای جوگرافی نا، بەڵکو لەسەر هەموارکردنەوەو گۆڕینی دیمۆگرافی دابەش دەکرێتەوە. چ شەرمەزاریەکە لەو قۆناغە مێژووییە هەستیاردەکا ئەو شەڕە وەک شەڕی تورک و پارتێک لێکبدەیەوە لە کاتێکدا بۆینباخێکت بەستابێت و چاویلکەیەکی پزیشکیشت لەچاو کردبێت و خۆت بە رۆشنبیرو دەستەبژێری میللەتێک ، یاخود بە حیزبی پێشەنگ و پێشڕەوی کوردستان بزانیت. مەترسیەکە زۆر لەوە گەورەترە کە پێشبینی دەکرێت، واخەریکە جیهان دابەش دەکرێتەوە هەمدیس نەخشەی سیاسی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست

لەسەر هێسک و پرووسکی کورد دەکێشرێتەوە. بۆیە ناکرێت پشتی ڕۆژئاوا بەربدرێت، هەموو جیهان پشتی لە ڕۆژئاوا کردووە، ناکرێت کورد خۆشی پشتی لێبکات، دڕندە چاوسەوزەکانی ئەوروپاو ئەمریکا، خوێن ساردو مافییاکانی روسیا، تالآنچیەکانی ناوچەکە، هەمو پشتیان لە کورد کردووە، کەچی کوردیش خەریکە پشت لەخۆی دەکات، کاتی ئەوە هاتووە هەموو تاکێک هوشیار بێتەوە، تورکیا هیچ حزبێکی کوردی ناناسێت، تورکیا شەڕی کورد دەکات، کەواتە پێویستە تۆش لە دەرەوەی چوارچێوەی بچووکی حیزب بیربکەیتەوەو بەرگری نەک لە ڕۆژئاوا، بەڵکو لە بوونی خۆت بکەی، چونکە درەنگ بێت یا زوو جەندرمەکانی تورک بەر دەرگای ماڵت لێدەگرن.

2019\10\9

## بانگەوازێک لە ژمارەیەک مامۆستایانی زانکۆی سەلاحەدین

## بۆ رای گشتی کوردستان:

دەبێت پشتگیری لە بەرخودانی رۆژئاوا بکرێت

جێگای داخە دەوڵەتی تورکیا جارێکی تر، بە پێچەوانەی هەموو عورف و یاسایەکی نیودەوڵەتی، لەبەر زەقەی چاوانی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی پەلاماری رۆژئاوای کوردستانی دایەوە. هەزاران چەتەو حۆفرۆشی بە ناو سوپای سوریای کۆیلە، سنووری رۆژئاوای کوردستانیان بەزاندووە شەڕی سڕینەوەو جینۆسایدی کورد دەکەن. دیارە تورکیا مەبەستی گۆڕینی دیمۆگرافیای ناوچەکەو لێدانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردە لەو پارچەیە، ئەوەی جێگای نیگەرانی ئێمە، هەست بە جۆرە رێککەوتنێک دەکەین لە نێوان زلهیزەکانی دنیا بۆ دووبارە بە قوربانیکردنەوەی کوردو چارەسەرکردنی کێشەکان لەسەر حیسابی چارەنووسی گەلی کوردستان. ئێمە وەک ژمارەیەک لە مامۆستایانی زانکۆی سەلاحەدین، پاڵپشتی خۆمان بۆ گەلی خۆمان لە رۆژئاوای کوردستان دەردەبڕین و دژی ئەو هێرشە هۆڤیانە دەوەستینەوە بۆ سەر گوندە ئارامەکانی رۆژئاوای کوردستان، بەر لە هەموو کەسێک داوا لە گەلی خۆمان دەکەین، یەک رێزو یەک دەنگ بە رووی ئەو دەستدرێژیانەی سوپای تورکیای رەگەز پەرست بۆ سەر گەلەکەمان لە رۆژئاوا بووستنەوە،

بە شێوەیەکی تایبەت داوا لە مامۆستا ئاینیە نیشتمان پەروەرەکان دەکەین، لەو قۆناغە هەستیارەدا رۆڵی خۆیان ببینن، لەسەر داوای وەزارەتی ئەوقافی تورکیا زیاتر لە نەوەد هەزارمزگەوتی ئەو وڵاتە بانگی غەزایان دژی میللەتیکی زۆرینە موسڵمان و بێوەی و بێ زیان داوەو داوای رەشەکوژی و قڕکردنیان دەکەن، کاتی ئەوە هاتووە پێنوسی مامۆستایان مینبەری مزگەوتەکانی کوردستان رۆڵی خۆیان لە بەرگریکردن لە میللەتەکەیان ببیین، کاتی ئەوە هاتووە دەنگی ئێوەش بچێتە پاڵ دەنگی بەش مەینەکانی میللەتەکەتان. هەروەها لە هەموو تاکێکی کورد، لە هەموو ئازادیخوازێک دەکەین لە هەموو دنیا، پشتگیری ئەو خەڵکە ستەمدیدەو ئەو گەنجە بوێرو قارەمان و گیان لەسەردەستانەی رۆژئاوا بکەن، کە بە رگری لە کوردو تەواوی مرۆڤایەتی دەکەن، ئەوانە لەو قۆناغەدا سیمبۆلی بزووتنەوەی رزگاریخوازو بەرگریکاری راستەقینەن نەک بە تەنیا لە کورد بەڵکو لەهەموو مرۆڤایەتی و گەلانی ئازادیخواز. داوا لە حیزب و هێزو لایەنەکانی هەموو بەشەکانی کوردستان دەکەین چوارچیوەی تەسکی حیزبایەتی تێکبشکێنن و هەموو بەیەکەوە دەست لە ناو دەست پشتگیری ئەزموونی رۆژئاوا بکەن و خۆیان بۆ هەر رووبەرووبوونەوەیەک ئامادە بکەن، چونکە ئاشکرایە، کە پلانەکانی تورکیا و هاوپەیمانەکانی لە پشت پەردەدا لە رۆژئاوای کوردستان فراوانترو گەورەترە، داوایان لێدەکەین ئەندام و لایەنگرەکانیان ئاگاداربکەنەوە، کە لەچوارچێوەی یەکرێزی و یەکگرتندا کاربکەن، با هەموومان بەیەکەوە پشتگیری براکانمان

لە رۆژئاوا بکەین و خۆمان بۆ قۆناغیکی نویٚ ئامادە بکەین. کاتی ئەوە هاتووە پشت بە خۆمان ببەستین و تواناکانمان بخەینە خزمەت بەرژەوەندی ستراتیژیەتەکانی میللەتەکەمان.

سەرکەوتن بۆ شۆڕشی رۆژئاوا. سەرکەوتن بۆ گەلانی ئازادیخواز

2019\10\11

ناوی مامۆستایان(تکایە دەرگا کراوەیە بۆ ئەو مامۆستا بەڕێزانەی دەیانەوێت ناویان بخرێتە پاڵ ئەم بانگەوازە)

1- د.کامەران مەنتک
2- د. عوسمان سەلیم
3- د.کامەران کیانی
4- د.رفیق شوانی
5- د. تالیب محەمەد ئەحمەد. کۆلیژی زمان
6- د. هوشیار علی. کۆلیژی پەروەردە
7- د.مەریوان ئەکرەم. کۆلیژی زانست
8- د.کریم جلال. کۆلیژی زانست.کۆیە
9- م.کریم عالی . کۆلیژی زانست
10- م. ئاڵا رفیق. کۆلیژی زانستە سیاسیەکان
11- د.کەریم خۆشناو. کۆلیژی زانست.
12- د.هاشم یاسین. کۆلیژی ئاداب.
13- د. ئەحمەد محەمەد سابیر. کۆلێژی زانست

14- د.دلشاد سالح. كۆلیژی زانست

15- د.فؤاد عوسمان . كۆلیژی زانست

16- د.كەوسەر ئەحمەد. كۆلیژی یاسا

17- م. نەجات زائد. كۆلیژی زانست

18- م. سیف الدین خدر. كۆلیژی زانست.كۆیە

19- م.وریا محمد ابراهیم. كۆلیژی زانست

20- م. هونەر یاسین. كۆلیژی زانست

21- م. رابەر جلال. كۆلیژی زانست.كۆیە

22- م.پشتیوان عادل. كۆلیژی زانست

23- م. پێشەوا شەفیق. كۆلیژی زانست

24- رۆستەم كریم. كۆلیژی زانست

**تێبینی: دەقی ئەو بانگەوازە لەلایەن نوسەری ئەم وتارانە نوسراوە**

## مەهزەلەی بژاردەکانی سەرۆکی ئەمریکا

سەرۆکی ئەمریکا (دۆناڵد ترامپ) بە لێدوانەکانی دەیەوێت راستیەکان بشارێتەوەو هەر دەمەی سیناریۆیەک پێشکەش دەکات، شرۆڤەوانان ئەو هەڵوێستە والێکدەدەنەوە، کەوا بەمەبەستی شاردنەوەی سیاسەت و ستراتیژیەتی ئەمریکاو نەیارەکانیەتی!. بەڵام چاودێریکردنی رووداوەکان، رووی راستەقینەی سیاسەتی ئەمریکا بە ئاسانی دئاشکرا دەکاو ئەو سیناریۆ گاڵتە ئامێزو قێزەونانە بە دیاردەخات!. لە دوا لێدوانیدا سەرۆکی ئەمریکا سێ رێگا چارەی بۆ هێرشەکەی رۆژئاوا خستە روو

1- ناردنی هەزاران سەربازی ئەمریکا بۆ ئەو ناوچەیە

2- سەپاندنی سزای ئابووری و تێکشکاندنی ئابووری تورکیا

3- نێوەندگیری لە نێوان کوردو تورکیا

لایەنی پۆزەتیڤ لەو لیدوانە بۆ کورد ئەوەبوو، کوردی وەک هاوشانێک بۆ تورکیا هەژمار دەکرد، ئەمەش لە رووی دیپلۆماسیەوە داننانە بەکورد وەک یەکەیەکی سیاسی سەربەخۆ، بەلام بەگوێرەی رێگاچارەکان، ترامپ، هەر لەهەمان لێدواندا رێگا چارەی یەکەم، هەناردنی سەرباز بۆ ئەو ناوچەیەی پووچەڵ کردەوە، لەبەرەئەوەی وەک خۆی گوتی گەلی ئەمریکا نایەوێت سوپا بنێریتە دەرەوە!. دەربارەی رێگا چارەی دووەم، سەپاندنی سزای ئابووری، ئیمە بینیمان لە ئەنجومەنی ئاسایشی نیودەوڵەتی ئەمرکیا ڤیتۆی بەکارهینا بۆ ئیدانەکردن و سەرکۆنەکردنی هێرشەکەی تورکیا!،

واتە سیاسەتی راستەقینەی ئەمریکا دژی ئەوەیە تەنانەت سەرکۆنەی ئەو کارە دڕندانەی تورکیا بکرێت!. دەمێنیتەوە رێگا چارەی سێیەم، ئەم ریگا چارەیە بە روونی ئەوە دەردەخات، کە رێکەوتنێک هەیە لە نێوان ئەمریکاو تورکیا بۆ ئەوەی ناوچەی ئارام بە گوێرەی خواستەکانی تورکیا فراوان بکرێت و ئەو کۆچبەرانەی ئەردۆگان هەمیشە هەڕەشەیان پێ لە ئەوروپا دەکات، لەو ناوچەیە جێگیر بکەن. ئەمەش ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی رەنگ بێت دەوڵەتانی ئەوروپیش لەو گەمە قێزەونە تێوە گلابن. کەواتە کورد لە رۆژئاوا بۆتە بەشێک لە سازشکردنی کورد و خاکی کوردستان بەرامبەر کۆچبەرەکان. رێگا چارەی سێیەم، کە باس لە ناوەندگیری دەکات، لەکاتیکدا هەزاران سەربازانی تورک و چەتەکانی بەناو ئۆپۆزسیۆنی چەکداری سوریا پەلاماری رۆژئاوا دەدەن، واتای ئەوەیە ریگا بە تورکیا دراوە ئامانجەکانی خۆی بپێکێت، دوای ئەوە هەوڵدەدەن دانوستان لەنێوان کوردو تورکیا ئەنجام بدەن، واتە دوای ئەوەی پلانەکانی خۆیان جێبەجێکرد. شایەنی باسی هەر لەو سەرو بەندەدا بەرپرسە گەورەکانی ئەمریکا باس لەوە دەکەن، کەوا پاکتاوکردنی رەگەزی بەرانبەر بە کورد هێڵی سوورە، بە داخەوە ئەمەش ئاماژەیەکی ترسناکەو دەرگا کردنەوەیە بۆ تورک بۆ ئەوەی ئەو پاکتاوە ئەنجام بدات!. چونکە لە دوای ساڵی (2000) هێڵی سوور لە سیاسەتی ئەمریکا نەبووە، یاخود روون نەبووە، لە جۆرجیا، لە ئۆکرانیا، بینیمان چۆن رووسەکان دۆستەکانی ئەمریکایان سەرکوت کرد و تێکشکاند، ئەمریکا دەنگی لێوە نەهات!. ئەو لێدوانانە

بەشی زۆری دەکەوێتە چوارچێوەی فریودانی رای گشتی ناوەخۆی ئەمریکاو جیهان، هاوکات بەشێکە لە پڕۆسەی بانگەشەکردنی هەڵبژاردنەکانی ئایندەی سەرۆکایەتی ئەمریکا

2019\10\11

## ئاگاداریەک بۆ میدیاکاران و تاک بە تاکی گەلی کورد

تکایە کەس ڤیدیۆی کوشتن و تیرۆرکردنی شەرڤانە قارەمانەکان لە لایەن چەتەکانی تورک و هاوپەیمانە داعشیەکەیان بڵاو نەکاتەوە، بە بڵاوکردنەوەی ئەو ڤیدیۆیانە بە بێئەوەی بزانی بەشداری لە شەڕێکی دەروونی دەکەی دژی میللەتەکەی خۆت، رۆژانە بەرخودان و خۆڕاگریەکی قارەمانانە ئەنجام دەدرێت، پێویستە بەرگریە قارەمانەکان و تێکشکاندنی دوژمنان بڵاو بکرێتەوە، بڵاوکردنەوەی ئەو جۆرە گرتە ڤیدیۆییانە جگە لە خزمەت کردن بە دوژمنان هیچی تر ناگەیەنێت، بۆیە تکام وایە با لە هەستیاری ئەم قۆناغە تێبگەین، ئەوان دەیانەوێت لە رێگای ئەو دیمەنە تۆقێنەرو تیرۆریستیانە ئیرادەی خەڵکی کوردستان تیکبشکێنن، با ئەوەیان بۆ نەچێتە سەر، چونکە ئەو ئیرادەیەی ئێستا رووبەروویان بۆتەوە، ئیرادەیەکی پۆلاینەو بەو فاشیست و خوێنرێژانە هەرگیزاو هەرگیز تێکناشکێت. ئەم کارە لە پێناو خۆت، لە پیناو گەلەکەت، لە پێناو دوا رۆژێکی پرشنگدارتر ئەنجام بدە.

2019\10\13

## پێویستە بە هێمنی بیربکەینەوەو سیاسەت بکەین

## لە جیاتی چاوەروانی شکست پێویستە بیر لە سەرکەوتن بکەینەوە

سیاسەتمەداری ژیر ئەوەیە لە تەنگانەترین چرکە ساتدا بە هێمنی بیر بکاتەوەو رووداوەکان وەک ئەوە ببینێت، کە هەیە نەک وەک ئەوەی دوژمنەکانی بۆی دروست دەکەن و ناچاری دەکەن بە ئاڕاستەیەکی دیاریکراو شتەکان ببینێت بیریان لێبکاتەوە!. کەس نیە نەزانێت رۆژئاوای کوردستان بە تایبەتی و کوردستان بە گشتی لە دۆخێکی چەند ئاڵۆزدا دەژی، بەڵام دەبێت ئەو دۆخەمان لا ئاسایی و چاوەڕوان کراو بێت، تەنانەت دەبێت چاوەڕوانی ئەو دۆخە بکەین، باشووری کوردستانیش بگرێتەوە!. ئەوەی گرنگە ئەوەیە ئیمە چۆن دەتوانین ئەو شتانە بپارێزین، کە لەو قۆناغەدا توانای پاراستیان هەیەو ماوە!.

بەر لەوەی تورکیا هێرشەکانی دەست پێبکات بەناوی رێکەوتنی ئەمریکاو تورکیا لەسەر ناوچەی ئارام، هێزەکانی سوریای دیموکرات هەموو ئەو سەنگەرانەیان تێکداو وێرانکرد، کە کارێکی زۆریان بۆ کردبوو، ئەمەش دەرئەنجامی ساویلکەیی و متمانە بوو بە هێزەکانی ئەمریکا، کە لەراستیدا ئەو متمانەیە لە سیاسەتدا نیە!. ئەوەی جێگای سەرنجە خەریکە هەمان هەڵەی سیاسی لەگەڵ روسیاو رژیمی سووریاش دووبارە دەبێتەوە، دەرگای ناوچەکانی تری رۆژئاوای کوردستان بە ئاسانی بەرووی

رژێمی سوریا کراوەتەوە، بە بێئەوەی لەسەر ئاستی سیاسی ڕێککەوتنێکیکش کرابێت!. وەک راگەیاندنەکان باسی دەکەن،

دوای چوار رۆژی تر دانوستانی سیاسی لەگەڵ رژێم لەسەر شیوازی ئیدارەدان مافەکانی کورد لەو ناوچەیە دەستپێدەکەن، کە ئەمەش کارەساتیکی گەورەیە، چونکە رژێمی سوریا لە هەستیارترین کاتەکانیدا ئامادە نەبووە دان بە سادەترین مافەکانی کورد دابنێت!. لە راستیدا ئەوەی دەگوزەرێت، رێکەوتنێکی هەرێمیە، کە تورکیاو سوریا و ئێران و ئێراق بە سەرپەرشتی روسیاو ئەمریکاو چین کاری لەسەر دەکەن، لە رێگای فشارەکانی تورکیا کورد ناچار دەکەن خۆی بخاتە باوەشی رژێم، کە ئەمە پلانی رووسیایەو بە ئاشکرا باسیان لێوە کردووە، لە دواجاردا سوپاکانی رژێمی سوریا دەگەڕیتەوە سەر سنوورەکان و هێزەکانی کوردی ئابڵووقە دەدرێن و ئەو کاتە زۆر بەتوندی مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت!. ئەمەش ئەو مەبەستەیە تورکیا کاری بۆ دەکات، دیارە زەمانەتی روسیا هیچ رۆڵێکی کاریگەری نابێت، چونکە روسیا ، کە خاوەنی پرۆژەی ئۆراسیایە لە ناوچەکە جگە لە چەند مافێکی کەمی رۆشنبیری هیچی تری بۆ کورد پێ نییە.

بۆیە ئەوەی ئێستا دەگوزەرێت سەرکەوتنی ئەو پلانەیە. بێگومان دوای تەواو بوونی رۆژئاوا دۆخەکە دەگوازرێتەوە بۆ باشووری کوردستان، زۆر دۆسیەی هەستیار هەیە، کە بە ئاسانی دەتوانرێت لە لایەن ئێراقەوە بووروژێنرێت بۆ ئەوەی قەیرانێک دروست بکەن تاوەکو سوپای ئێراق

بگەڕێتەوە سەر سنوورەکان، بەمەش ئەو دۆخەی لەگەڵ هاتنی سیستەمی تاک جەمسەری هاتبووە ئارا نامێنێت، لەبەر ئەوەی سیستەمی تاک جەمسەری خۆی نەماو ئەمریکا وا لە ناوچەکە پاشەکشە دەکات، ئەمەش واتای گۆرانی هاوسەنگی هیزە. ئەمریکا لە دۆخێک دەژی، کە یەکێتی سۆڤیەت لە کۆتاییەکانی تەمەنی تیایدا دەژیاو دواتر هەڵوەشایەوە. کورد تەنیا یەک چارەی لەبەر دەمە هەوڵبدات بە یەکگرتوویی قەیرانەکە بە شێوەیەک گەورە بکات، کە هەموو ناوچەکە بگرێتەوە.

دیارە ئەمەش بەیەکگرتوویی دەکرێت و دەبێت خەڵکی کوردستان لە ئاستی ئەو قۆناغەدا بێت، گومانی تیا نیە حزبەکانی باشوور نەک لەو ئاستەدا نین بگرە خۆیان بووینەتە داردەستی دوژمنان، پێویستە رۆشنبیرو گەلی کوردستان خۆیان بێنە پێشەوەو گیانی بەرەنگاربوونەوە جۆش بدەن و لە هەموو پارچەکانی تر چی لە دەست دێت بۆ یارمەتیدانی رۆژئاو بکرێت، دیارە خۆپیشاندان و ناڕەزایەتی بە تەنیا بەس نیە، بەڵکو پێویستە بە چەک و پارەو چەکدارو خوێن یارمەتیان بدرێت، رەنگ بێت هەندێک وا بیر بکەنەوە بە رێککەوتن لەگەڵ رژێمی سوریا مەسەلەکە بە کۆتا هاتووە، بەڵام لە راستیدا مەسەلەکە تەنیا چۆتە قۆناغێکی نوێوەو بەکۆتا نەهاتووە، لەو رۆژانەی دادێت کێشەکان روونتر بەدیار دەکەون، پێویستە دەرگای سمێڵکا بەرووی خەڵک گواستنەوەی یارمەتیەکان بکرێتەوە، ئەو دەرگا داخستنە خزمەتی هیچ لایەنێک ناکات بە پارتیشەوە، لەبەرئەوەی دەبێت ئەویش چاوەڕوانی ئەوە بکات، کە نۆرەی ئەویش نزیک

بۆتەوەو لە لایەن تورکیاو ئێراقەوە ئێخەی دەگیرێت و هەرێمی کوردستان دەدرێتەوە دەست بەغدا.

2019\10\14

## تێکشکانی هێزی نەرمی ئەمریکا

هەموو زلهیزیک دوو جۆر هێزی هەیە لە ململانێکانیدا بەکاریدەهێنێت، هێزی نەرم، کە ئەو پرەنسیپ و بیروباوەڕانەیە بەرزی دەکاتەوەو وەک ئامرازێکی گرنگ لەشەڕدا بەکاریدەهێنێت، لەگەڵ هێزی رەق، کە ئەو سوپاو چەک و تەقەمەنیانە دەگرێتەوە، کە لەبەردەستیدایە. زۆرجار بەرلەوەی هێزە رەقەکان رووبەرووی یەکتر ببنەوە، هێزی نەرم بەرەی دوژمنەکەی داگیرکردووە!. ناپیلۆن بەر لەوەی بگاتە ئەوروپا، پرەنسیپەکانی شۆرشی فەرەنسی (دادپەروەری و برایەتی و یەکسانی) کۆمەڵگای ئەوروپی تەنیبوو، بۆیە هێزە رەقەکەی ناپلیۆن، واتە سوپاکەی بە ئاسانی توانی ئەو وڵاتانە داگیر بکات، کە نەک رووبەرووی نەبوونەوە، بگرە پێشوازیشیان کرد!. پاشان بەهۆی نەگونجانی هێزی نەرم و رەقی ناپیلۆن، واتە ئەو کارانەی ئەنجامیان دەدا لەگەڵ ئەو پرەنسیپانەی بەرزیان کردبووە، ئەو کەسانەی پێشوازیان لە سوپاکەی ناپلیۆن کرد، هەر خۆیان لێی هەڵسانەوەو دەریانکرد!.

ئەمریکا کاتێک هاتە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، دوای لێدانی ئێراق، کۆمەڵێک پرەنسیپی سەرنج راکێشی بەرزکردبوەوە وەک ئازادی و مافی مرۆڤ و دادپەروەری کۆمەڵایەتی و ... هتد، ئەگەرچی مێژووی ئەمریکا وایکرد، زۆر لە خەلکی هوشیار باوەڕ بەم دروشمانەی ئەمریکا نەکات،

وەلێ لەگەڵ ئەمەشدا کاریگەری گەورەی خۆی لەسەر کۆمەڵگاکان هەبوو.

لە ماوەی بیست و هەشت ساڵی رابردوو بەردەوام هاوسەنگی نێوان هێزی نەرم (سۆفت پاوەرو) و هێزی رەقی (هارد پاوەر) ی ئەمریکی لە لەنگیدا دابووە، واتە رۆژ بە رۆژ باوەڕکردن بە ئەمریکا لاوازتر بووە. دەتوانین هەڵوێستی ئەمریکا بەرامبەر رۆژئاوای کوردستان وەک خاڵی ترۆپک و کۆتایی سۆفت پاوەری ئەمریکی هەژمار بکەین، دەسەڵاتی ئەمریکی نەک لە جیهان، بگرە لە ناوەخۆی ئەمریکاش متمانەی لە دەستدا، کە ئەمە خاڵی دەستپێکی کشانەوەو بە کۆتاهاتنی راستەقینەی ئەمریکایە وەک تاکە هیزێکی جیهانی، چونکە لە رووی هێزی رەقەوە ئەمریکا دوای ساڵی (2000) وردە وردە لە کشانە دواوە دایە!. لەدەستدانی سۆفت پاوەر کاریگەریەکی ترسناکی لەسەر چارەنووسی هێزەکان هەیە، چونکە بنەمای دروست بوون و بەهێزبوونی هەموو هێزەکانی ترە. ئەوەی تا ئێستا توانیویەتی لەم بوارەدا یارمەتیەکی سۆفت پاوەری ئەمریکی بدات بۆ ئەوەی خۆی بگرێت، ئەوەیە هێزە رکابەرەکانی وەک روسیا و چین سۆفت پاوەریان زۆر لاوازەو هیچ ئەلتەرناتیڤێکی نوێیان بۆ کۆمەڵگای مرۆڤایەتی پێ نیە، بەڵکو کار لەسەر هەمان ئەو دروشمانە دەکەن، کە لە قۆناغی شەری ساردا کاریان پێدەکرد!.

ئەمریکا دوای ئەو هەنگاوەی بەرامبەر کورد لە رۆژئاوای کوردستان، هەر هەڵوێستێکی تر بنوێنێت، تازە سۆفت پاوەرەکەی لەکەدار بووە، وەک هەندێک خەڵک بە سادەیی دەڵێن ئەخلاقی ئەمریکا لەکەدار

بوو، که زۆر ئاستەنگە جارێکی تر کاریگەر بکرێتەوە. ڕاستە لای ریالیستە نوێیەکان لە سیاسەتدا مەسەلەی ئەخلاق هیچ شوێنێک ناگرێت، بەڵام ئەمە هەرگیز لە بەهای ئەوە کەم ناکاتەوە، کە ئەخلاق وەک فاکتەرێکی گرنگ، بە تایبەتیش لە دۆخە بەرچاو و هەستیارەکاندا ڕۆڵێکی گرنگ لە پێکهاتەی هێزی نەرمدا دەگێڕێت، بۆیە کشانەوەی ئەمریکا لە ڕۆژئاوای کوردستان، بە تەنیای کشانەوەی سوپاو چەک و تەقەمەنیەکانی ئەمریکا نیە، بەڵکو کشانەوەو گەڕانە دواوەی بەهاکانی ئەمریکی و سۆفت پاوەری ئەمریکایە.

2019\10\16

## دۆخی ڕۆژئاواو کورد بەگشتی لەوە مەترسیدارترە وەک تێیدەگەین...!

کورد کەوتۆتە ناو گەلە کۆمەیەکی هەرێمی و روسیا سەرپەرشتی دەکات، ئامانجی یەکەمی روسیا تێکشکاندنی ئەمریکاو گۆڕینی سیستەمی جیهانیە، واتە هێنانە کایەی سیستەمێک روسیا وەک سۆڤیەتی پێشوو رۆڵ و پێگەی دیاری خۆی هەبێت. لە ساڵی (2014)، لە رێگای ئۆکرانیا دەروازەی ئەوروپا بەرووی روسیا داخراو خەونی بوون بە ئیمپراتۆریایەکی ئۆراسی لا ئێجگار لاواز کرا، بۆیە هەموو سەنگی خۆی بۆ باشوورو رۆژهەڵاتی ناوەڕاست هێنا، لە ساڵی (2015) راستەوخۆو لە رێگای سەربازیەوە خۆی لە شەڕی سوریا هەڵقورتاند، هاوکات کاری کرد لەسەر دروستکردن و بەهێزکردنی هاوپەیمانیەتێکی هەرێمی لە نێوان روسیاو تورکیاو ئێران، کە هەستیارترین و ستراتیژیترین پێگەی جیۆپۆلەتیکی لە ئۆراسیا داگیر دەکەن. وەک لە وتارەکانی پێشووتردا ئاماژەم پێکردبوو، روسیا لە رێگای تورکیاوە دەیەوێت فشار بخاتە سەر کورد بۆ ئەوەی لە ئەمریکا دوور بکەوێتەوە، بڕیاری ئەم دواییەی ترامپ بە کشاندنەوەی هێزەکانی ئەمریکا لە سوریا، ئەو خەونەی روسیای هێنایەدی. هەڵکردنی گڵۆپی سەوز لەلایەن ئەمریکاو روسیا بۆ پەلاماردانی کورد لە رۆژئاوای کوردستان، دوو ستراتیژیەتی جیاواز نیشان دەدات، بەگوێرەی ئەمریکا دەیەوێت تورکیا لە روسیا دووربخاتەوە لەسەر حیسابی کورد، بۆ

روسیاش کورد لە ئەمریکا دووربخاتەوە و بیخاتەوە ناو بەرەی ڕۆژهەڵاتی!.
کەواتە هەردوو سیناریۆکە لە بەرژەوەندی کورد نیە. کورد ناچار بوو بچێتە ژێر چەتری روسیاو لە پێناو مانەوەدا ڕێکەوتن لەگەڵ ڕژێمی سوریا ئەنجامبدات. ئاماژەکان وا پێدەچن بۆ بڕینی دەستی ئەمریکا روسیا هەوڵدەدات ڕێکەوتنامەی ئەمنی لە نێوان تورکیاو سوریا بەهێز بکات، بۆ ئەوەی هەموو کەلێنێکی نێوان هاوپەیمانیەتی سێلایەنە (روسیا-تورکیا-ئێران) لە هەژموونی ئەمریکاو لایەنگرانی ئەمریکا پاک بکاتەوە!. یەکێک لە ئەگەرەکانی ئەو دەرهاویشتە ترسناکە ئەوەیە، ڕژێمی سوریا نەک ڕێکەوتنامەکە جێبەجێ نەکات، بگرە بە هاوپەیمانی تورکیا لەو ناوچانەی بە ڕێکەوتن لەگەڵ هەسەدە هاتۆتە ناوی، بکەوێتە شەڕی هەسەدە!!!.
بەمەش کورد دەکەوێتە ناوبەرداشی سوریاو تورکیا، بەمەبەستی لێدانی کورد نەهێشتنی هیچ جوڵانەوەیەک لەو ناوچەیە. لەو حالەتەدا تاکە ڕێگایەک بۆ ئەمریکا بمێنێتەوە، بەیەکەوە لکاندنی ڕۆژئاواو باشووری کوردستانە، بۆئەوەی ئەو پلانەی مۆسکۆ سەرنەگرێت و قووڵایی ستراتیژی ڕۆژئاوا بە باشوور ببەسترێتەوە، بەمەش دەتوانرێت لە لایەک ڕۆژئاوا بپارێزرێت، لە لایەکی تر باشووری کوردستان لە ژێر هەژموونی تورکیا ڕزگار دەکرێت!. لە هەموو حالەتەکاندا ئێمە چرکە بە چرکە لە مەترسیەکانی گەلەکۆمەی تورکیاو سوریا بەسەر ڕۆژئاوای کوردستان نزیک دەبینەوە، هەڵوێستی نێگەتیڤانەی تورکیا بەرامبەر پەیامەکانی ئەمریکا، چەندەی تورکیا ڕووبەڕووی سزای ئابووری دەکاتەوە لە لایەن ئەمریکاو

ئەوروپا، هێندەش زیاتر رووبەڕووبەنەوەکان نێوان کوردو تورکیا، واتە روسیاو هاوپەیمانەکانی چڕتر دەکاتەوە، ئەمە ئەو ئەگەرەیە، کە پێویستە کورد بە باشی خۆی بۆ ئامادە بکات. شەڕی ئەم جارەی کورد شەڕی مان و نەمانە و لە هەموو شەڕو ململانێکانی پێشووتر جیاوازتر دەبێت.

2019\10\17

## ڕێکەوتنی ئەمریکی – تورکی  لە نێوان گۆڕانی جیۆپەلەتیک و ڕای گشتی جیهانیدا

گۆڕانی هاوسەنگی هێز، گۆڕانی جیۆپۆلەتیکی گەورەی لەگەڵ خۆیدا هێناوەتە ئاراو ئەو گۆڕانە جیۆپۆلەتیکیە لە بەرژەوەندی مەسەلەی کورد لە هەموو بەشەکانی کوردستاندا نیە و خەریکە وەکو قۆناغی شەڕی سارد هەمدیس کوردستان دەکاتەوە ناوچەیەکی تامپۆنی داخراو!. بۆیە دەبینین ئەوەی لە ڕۆژئاوای کوردستان دەگوزەرێت و ئەو ڕێکەوتنانەی لە نێوان تورکیا ئەمریکا دەربارەی ڕۆژئاوای کوردستان و کۆمەڵێک بابەتی تر پەیوەست بە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئەنجامدراوە و ئەنجام دەدرێت، دەرئەنجامی ئەو پارادۆکسەیە، کە لەنێوان گۆڕانی جیۆپۆلەتیک و گەشەسەندنی ڕای گشتی جیهانی، وەک دەرهاویشتەی شۆڕشی گەیاندن هاتۆتە دی.

لە ڕاستیدا ڕووی ڕاستەقینەی سیاسەتی جیهانی لەسەر بنەمای جیۆپۆلەتیکە، ئەمریکا، ڕوسیا، هەموو زلهێزەکان لەسەر ئەو بنەمایە هاوپەیمانیەتیەکان دەبەستن و هاوسەنگی هێزەکان دەگۆڕن، هەرچەندە هەمیشە کار بۆ ئەوە دەکەن ئەو ڕاستەقینە بشارنەوەو دیزە بە دەرخۆنەی بکەن!. ڕێکەوتنی ئەمریکاو تورکیاش هەر لەسەر ئەو بنەمایەو دەهاویشتەی بە تامپۆنی بوونی پێگەی کوردستانە، بە هۆی بووژانەوەی

روسیاو چین و هاوپەیمانە هەرێمایەیەتیەکانیان. سەرۆکی ئەمریکاش هەر لەسەر ئەو بنەمایە ویستی لەسەر حیسابی مەسەلەی کورد تورکیا بۆخۆی رابکێشێت و لە روسیای دووربخاتەوە، لەبەرئەوەی سێکوچکەی رووسی – ئێرانی – تورکی، دڵی ئۆراسیای داگیرکردووەو خەریکە ئەمریکا توورهەڵدەداتەوە ئەوبەری ئۆقیانووسی ئەتڵەسی!. ئەوەی کێشەی بۆ سیاسەتی سەرۆکی ئەمریکا دروست کرد و دروست دەکات، کە گومانی تیانیە کورسیەکەی لە ژێر ترامپ دەردەهێنێت و رێگا نادات بۆ جارێکی تر هەڵبژێردرێتەوە، رای گشتی ئەمریکی بە پلەی یەکەم و رای گشتی جیهانیە بە شێوەیەکی گشتی، کە بینیمان دوای بڕیاری کشانەوەی ئەمریکا لە سوریا، چۆن جوڵاو لەسەر هەموو ئاستێکدا کاریگەری خۆی کردو بە ناچاری تورکیا ئەندانی ناتۆو هاوپەیمانی ئەمریکای خستە بەر چەقۆی سزاکانی ئەمریکا، کە بۆیەکەم جارە لە قۆناغی شۆڕشی گەیاندن رای گشتی ئەمریکی و جیهانی بەرامبەر مەسەلەیەک وا یەککگرتوو بێت و بەرگری لە پڕەنسیپە ئەخلاقیەکان بکات، کە ئەو پڕەنسیپانە هەرگیز لەهەگبەی ریالیستە نوێیەکانی ئەمریکا دا نیە. بۆیە سەرۆکی ئەمریکا بۆ فریودانی رای گشتی ئەمریکا، لە 17\10\ 2019، واتە دوێنێ ئێوارە رێکەوتنێکی لەگەڵ تورکیا ئیمزا کرد، کەهەرچەندە بانگەشەی وەستاندنی هێرشی تورکیای بۆ کرا، بەڵام نەشەڕ وەستاوەو نە ئاگربەستیش تا ئێستا سەری گرتووە، دوای تێپەڕبوونی نزیکەی رۆژێک بەسەر ئەو رێکەوتنە بۆ

وەستاندنی شەڕ، تازە کۆشکی سپی دەڵێت شەڕ بە ئاسانی ناوەستێنرێت!.

ئەمە وا دەکات ئەو گریمانەیە زۆر بەهێزتر بێت، کە فاکتەری سەرەکی لەو ڕێکەوتنەی ترامپ — ئەردۆگان ڕزگارکردنی تورکیا بێت لە تووڕەیی رای گشتی ئەمریکی و هەنگاوە بوێرەکانی کۆنگرێس، واتە تورکیای لە چوونە ناو قۆناغێکی نوێوە ڕزگارکرد. کە فرێ دەدرایە دەرەوەی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی، بە تایبەتیش کۆمەڵگای رۆژئاوایی و لە رووی ئابووریشەوە زیانێکی زۆر پێدەگەیاند!. لە هەمان کاتدا دەرفەتێکیشی بۆ هێزەکانی سوریای دیموکرات خۆشکرد، بۆ ئەوەی هێزەکانی خۆیان کۆبکەنەوەو بریندارەکانیان بنێرنە دەرەوەی بەرەی شەڕ بۆ ئەوەی چارەسەری وەربگرن!. ئەگەر ئەگەری وەستاندنی ئەو شەڕە لە ئارادا بێت. هاوکات ئەو ڕێکەوتنامە ، بێگومان ئەوەی بڵاوکرایەوە، کە رەنگ بێت ئەمە بەشێکی بچووکی بێت، هەموو ئەو شتانەی داوەتەوە ئەدرۆگان، کە لەرێگای شەڕەوە تا ئێستا نەیتوانیوە بە ئاسانی بەدەستیبێنێت!.

بەکورتی کورد دەبێت بزانێت، کە گۆڕانکاریە جیۆپۆلەتیکیەکان لە قۆناغی ئێستادا لەبەرژەوەندی ئەودا نیە!، وەلێ دەتوانێت سوود لە ئامڕازەکانی شۆڕشی گەیاندن، وەکو ئەنتەرنێت و سەتەلایت و تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان و ئەنجامدانی خۆپیشاندنی جەماوەری گەورە لە کوردستان و هەموو جیهان وەربگرێت، بۆ ئەوەی لە رێگای بەهێزکردنی

رای شگتی جیهانی له بایەخی ئەو گۆڕانە جیۆپەلەتیکیانە کەم بکاتەوە، هەرچەندە ئەمە رەنگ بێت کاریکی ئاسان نەبێت و لەمێژوودا نمونەی نەبووە، وەلێ هەرچۆنێک دەبێت لەو قۆناغەدا کورد یەکگرتووبێت بۆ دروستکردنی ئەو رایەو هاوکات خۆی ئامادە بکات بۆ جەولەیەکی تری شەڕ، دوای پێنج رۆژی تر، کە رەنگ بێت هەر لە بنەڕەتدا تا ئەو کاتە شەڕەکە نەوەستێت و تورکیا تەنیا وەکو تەکتیکێک رازی بووبێت بۆ رازیکردنی ئەمریکاو خۆدزینەوە لە پابەندیە نێودەوڵەتیەکانی!. نابێت ئەو راستیە فەرامۆش بکەین، کە تا ئێستا ئەو کارتانەی لەبەردەست تورکیایە زۆر بەهێزترە لەو کارتانەی لەبەردەست کورد دایە، تورکیا لە قۆناغی ئێستادا روسیا بە قووڵایی ستراتیژی خۆی تێدەگات و ئەمریکا بۆ ئەو، ئەو بایەخەی جارانی نەماوە، بەتایبەتیش لەسەردەمی ترامپدا، کە متمانەی ئەمریکای لەسەر ئاستی نیودەوڵەتی و جیهانی تێکشکاند، رووسەکانیش وایدەبینن، کە تورکەکان ئەو هاوپەیمانەن، کە دەتوانن لە دروستکردنی ئۆراسیایەکی نوێدا هاوپەیمانیان بن و رۆڵی گەورە بگێڕن!.

2019\10\18

## پرۆژەکانی تورکیاو سوریا لە گۆڕینی دیمۆگرافیای کوردستان

وەرچەخانەوەی جیۆپۆلەتیک دژی بەرژەوەندیەکانی کورد، دوای گەڕانە دواوەی ئەمریکا و لەڕو لاوازبوون و شکستهێنانی سیستەمی تاک جەمسەری، زۆر لە پرۆژە کۆنەکانی زیندوو کردەوە، کە ئەو دەوڵەتە هەرێمیانەی کوردستانیان بەسەر دابەشکراوە تیایدا هاوبەشن!. لەم روانگەیەوە چنینی هەر هیوایەک لەسەر رێکەوتنی پەیەدە لەگەڵ حکومەتی سوریا بۆ راستکردنەوەی هاوسەنگی هێز، هیوایەکە لە شوێنی خۆیدا نیە، لەبەرئەوەی سوریا لە لایەک بۆتە بەشێک لە پرۆژەکانی روسیا (پرۆژەی ئۆراسیا) و بنکەیەک بۆ زیندووکردنەوەی هەژموونی رووسیا لە ناوچەکە، کە جگە لە کەمێک مافی رۆشنبیری زیاتر بە کورد رەوا نابینێت، لە لایەکی تر سوریا لەگەڵ تورکیا بەشێکن لە هاوپەیمانیەتیەکی هەرێمی، کە هەر لە ساڵی (2007) لێژنەیەکی هەماهەنگیان لەنێوان خۆیان دروستکردووە بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەو مەترسیانەی وەک خۆیان دەڵێن هەڕەشە لەسەر یەکپارچەیی خاکی وڵاتەکەیان دەکات!. بۆیە ئەو سیاسەتەی ئێستا تورکیا بەرامبەر بە کورد لە هەموو کوردستان و بە تایبەتیش لە کاتی ئێستادا بەرامبەر رۆژئاوا پیادەی دەکات، بەشێکە لە ستراتیژیەتێکی هەرێمی، کە لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی، بە تایبەتیش لە دوای رێکەوتنامەی (سەعد ئاباد-1937) پلانی بۆ کێشراوە. بۆیە

بابەتی گۆڕینی دیمۆگرافیاو پاکتاوی رەگەزی بەرامبەر کورد سوریاو تورکیا بە توندی بە یەکەوە دەبەستێتەوە، بۆ نمونە لە ساڵی (1965) ەوە سوریا پرۆژەی پشتینەی عەرەبی هەیە، کە مەبەست تیایدا دروستکردنی دیوارێکی مرۆییە لە نێوان سوریاو تورکیا، بە قووڵایی 10-15 کم ، لە عەرەبەکان، واتە راگواستنی کوردەکانی ئەو ناوچانەو هێنانی عەرەب بۆ شوێنەکانیان، وەک ئەوەی حکومەتی بەعس لە کەرکوک و ناوچەکانی تری کوردستان ئەنجامی دەداو یەکێک لە ئامانجەکانی پرۆسەی ئەنفالیش ئەو پرۆژەی تەعریب کردنە بوو. تورکیا لەم رووەوە پێش هەموویان کەوتووە، هەر لەسەردەمی عوسمانیەکانەوە کەوتۆتە جێبەجێکردنی ئەو پرۆژەیە، لە ساڵی (1915) یاسای راگواستنەوەی بەزۆریان دەرکرد، لە رێگای ئەم یاسایەوە کوردو ئەرمەنەکانیان لە ناوچە سنووریەکانی نیوان روسیاو تورکیا راگواستەوە، بەمەش پرۆسەی جینۆسایدی ئەرمەن و کوردەکان ئەنجام درا، کە تیایدا زیاتر لە 700 هەزار کورد رەشەکوژ کرا!. ئەرمەنەکان تا ئێستا شەڕ بۆ وەرگرتنەوەی مافی خۆیان و ریسواکردنی تورکیا لەکایەکانی کۆمەڵگای نیودەوڵەتی دەکەن، وەلێ کورد بە داخەوە تا ئێستا بەشێکی زۆری بە ناوی ئاینەوە بەرگری لە عوسمانیە نوێیەکان دەکات!. لە ساڵی (1932) کەمالیەکان ئەو یاسایەیان بەرەو پێشەوە بردو هەمواریان کردەوە و ناویان نا (یاسای دوورخستنەوەو پەرتەوازە کردن) لە رێگای ئەو یاسایەوە کوردەکانیان بۆ ناوچە تورک نشینەکانی رۆژئاوای ئەنادۆڵ گواستەوە بە شیوەیەک 5% رێژەی دانیشتوان لەو

ناوچانە تێنەپەڕێنن بۆ ئەوەی لەناو تورکەکان بتوێنەوە، لە (1936)

هەمدیس بە مەبەستی لەباریەک هەڵوەشاندنەوەی باکووری کوردستان

پرۆژەی گاپ خرایە بەرباس و لێکۆڵینەوە، لە هەشتاکانی سەدەی بیستەم

دەستیان کرد بە جێبەجێکردنی، ئەو پرۆژە بریتیە لە ژمارەیەک بەنداوی

گەورە و وێستگەی کارۆئاوی، کە سەرباری ئەوەی بەشیکی زۆری خاکی

کوردستانی ژێرئاو خستووە، لە رێگای پرۆژەی کشتوکاڵی گەورەوە زەوی

کوردەکانیان بە هەرزان کڕیوەو کرێکاری شارەزایان تورکیان خستۆتە ناو

ئەو پرۆژانەوە، بەمەبەستی ناچارکردنی جووتیاری کورد بۆ چوون بە شارە

تورکەکان و کارکردن!.

کەواتە ئەوەی ئێستا تورکیا کاری لەسەر دەکات، بۆ دروستکردنی

دیواریکی مرۆیی لە رەگەزی ناکورد، بەتایبەتیش عەرەب لەسەر

سنوورەکانی رەگێکی مێژوویی هەیە و سوریاو تورکیا لەمەوە هاودەنگن،

بۆیە هەوڵدان بۆ راگرتنی ئەو پرۆژەی تورکیا لە رێگای سوریاوە، هەوڵێکی

نەزۆکە. کورد دەبێت لە قۆناغی داهاتووەی خەباتی خۆیدا زیاتر لە پێگەو

بایەخی جیۆپۆلەتیکی خۆی بگات و بە شیوەیەکی ئەقلمەندانە مامەلەی

لەگەڵ بکات، نەک وەک سەد ساڵی رابردوو، کە لەرێگای بەناو

بزووتنەوەیەکی ناسیونالیستیەوە ولاتەکەی کردە گۆرەپانی شەڕیکی

نابەرابەرو بیانگەی زیاتری دایە دەست دوژمنانی کوردستان بۆ ئەوەی

سیاسەتەکانیان بەرامبەر کورد ئاسانتر پیادە بکەن، ئەگەر ئەو

میکانیزمەی کاری پێکراوە نەگۆڕدرێت، ئەوا بۆ ماوەیەکی کەمی تر هەموو

شتێک لە دەست دەدرێت، چۆن نەتەوەکانی تری ئەو ناوچەیە توانەوەو لە لاپەڕەکانی مێژوودا نەبێت لە هیچ شوێنیک بەرچاو ناکەون، کوردیش بە هەمان دەردی ئەوان دەچێت.

2019\10\21

## کورد لە دۆخی ئاڵۆزی ناوچەکە

چەند کاتژمێرێکی ماوە ئاگربەستی نێوان هەسەدەو تورکیا تەواو بێت، هەست بە کۆمەڵێک لێدوانی چڕو دژبەیەک دەکرێت دەربارەی قۆناغەکانی دوای ئەو ئاگربەستە. ئاژانسەکان لە لایەک ئاماژە بەوە دەکەن، کەوا فەرماندەی هێزەکانی (هەسەدە مەزلوم کۆبانێ) نامەیەکی بۆ جێگری سەرۆکی ئەمریکا ناردووە، تیایدا ئاگاداری کردۆتەوە هێزەکانی ئەوان لە هەموو ئەو ناوچانە کشاونەتەوە، کە بەگوێرەی رێکەوتنامەی تورکی – ئەمریکی دەبوایە لێی بکشێنەوە!. لە لایەکی تر هەواڵی ئەوە بڵاو دەبێتەوە، کە سەرۆکی تورکیاو روسیا لە کۆبوونەوەی ئەمڕۆیاندا باسی زۆر بابەتی مەترسیدارو هەستیاریان دەربارەی سوریاو دۆخی ناوچەکە بە گشتی کردووە و ئەو کۆبوونەوەیە نزیکەی پێنج کاتژمێری خایاندووە. سەرۆکی روسیا دووبارە داوای دەرچوونی هەموو هێزێکی سەربازی بێگانەی کردووە لە سوریا، کە ئەمە ئاماژەیەکە بە پلەی یەکەم تورکیاو ئەمریکا دەگرێتەوە، بەمەش دەیەوێت پانتاییەک لەنێوان روسیاو ئەمریکا بهێڵێتەوە، کە لەبنەڕەتدا بڕیاری کشانەوەی داوە!. لە لایەکی تر داوای بەهێزکردنی دانوستانەکانی نێوان هێزەکانی هەسەدەو دیمەشق دەکات، کە دیارە ئەمەش پەیامێکی باشە بۆ کورد، کە بەدوای هاوپەیمانێکی متمانە پێکراو دەگەڕێت، دوای هەڵوێستەکانی ئەمریکا.

هاوکات نزیکەی دوو رۆژ دەبێت بەرپرسانی ئەمریکی هەمدیس ئاماژەی هەڕەشە ئامێز بە سزای ئابووری تەنانەت بە لێدانی سەربازیش بۆ تورکیا دەنێرن. یەکێتی ئەوروپاش بە تایبەتی ئەڵمانیاو فەرەنسا دەیانەوێت بەهێزەوە بگەڕینەوە ئەو ناوچەیە!.

بەر لە چەند چرکەیەک بەرپرسێک لە کۆشکی سپی رایگەیاند هێزەکانی هەسەدە بە گوێرەی رێکەوتنەکە لە ناوچەکان کشاونەتەوە، ئەگەر تورکیا بەردەوام بێت لە هێرشەکانی، ئەوا ئەمریکا سزای توندی بەسەردا دەسەپێنێت!. پێدەچێت تورکیا هەوڵبدات سازشێک لەگەڵ روسیا بکات!، چۆڵکردنی ئەدلب و کشانەوەی چەکدارە ئۆپۆزسیۆنەکانی تورکیا لەو ناوچەیە، بەرامبەر بەردەوام بوونی تورکیا لە هێرشەکانی بۆ سەر رۆژهەڵاتی فورات (رۆژئاوای کوردستان). ، بەڵام روسیا دۆخەکە لە سوریاو رۆژهەلاتی ناوەڕاست گەورەتر سەیر دەکات و پێناچێت لە پیناو خەونەکانی ئەردۆگان سەرەڕۆیی گەورە ئەنجام بدات !. لەگەڵ ئەوەشدا تا پێناچێت تا ئێستا تورکیای بێ ئومێد کردبێت!. بۆیە ئەگەری بەردەوام بوونی هێرشەکانی تورکیا بۆ سەر رۆژئاوای کوردستان زۆر بەهێزە!.

گۆڕانکاریەکان زۆر بەخێرایی بەڕێوە دەچن، ئەگەر سەیری کۆی دیمەنی ناوچەکە بکەین، هەر لە خۆپیشاندانەکانی لوبنانەوە تا دەگاتە شەڕەکانی سوریاو خۆپیشاندانە چاوەڕوانکراوەکی رۆژی هەینی ئاینده لە ئێراق، بە روونی ئەوە بەدیاردەکەوێت، کە ناوچەکە بە دۆخێکی ئێجگار سەخت و ئاڵۆزدا دەڕوات. گرنگترین خاڵ لەو قۆناغە ترسناکەدا بۆ کورد

ئەوەیە هەوڵی مانەوەدا بدات بە دروشم و بەڵێنەکانی لایەنە سەرەکیەکانی ململانێکە، بە پلەی یەکەم (ئەمریکاو روسیا) خۆی تەرەفگیر نەکات، کورد دەبێت خۆی دوورە پەرێز بگرێت و لەگەڵ دەسەلاتەکانی ناوەند (بەغدا – دیمەشق) درێژە بە گفتوگۆو دانوستانەکان بدات، هەرچەندە دانوستانەکانیش رژدو ئاستەنگ بێت و ناچاری بکات لە قۆناغی ئێستادا سازش لەسەر هەندێک شت بکات، بۆ ئەوەی نەکەوێتە نێوان بەرداشی هەموو لایەنەکانە رکابەرەکانەوە. چونکە هەموو لایەنەکان گرێکوێرەیەکیان بەرامبەر کورد هەیەو بە سەرچاوەی کێشەکانی دەزانن!. مانەوەو دەرچوون لەو گێژەلووکەیە بە کەمترین زیان گەورەترین سەرکەوتن دەبێت بۆ کورد لەو قۆناغەدا. نابێت کورد بەهیچ لایەنێکدا خۆی یەکلایی بکاتەوە، تاوەکو سیماو مۆرکەکانی ئەنجامی ململانێیەکە بەدیار نەکەوێت!. هەرچەندە ئەمە لە دۆخێکی هەستیارو ئاڵۆزی وەک ئەمڕۆ رەنگ بێت کارێکی ئاسان نەبێت!.

2019\10\22

## بۆچی دەبێت بایکۆتی کاڵای تورکی بکەیت!؟

مرۆڤ هەرگیز ناکرێت بەگەدەی بیر بکاتەوە، بەڵام دەتوانێت بە بیرکردنەوە شێوازی نانخواردن و ئەو خۆراکانەی دەیخوات هاوسەنگی گەدەی خۆی رابگرێت، بەمەش هەنگاوێک بەرەو بوونی بە بوونەرێکی ئاقلمەند دەنێت و لە مرۆڤ بوونی سەردەم نزیک دەبێتەوە!. ئەگەر بتەوێت کۆنترۆڵی ئیرادەی خۆت بکەیت و ببیە خاوەنی خۆت، پێویستە بەرهەم هینەری خوانی خۆت بیت!. تاوەکو خوانەکەت لە لایەن دوژمنەکەتەوە بۆت ئامادە بکرێت، واتای ئەوەیە تۆ لە قۆناغی کۆیلەبوونێکی داپۆشراو دەژیت و نەگەیشتویتەتە ئازادی. کەواتە بۆچی دەبێت کاڵای تورکی بایکۆت بکەیت؟ بەرلەهەموو شتێک و دوور لە سیاسەت پێویستە بۆ پاراستنی خۆت و تەندروستی خۆت ئەو کاڵایە بەکارنەهێنیت، دەبێت تاکی کورد لە خۆی بپرسێت بۆ چی هەموو شتێک دەهێنرێتە وڵاتەکەمان ئێمەش تەنیا بۆ چارەسەر نەخۆشی دەچینە وڵاتانی تر، ناپرسن بۆ چی نەخۆشخانەکانی ئێران و تورکیاو ئوردن و هیندستان و ئەوروپا...، پڕە لە نەخۆشی کورد، بە تایبەتیش نەخۆشەکانی هەرێمی کوردستان؟!. ئەمە سەرباری ئەوەی خودی هەرێم خەریکە دەبێتە نەخۆشخانەیەکی گەورەو بواری دروستکردنی نەخۆشخانەو فرۆشتنی دەرمان بۆتە پڕ قازانجترین کارو وەبەرهێنان لەو هەرێمە!. هۆکاری ئەم هەموو نەخۆشیە ئەو شەڕە بایۆلۆژیەیە، کە لەرێگای بازرگانی و

هەناردەکردنی کەل و پەلی بارگاوی کراو بە نەخۆشی ترسناک لەگەڵ هەرێم ئەنجام دەدرێت!. نەتانپرسیوە بۆچی نەخۆشی شێرپەنجە خەریکە هەموو کووچەو گەڕەکەکانی شار دەتەنێت؟ برادەرێکی پزیشک، کە لە نەخۆشخانەیەکی چارەسەری شێرپەنجە کار دەکات، گوتی ئەگەر دۆخەکە بەم شێوەیە بەردەوام بێت دوای چەند ساڵێکی تر ماڵێک لە لە پایتەختی هەرێم، شاری هەولێر کەسێکی یا دووانی بە دەست ئەم نەخۆشیەوە نەناڵێنن!. بێگومان ئەمە بۆ هەموو شارەکانی تری هەرێمی کوردستانیش هەر راستە!. ناپرسن بۆچی ئەو نەخۆشیە بەو شێوەیە تەشەنەی سەندووە؟!. کەواتە ئێمە لەشەڕێکی سەختداین، وڵاتە داگیرکەرەکانی کوردستان، کە لەکاتی ئێستادا تورکیا پێشڕەوایەتیان دەکات و ئاڵای لەناوبردنی کوردی هەڵگرتووە، شەڕێکی مەترسیداری بایۆلۆژیان راگەیاندووە، کە بەداخەوە تاوەکو ئێستا تاکەکانی کورد هەستیان پێنەکردووە!. لەراستیدا شەڕی نوێ تەنیا شەڕی بۆمب و فڕۆکەو بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی فسفۆڕو .... هتد نیە، بەڵکو لەوانەش ترسناکتر ئەو شەڕە بایۆلۆژیە هێمنەیە، کە دژی میللەتەکەمان بە شێنەیی دەگوزەرێت و کەسیش درناکی پێناکات!. شەڕی بایۆلۆژی مۆرکێکی نوێیی جەنگی نوێیە!. وەک زۆر لە توێژەرانی بواری سەربازی ئاماژە پیدەکەن، یەکێک لە چەکە ترسناکەکانی جەنگی نوێی جیهانی جەنگی بایۆلۆژی دەبێت. کەواتە تۆ پێویستە بایکۆتی کاڵای تورکی بکەی، دوای ئەوە بێگومان بایکۆتی هەموو کاڵاکانی وڵاتانی دەوروبەر لەوانە ئێرانیش بکەی،

سەرەتا لە پێناو مەبەستی سیاسی نا بەڵکو تەنیا بۆ پاراستن و مانەوەی خۆت. ئەمە سەرباری ئەوەی بایکۆتکردن زیان بە هەموو دوژمنە دەرەکیەکان و خۆماڵیەکان دەگەیەنێت، لە رووی دەروونیەوە مرۆڤ لە شەرمەزار بوون و ریسوایی رزگار دەکات!.

چ شەرمەزاری و ریسواییەکە بۆ گەلێک دەوڵەتێک بڵێت لە ئەفەریقاش دەوڵەتێکی کوردی هەبێت ئێمە دژی دەوەستین، دەوڵەتێک لەبەر زەقەی چاوانت دەست لەگەڵ ئەهریمەنیش تیکەڵ بکات تەنیا بۆ ئەوەی تۆ لەناوبەرێت، دەوڵەتێک لە رۆژئاوای کوردستان میللەتەکەت و هەموو کەسانیکی ئازادیخواز رەشەکوژ بکات، دەوڵەتێک سوکایەتی بە بوونی تۆ بکات لە باکووری کوردستان وڵاتی کردبێتە زیندانێک و قەسابخانەیەکی گەورە بۆ رۆڵەکانی نەتەوەکەت، تۆش بەیانی، کە لەخەو هەڵسیت خوانی خۆت بە خۆراکی ئەو دەوڵەتە بڕازێنیتەوە!، تۆش، کە بچیەوە دەرەوە کراسێکی تورکی و پانتۆڵێکی تورکی و پێڵاوێکی تورکی بکەیتە بەرت، ئای ئەمە چ شەرمەزاریەکی گەورەیە!. مرۆڤ، کاتێک دەگاتە ئەو قۆناغە لە سووک بوون و سووکایەتی پێکردن، ئەوا بێگومان لە برسان بمرێت باشترە، هەرچەندە هەرێمی کوردستان هێندە خێرو بێری زۆرە، کە نەک هەر بەشی ناوخۆیی دەکات، بەڵکو دەتوانێت هەناردەی دەرەوەش بکرێت، ئەگەر رێگا نەدرێت بەروم و بوومی جووتیاری کورد لە رێگای شەری بارزگانی لە لایەن تورکیاو ئێرانەو بەیارمەتی ناپاکەکانی ناوخۆ سووک و ریسوا نەکرێت لە بازاڕەکان، ئەوا بەرهەمی خۆماڵی

لەهەموو ئەو بەرهەمە ژاراویانە باشترە لە دەرەوە سنوورەکانەوە بۆمان دێت، کەواتە ئەلتەرناتیڤی کالای تورکی، کاڵای و بەرهەمی خۆماڵیە. بینیتان بە هۆی نەمانی مووچەو گەڕانەوە بۆ کشتوکاڵ تەنیا لە ماوەی یەک دوو سالدا بەرهەمی خۆماڵی چەند بەرەو پێشەوە چو و چ هەنگاوێکی گەورەی نا!. بۆیە کاتێک دەڵین ئەگەر کالای تورکی بەکارنەهێنین چی بکەین، ئەمە بەشێکە لەشەڕێکی دەروونی و بازرگانی، لەبەرئەوەی دۆخی ئێستای کشتوکاڵی هەرێم زۆر جیاوازەو لە چەند ساڵێک بەرلە ئێستاو ناکرێت بە چاوی چەند ساڵێک بەر لە ئێستا خوێندنەوەی بۆ بکرێت!. بایکۆتکردنی کاڵای تورکی، فێری ئەوەمان دەکات رێزی بەرهەمی خۆمالی بگرین، بایکۆتکردنی کاڵای تورکی، ئەو بەرپرسە گەندەڵانە دەخاتە خانەی خیانەتکارانەوە، کە هیچ لەو جەللادە تورکانە کەمتر نین، کە سەری مندالانی کورد لە ژێر پۆستاڵی رەشیان دەپلیشێننەوە.

بایکۆتکردنی کالای تورکی، وامان لێدەکات بۆ خۆمان بگەڕێینەوە پشت بەخۆمان ببەستین و لە نەحۆشیەکانمان رزگار دەکات، لە سووکایەتی پێکردن و ریسوابوونمان رزگار دەکات، ئەو کەرامەتەمان بۆ دەگەڕێنێتەوە، کە رۆژ بە رۆژ لێمانی زەوت دەکەن و وامان لێدەکەن وەک بوونەوەرێکی بێبەها لە خۆمان بڕوانین، کەواتە بایکۆتی کالای تورکی بکە سەرەتا لەبەر تەندروستی خۆت، دواتر لەبەر تەندروستی خێزانەکەت، پاشان لەبەر شکۆی نەتەوەکەت و رێز گرتن لە خوێنی ئەو کچ و ژن و منداڵ و ئافرەتانەی، سەربازەکانی تورک و چەتە هاوپەیمانەکانیان لە

هەموو کوردستان، بەتایبەتی لە رۆژئاوای کوردستان هەتکیان دەکەن و سووکایەتیان پێدەکەن، بایکۆت کردنی کاڵای تورکی چەندین هەنگاو لە ئیرادەو مرۆڤبوونی خۆت نزیکت دەکاتەوە.

2019\10\25

## تەنیا بایکۆتی کاڵای تورکی نا، سەردانی نەخۆشخانە تورکیەکانیش مەکەن!.

له راستیدا بە تەنیا کاڵا تورکیەکان مەترسیان لەسەر ژیان و سەلامەتی هاوڵاتیانی هەرێم نیە، بەڵکو ئەو کۆمپانیاو نەخۆشخانەو دام و دەزگایانەی لەناو هەرێمیشن مەترسیدارن !. خەریکی خوێندنەوەی راپۆرتی کەوتنی شاری مووسڵ بووم بە دەستی رێکخراوی داعش، کە لە 2015\08\18 نوسراوە، لەو راپۆرەتەدا شتێکی سەیرم بەرچاو کەوت، بۆیە وا دەقەکەیتان بۆ وەردەگێڕمە سەر زمانی کوردی و ئێوە خۆتان سەرپشک بن.

له راپۆرتی لێژنەی لێکۆڵینەوەی تایبەت بە کەوتنی مووسڵی ئەنجومەنی نوێنەرانی ئێراقدا، کە 2015\08\16 نوسراوە هاتووە:" بەڕێوەبەری ئۆفیسی هەواڵگری نەینەوا باسی لەوە کرد، کەدیارترین چالاکی هەواڵگری لە پارێزگای نەینەوا، چالاکیەکانی دەزگای خەواڵگری تورکی بوو، کۆنسوڵی تورکی لە پارێزگای نەینەوا بە ئازادیەکی تەواوەوە هەموو چالاکیەکی ئەنجام دەدا وەک کردنەوەی قوتابخانەو بینینی هاوڵاتیان و سەردانی هەموو شوێنێکی دەکرد، وەک تەلەعفەرو رەشیدیەو ئەو چالاکیانە لە چوارچێوەی ئەو چالاکیانە دەردەچوو، کە بەگوێرەی رێساکانی کاری دیپلۆماسی ناسراوە، بەڕێوەبەری ئۆفیسی هەواڵگری

نەینەوا چالاکیەکانی کومسوڵە تورکیای لە نەینەوا کورتکردەوە و گوتی:"کونسوڵی تورکیا سەرپەرشتی شاری مووسڵی دەکرد بەو پێیەی وەک پارێزگارە"، پاشان گوتی:" تاکە هێزێکی ئاسایش، کە دوای کەوتنی مووسڵ بە دەستی داعش لەو پارێزگایە نەکشایەوە پاسەوانەکانی کونسوڵگەری بوون". هەروەها گوتی لەم بارەیەوە پەیوەندی بە بەڕێوەبەری پاسەوانەکانی مونشەئاتەکانی نەینەوا عەمید (محەمەد وەکاع) کردووەو لێی پرسیوە، کە ئایا کونسوڵگەری تورکیای ئاگادار کردۆتەوە لەوەی ، کە تیرۆریستان دەچنە هەموو ناوچەکانەوە؟، وەکاع پێی ڕاگەیاندووە، کە ئەو کونسوڵگەری تورکیای ئاگادارکردۆتەوەو پاسەوانەکانی کونسوڵخانەکە بە پاسەوانەکانی مەنشەئاتەکان (FBS) گوتووە: ئێوە بڕۆن و هەقتان بەسەر ئێمەوە نەبێت. لە وەڵامی ئەو پرسیارەی، کە ئایا رۆڵی کونسوڵی تورکیا پۆزەتیڤانە یاخود نێگەتیڤانە بوو، بەڕێوەبەری ئۆفیسی هەواڵگری نەینەوا وەڵامی داوەتەوە، کە رۆڵی ئەو نێگەتیڤانە بووە. لە پرسیاری ئەوەی کام کۆمپانیا یاخود دام و دەزگا دەشێت رووی دەرەوەی هەواڵگری دەوڵەتێکی بێگانە بێت. لە وەڵامدا گوتوویەتی ئەوان گومانیان لە نەخۆشخانەی تورکی بۆ چاو هەیە.

2019\10\27

# کوردستان لە جەنگی سێیەمی جیهانیدا!

دوای ئەوەی لە ساڵی (2015) روسیا بە شێوەیەکی سەربازی خۆی لە سوریا هەڵقورتاند، هاوکێشە جیهانیەکان گۆڕان و هاوسەنگی هێز لەسەر گۆڕەپانی نێودەوڵەتی، خەریکە هەموار دەبێتەوەو رۆژ بەرۆژیش و زۆر بەخێرایی ئەو هاوسەنگیە دەگۆڕێت، کە ئەمە ئەگەری شەڕێکی جیهانی زیاد کردوەو زۆر جار لە میدیاکان و تەنانەت بەرپرسانی وڵاتە گەورەکانیش گوێمان لە مەترسیەکان و ئەگەرەکانی دایسانی ئەم جەنگە دەبێت!.

لەراستیدا کێشەیەکی بونیادی لەم خوێندنەوانەدا لە بەردەم ئاڕاستەی بۆچوونەکاندا هەیە، واتە خوێندنەوەی رووداوەکانە بە هەمان ئەو ئامرازانەی، کە بۆ هەردوو جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانی دەکرێت، کە رەنگ بێت خاڵی هاوبەش لەمەدا ئەوە بێت هەموو ئەو جەنگانە لەسەرئاستێکی جیهانیدان و هێزە جیهانیەکان بە شێوەیەک لە شێوەکان تێیەوە دەگلێن و هەر یەکەی بە گوێرەی هێزو پێگەی جیۆپۆلەتیکی خۆی رۆڵی تیادا دەگێڕێت!. وەلێ جیاوازی بنەڕەتی لەوەدایە، شەڕی نوێی جیهان بە هیچ شێوەیەک لە دوو شەڕەکەی تری جیهانی ناچێت، چونکە بەکارهێنانی چەکی ئەتۆمی لە کۆتاییەکانی جەنگی دووەمی جیهان، شێوازی شەڕی تەقلیدی گۆڕی و ئەو جۆرە شەڕە بۆ هەتا هەتایە ماڵئاوایی کرد، چونکە بەکارهێنانی ئەو چەکە ئەوەی بۆ هەموو هێزەکان

روونکردەوە، کە لەمەودوا چەکەکان بە تەنیا مرۆڤەکان ناکوژن و دوژمنەکان لەناو نابەرن، بەڵکو ژیان لەسەر گۆی زەوی دەخەنە مەترسیەوە و تەڕو وشک بەیەکەوە دەسووتێنن!.

جا ئەگەر ئەم بیرکردنەوەیە بۆ ئەو قۆناغە راست بووبێت، ئەوا دوای زیاترلە نیو سەدە دوای ئەو جەنگەو ئەو پێشکەوتنە ترسناک و مەترسیدارانەی لە بواری پیشەسازی جەنگدا هاتوونەتە ئارا، ئەو راستەقینەیە تۆختر دەکاتەوە وا دەکات تەنانەت خەڵکی ئاسایش هەست بەم مەترسیانە بکات. بۆیە دایسانی جەنگێکی تری جیهان لەسەر هەمان پێودانگی جەنگی یەکەم و دووەم، نەک هەر ئاستەنگە بەڵکو مەحاڵە!. هەر ئەم خاڵەشە وا لە زلهێزەکان دەکات، بوێرانەتر هێڵە سوورەکان ببەزێنن و بە ئاڕاستەی ئامانجەکانیان و هەموارکردنەوەی هاوسەنگی هێزی جیهانی هەنگاو بنێن، وەک ئەوەی روسیا لە جۆرجیاو چەچان و مۆڵداڤیاو ئۆکرانیاو دواجاریش لە سوریا ئەنجامیدا!. بوونی تەرسانەیەکی گەورەی ئەتۆمی و چەکی وێرانکەر لەبەر دەستی رووسیا، نەک بووە رێگر لەبەردەم ئەوەی دوای هەڵوەشانەوەی سۆڤیەت هیچ هێزێک بوێری ئەوەی نەبێت پەلاماری بدات و وەک ئیمپراتۆریاکانی پێشووتر، بۆ نمونە ئیمپراتۆریای عوسمانی و ئیمپراتۆریای ئەڵمانی لەدوای جەنگ لە باریەک هەڵیوەشێنێتەوە، بگرە رێگاشی بۆ خۆشکرد بۆئەوەی بە بڕوا بەخۆبوونێک و پارێزراویەوە لەبەر زەقەی چاوانی ئەمریکاو ئەوروپا هەنگاو بەرەو تێکشاندنی لەمپەرەکان و سەرلەنوێ بووژانەوەو هەڵسانەوە بنێت!. لێرەدا

پرسیارێک دێتە ئارا: ئایا ئەگەر دایسانی جەنگێکی جیهانی لەسەر شێوەی جەنگە جیهانیەکانی پێشووتر مەحاڵ بێت جەنگی جیهانی نوێ چۆن دەبێت؟!. ئەوەی ئاشکرایە جەنگی جیهانی نوێ جەنگێکە زیاتر بە شێوەیەکی ناراستەوخۆ ئەنجام دەدرێت، ئەمریکیەکان و تەنانەت رکابەرەکانیشیان هەوڵدەدەن بە شێوەیەکی ناراستەوخۆ و لە رێگای ئەو ئامرازانەی لەبەردەستیاندایە ئیدارەی ئەو جەنگە نوێیە بکەن، لەمەشدا سوودیان لەئەزموونەکانی ئیمپراتۆریای رۆمانی وەرگرتووە، کە هەوڵیاندەدا، چەک بۆ هاوپەیمانەکانیان دابین بکەن و لە رێگای ئەوانەوە کار بۆ هینانەدی ئامانجەکانی خۆیان بکەن، بۆ نمونە فیل و ئەسپ و رم و تیرو چەکەکانی ئەو سەردەمەیان بۆ ئەو هێزانە دابین دەکردو ستراتیژیەت و پلانی شەڕیان بۆ دادەنان، ئەو هێزانە بەشێوەیەکی راستەوخۆ شەڕەکانیان ئەنجام دەداو دەکوژران و زیانی گیانی و خاک و ولاتیان لێدەکەوت. ئەو هێزانە، کە بە هاوپەیمان ناوزەد دەکران، زیاتر لە هێزی کرێگرتە دەچوون ، کە چەند بازرگانێکی شەڕ بەڕێوەیان دەبرد!. ئەگەر سەیری جەنگەکانی ئەمریکا بکەین، رێک لە دوای نەوەداکانی سەدەی رابردووەوە ئەو شێوازە لە شەڕ پیادە دەکات، لە ئەفغانستان هێزەکانی هاوپەیمانی باکوور و گرووپە چەکدارە بەرهەڵستکارەکانی تر، پێش سووپای ئەمریکا کەوتن و لە لایەن ئەمریکاوە چەک و تەقەمەنیان بۆ دابین دەکراو لە ئاسمانەوە پاڵپشتیان دەکردن. لە پەلاماردانی ئێراقیش بە هەمان شێوە، کوردەکان لە باکوورو شیعەکان لە باشوور پێش سووپای

ئەمریکا کەوتن و ڕێگایان بۆ هاتنە ناوەوەی سوپاکانی ئەم وڵاتە خۆشکرد، بۆ ئەوەی بە زیانێکی ئێجگار کەم، تا رادەی ئەوەی دەتوانین بڵێین بە بێ زیان هاتنە ناو عێراق و داگیریان کرد.

کەواتە لە جەنگی نوێی جیهانیدا بە پلەی یەکەم شەڕەکان بە وەکالەت دەکرێن و تەنیا ئەو چەکانەش دەخرێنە دەست هێزە شەڕ کەرەکان، کە توانای ئەنجامدانی ئەو شەڕانەیان هەیە، کە زلهێزەکان خۆیان مەبەستیانە. بە چەکەکانی تریشیان هەڕەشە دەکەن و ناوە ناوە لە دوورەوە هێزی نوێی خۆیان نیشان دەدەن، وەک بەکارهێنانی رۆکێتی کالیبەر لە لایەن روسیا لە سوریا و بەکارهێنانی رۆکێتی کرۆز لە لایەن ئەمریکا هەر لە سوریا دوای ئەوەی رژێمی سوریان بە بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی لە خان شیوخ تۆمەتبارکرد!. دوای دەستپێکردنی ئەوەی ناونرا بەهاری عەرەبی، ئەو شێوازە پێشکەوتنێکی تری بە خۆیەوە بینی، ئەویش هێنانی هەموو گەل بۆ ناو گۆڕەپانی شەڕ، کە گۆڕەپانی خۆپیشاندانەکان بوو، هەوڵیاندا لە ڕێگای قۆستنەوەی مافە رەواکانی خەڵک، ئەو ڕێگا نوێیەی خەبات بەکاربهێنن و گەل وەک هێزو سەرچاوەکانی هێز ڕووبەڕووی ئەو دەسەڵاتانە بکەنەوە، کە دەیانویست بیانگۆڕن، بە مەبەستی هێنانە دی دەستکەوتی جیۆپۆلەتیکی و ئابڵووقەدان و دەرکردنی رکابەرەکانیان لە پێگە جیۆپۆلەتیکیە هەستیارەکان. ئەم ڕێگایە لە باکووری ئەفریقا (تونس و لیبیاو میسر) سەرکەوتنی بە دەست هێنا، وەلێ بەهۆی خۆتێهەڵقورتاندنی روسیا لە سوریا چەقی. تاوەکو ئێستا ئەو ڕێگایە لە

لوبنان و عێراق و تەنانەت ئێرانیش تاقیدەکرێتەوەو ئەگەری ئەوەی هەیە وەکو یاری دۆمینۆ هەموو وڵاتەکانی ناوچەکانی بگرێتەوە!.

شایەنی ئاماژە بۆ کردنە لەم جەنگە نوێیەدا تەنیا ئەو چەکانە بەکار ناهێنرێت، کە بینراو بەرچاون، واتە چەکی تەقلیدین، بەڵکو مەترسیدارترین چەک، کە لە قۆناغی ئێستادا بەکاردەهێنرێت، چەکی بایۆلۆژیە، هەر بۆیە مەترسیدارترین و ترسناکترین شەڕ لە کاتی ئێستادا شەڕی بایۆلۆژیەو ئەم شەڕە لە کوردستان، بە تایبەتیش لە هەرێمی کوردستان زۆر بە زەقی دەستپێکردووەو دەبینرێت، لە رێگای ئەو شەڕەوە خەریکە کۆمەڵگای کوردی لە باشوور دەبێتە کۆمەڵگایەکی سەراپا نەخۆش و داپڕووکاو. ئەگەر توێژینەوەیەکی ورد لە بواری تەندروستیەوە لە هەرێمی کوردستان بکرێت، بۆ نمونە دەربارەی نەخۆشیەکی وەکو شێرپەنجە، ئەوا بەگوێرەی هەندێک لەو داتایانەی دەستم کەوتووە، لەماوەی تەنیا پێنج ساڵی رابردوودا ئەو نەخۆشیە لە هەندێک شاری هەرێم بە رێژەی لە 100% و زیاتریش بۆ هەموو تەمەنەکان زیادی کردووە!. ئەمە جگە لە زۆربوونی رێژەی نەزۆکی لە ئافرەتان و پیاوانی کورد و دەیان نەخۆشی ترسناکی تر، کە ئەگەر داتاکان ئاشکرا بکرێت، ئەو کاتە دەزانین ئێمە لە چ کارەساتێکدا دەژین و لە چ جەنگێکی وێرانکەرداین . تازە بەم دواییە خەریکە کۆمەڵگای کوردی لە رێگای ململانێی سیاسیەوە درک بەو شەڕە دەکات و بایکۆتی کاڵای ئەو دەوڵەتانە دەکات، کە ئەو شەڕەی دژی پیادەکەن، بۆ نمونە وەک

بایکۆتکردنی کاڵای تورکی، کە ئەگەرچی بە شێوەیەکی فراوان خەریکە شەقامی کوردی دەگرێتەوە، بەڵام تاوەکو ئێستا لە ئاستی گەورەیی شەڕەکەو ترسناکییەکەیدا نیە!.

بەرەیەکی تری گرنگ و چارەنووس ئامێزی ئەو جەنگە جیهانیە نوێیە شەڕی بازرگانی و ئابووریە، ڕۆژانە لە میدیاکانەوە دەنگی شەڕی ئابووری لە نێوان هێزە گەورەکانی دنیامان بەرگوێ دەکەوێت. شەڕی ئابوری لە نێوان ڕۆژئاوا (ئەمریکاو ئەوروپا) لەگەڵ روسیا، لە ڕێگای سەپاندنی سزای ئابووری بەسەر رووسیا دوای ئەوەی دەستی بەسەر نیمچە دورگەی کریمدا گرت، شەڕی بازرگانی لە نێوان ئەمریکا و چین، لە ڕێگای سەپانی باجی زیاتر لەسەر کاڵای یەکترو داخستنی دەرگای وڵاتەکانیان بەرانبەر بەرهەمی یەکتر، ترسناکی ئەو شەڕە ئابووریە لە نێوان ئەو دوو زلهێزەدا وای لە زۆر نووسەران کردووە، کە وای بۆ بچن ئەو شەڕە بەخێر ناگەڕێت و لە کۆتایدا دەبێتە جەنگێکی سەربازی لە نێوان چین و ئەمریکا. هاوکات چینیش لە پرۆژەی ئۆراسی، تەنانەت جیهانیەکەی خۆیدا (دەستپێشخەری پشتێنەو ڕێگا) یاخود ڕێگای ئاوریشمی نوێ، هەوڵدەدا لە ڕێگای وەبەرهێنانی ئابووریەوە دەست بەسەر ناوچە هەستیارو ستراتیژیەکانی جیهان دابگرێت، لەمەشدا قەرز وەکو چەکێکی کارا بەکار دەهێنێنێت، لە سریلانکا حکومەت ناچار بوو بوو بەندەری کۆلۆمبۆ بۆ ماوەی نزیکەی نیو سەدە بخاتە ژێر دەست چینیەکان بەرانبەر ئەو قەرزانەی بۆ پرۆژەکانی وەریگرتبوو. تەنانەت

دەوڵەتێکی وەکو ئیسرائیل بەندەری حەیفای بۆ ماوەی 25 ساڵ داوەتە دەست چین بۆئەوەی ئیدارەی بکات، ئەمەش کێشەی جدی لە نێوان ئەمریکاو ئیسرائیل دروستکردووەو ئاماژەیەکیشە بۆ باڵادەست بوونی جیهانی چین لە سالانی ئایندەدا، چونکە گرووپی فشاری جولەکە زیاتر هەست بە گۆڕانکاری هاوسەنگی هێز دەکات و هەوڵدەدات خۆی لەگەڵ گۆڕانکاریەکان بگونجێنیت، بۆ نمونە لە سالی (1943) هێشتا جەنگی دووەمی جیهانی بە کۆتا نەهاتبوو، کاتیک هەستیان بە بەرزبوونەوەی ئەمریکا کرد بۆ رێزبەندی یەکەم لەسەر ئاستی جیهانی، بنکەکانی خۆیان لە لەندەنەوە گواستەوە ئەمریکا!.

لە هەرێمی کوردستانیش شەڕی ئابووری دژی هەرێم زۆر بەکارامەیی بەڕێوە دەچێت، تەنانەت لە رێگای شەڕی ئابووریەوە هەرێمی کوردستان بۆتە دوو کۆلۆنیای ئابووری هەردوو وڵاتی تورکیاو ئێران، بۆتە بازاڕێک بۆ کاڵای ئەو دوو وڵاتەو بەرهەمە ساختەو خراپەکانی خۆیان لە بازاڕەکانی هەرێم ساغ دەکەنەوە. لەم لایەنەدا شەڕی ئابووری لە هەرێم تیکەڵ بە شەڕی بایۆلۆژیش کراوە، لەگەڵ هەناردەکردنی کاڵای خراپ و بارگاوی گراو بە جۆرەها نەخۆشیەوە، کۆمەلگای کوردیان رووبەرووی کارەساتی گەورەکردۆتەوە. کایە ئابوورییە گرنگەکانی کوردستانیان خستۆتە ژێر هەژموونی خۆیانەوە، کە ئەمە وایکردووە لە لایەک بەرهەمی خۆماڵی لە ناو ببردرێت کۆمەڵگای کوردی بە شێوەیەکی سەرەکی پشت بە کاڵای ئەوان ببەستێت، لە لایەکی تر کۆنترۆڵی جڵەوی دەسەڵاتی

سیاسی لە هەرێم بکەوێتە دەست خۆیانەوە!. ئەمەش بۆتە سۆنگەی ئەوەی دەسەڵاتی سیاسی لە هەرێم لە کاتی ئێستادا مۆرکی نیشتیمانی و نەتەوەیی خۆی لە دەست بدات و درزێکی گەورە لە نێوان دەسەڵات و خەڵکدا دروست ببێت، تەنانەت ئەگەر بە وردی لێی بکۆڵیەوە بۆت دەردەکەوێت، کە دەسەڵاتی بەناو کوردی لەباشوور هێندە خزمەت بە ئەجینداکانی ئەو دوو دەوڵەتە دەکات، هێندە پەیوەندی بە کوردو مەسەلە نەتەوەیی و نیشتیمانیەکانەوە نەماوە!.

لایەنێکی تری گرنگ لەم جەنگە نوێیەدا شەڕی ئەلیکترۆنی و میدیاییە، ئەو شەڕە ئەگەرچی بە شێوەیەکی سەرەکی لە نێوان زلهێزەکان و بەرهەمهێنەرانی ئەو دەزگایانە ئەنجام دەدرێت و چوارچێوەیەکی زۆر فراوانی گرتۆتەوە، بەڵام گومان لەوە ناکریت ئەم شەڕە شۆڕبۆتەوە خوارەوە و گەیشتۆتە ئاستی شەڕی نێوان دەوڵەتە هەرێمیەکان و تەنانەت ناوخۆی حیزبەکان و تاک بە تاکی کۆمەڵگاکان!. لە ساڵی (2016) لەکاتی هەڵبژاردنەکانی سەرۆکی ئەمریکا روسیا هەوڵیدا لە رێگای ئەو شەڕەوە بنەماکانی سیستەمی دیموکراتی بێ بەها بکات و گومان بخاتە سەر پرۆسەی هەڵبژاردن، کە ئەستوندەی سەرەکی سیستەمی دیموکراسیە لە ئەمریکا، لەمەشدا سەرکەوتنێکی بەرچاوی دەست هێنا!. هەر ئەم شەڕەشە وای لە زلهێزێکی وەکو چین کرد پرەنسیپی سەروەری ئەلیکترۆنی بێنێتە ناوەوەو تا ئەوپەڕی توانای هەوڵبدات کۆمەڵگاکەی خۆی لەبەردەم هێرشە ئەلیکترۆنیەکان دابخات، کە هەرەشە لەسەر

کەلتوورو زمان و ئابووری و داب و نەریت و بەهاکانی ناو کۆمەڵگا دەکەن.

ئەو شەڕە لە هەرێمی کوردستان زۆر بە زەقی بەرچاو دەکەوێت و پیادە دەکرێت، بۆ نمونە تورکیا لە رێگای کەناڵەکانیانەوە، هاوکات لە رێگای ئەو هێزو لایەن و دەزگایانەی بە شێوەیەکی راستەوخۆو ناراستەوخۆ بۆ ئەو کار دەکەن، خەریکە هەموو بەهاکانی کۆمەڵگای کوردی لە بناغەوە هەڵدەتەکێنێت و بەهاکانی خۆی بەسەر ئەو کۆمەڵگایە دەسەپێنێت، بەمەش رێگا بۆ ئەوە خۆش دەکات بەرلەوەی سەربازەکانی لەسەر خاکدا بەشێوەیەکی راستەوخۆ خاکی هەرێم داگیر بکەن، میدیاکان و دەزگاکانی راگەیاندنی، ناخی تاکی کوردیان داگیر کردبێت زەمینەیان بۆ داگیرکردنە سەربازیەکە خۆشتر کردبێت!.

ئاسۆکانی دەرهاویشتەی ئەو جەنگەی جیهانیە نوێیە لە کوردستان خەریکە لە هەموو شوینێکی تری جیهان روونتر بەرچاو دەکەوێت. ئەگەر لە جەنگی یەکەم جیهان کوردستان بۆ جاری دووهەم  لە نێوان چەند ولاتیکدا دابەش کرا، ئەوا لەو جەنگە نوێیەدا دابەشکردنەکە لەسەر بنەمای گۆڕینی دیمۆگرافیاو سەرلەنوێ دابەشکردنەوەی رێژەی دانیشتوانە لە کوردستان بە رێژەیەک کوردستان تایبەتمەندیەکانی خۆی وەک وڵاتێکی کوردان لە دەست بدات. گۆڕینی دیمۆگرافیای کوردستان هەم شەڕێکی مەترسیدارەو هەم ئامانجێکی بەرچاویشە. ئەم شەڕە بە چەند رێگایەک ئەنجام دەدرێت، لەوانە لە ریگای هێزی سەربازیەوە، وەک ئەوەی تورکیا لە رۆژئاوای کوردستان ئەنجامی دەدات و دەیەوێت  لە ریگای گۆڕینی

دیمۆگرافیاوە پشتێنەیەکی مرۆیی لە نێوان باکوورو ڕۆژئاوایی کوردستان دروست بکات، هێنانی خێزانی عەرەب و تورکمانە توندڕەوەکان بۆ عەفرین و بەم دواییەش بۆ سەری کانی و گرێ سپی بەشێکی گری ئەم شەڕەیەزهاوکات ئەم شەڕە لە ڕێگای نیشتەجێکردنی ئاوارەو پەڕاگەندەکانی شەڕەوە ئەنجام دەدرێت، وەک ئەوەی لە هەریمی کوردستان پیادە دەکرێت، دوای هاتنی داعش بە شێوەیەکی پلان بۆ دارێژراو دەرگای ناوەڕاست و باشووری عێراق لەبەردەم ئاوارەکانی ناوچە سوننە نشینەکان داخراو ئاڕاستەی شالآوی ئەو کۆچبەرانەیان بەرەو هەرێمی کوردستان گۆڕی، کە ئەمە وایکردووە لە کاتی ئێستادا دیمۆگرافیای شارەکانی هەرێمی کوردستان بە شێوەیەکی بنەڕەتی گۆڕانی بەسەر دابێت، کە هەرگیز لە دوای هاتنی ئیسلامەوە تاوەکو ساڵی (2014) پرۆسەی تەعریب و گۆڕینی دیمۆگرافیای کوردستان، بەو ئاسانیەو لە ریگای سیاسەتەوە بەم شێوەیە سەرکەوتوو نەبووە، بە تێپەڕینی کاتیش ئەم سەرکەوتنە زۆرتر دەبێت و مەسەلەیەک نامێنێت بە ناوی مەسەلەی کەرکوک و ناوچە کێشە لەسەرەکان، یاخود ناوچەکانی دەرەوەی ئیدارەی هەرێم ، بەڵکو شەرە دیمۆگرافیاکە دەکەوێتە ناو قووڵایی جوگرافی هەریمی کوردستانەوە، بەم چەشنە لە ریگای ئەو دەسەڵاتە ناشەرعیەی کوردی و ئەو سیاسەتە ناڕاست و بێباکەی پیادەی دەکات، خەریکە هەریمی کوردستان تایبەتمەندیە بنەرەتیەکانی خۆی وەک خاکێکی کوردی یاخود کوردستانی لە دەست دەدات.

ئەم خاڵانەی باس کرا، ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە، کە لە کاتی ئێستادا جەنگی سێیەمی جیهانی دایساوەو بەشێوەیەکی کردەیی لە جیهان، بەتایبەتیش لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و تایبەت تریش لەسەر خاکی کوردستان بەڕێوە دەچێت، بۆیە دەبێت تاکی کورد هەست بەوە بکات و هوشیار بێتەوە، کە ئەو لەناو جەنگێکی جیهانی زۆر ترسناکدایە و کاریگەری زۆر ترسناکیشی لەسەر چارەنووسی ئەودا هەیە، ئەگەر لە قۆناغی ئێستادا دەسەڵاتێکی گەندەڵ و نابەرپرس هەست بە مەترسیەکان نەکات و بازرگانی بە هەموو پیرۆزیەکانی ئەم خاکەوە بکات، ئەوە لەسەر تاکی کورد پێویستە هوشیارانەتر لە بەرپرسیاریەتەکانی خۆی تێبگات و شەڕی میدیایی و کێشە لاوەکیەکان ، لە مەسەلە گرنگەکانی دوورنەخاتەوەو ئایندەی خاک و وڵاتەکەی خۆی، بە چەند چەتەو ڕێگرو خۆفرۆشێک نەبەستێتەوە!.

2019\12\6

## هێلکه له جووجکەیه یاخود جوجکه له هێلکەیه؟!

وا بزانم پێویستی به رۆشنبیریەکی زۆر و زانایيەکی زۆر نیه تا بزانیت جیاوازییەکی زۆر له نێوان زیادەڕۆیی و زیادەڕۆکار هەیه. زیادەڕۆیی واته کارەکەو زیادەڕۆکار واته ئەو کەسەی زیادەڕۆییەکه ئەنجام دەدات.
نازانم ئەرکی ئەو دەزگایەی ناوی نراوه ئەکادیمیای کوردی و پارەیەکی زۆری لێ سەرف دەکرێت چییه!.

وەک گۆرانی شاعیر دەفەرموێت:

کا بۆ سەگ دانراوه

ئێسقان بۆ ئەسپه

سەر له جێی کلک بەندکراوه

کلک له جێی چەسپه

گفتو گۆ لەسەر ئەم بابەتانه ئەوەی بیر هێنامەوه، کاتێک تورکەکان له سالّی 1453 پەلاماری قوستەنتەنتینه – ئیسلام پۆلّ – (ئەستەمبۆلی) ئێستایان دا، گفتوگۆیەکی سەیر له نێوان بەرپرسەکان و کلیساکانی ئەم شاره له ئارادا بوو، ئەویش گفتوگۆ بوو لەسەر ئەوەی جووجکه له هێلّکەیه یاخود هێلکه له جووجکەیه!. ئەو جۆره گفتوگۆیانه لەکاتی ئێستادا، که هەرێمی کوردستان له قەیرانێکی زۆر گەورەدایەو ناوچەکەش بەگشتی له چاوەڕوانی تەقینەوەیەکی سیاسی و ئابووری و تەنانەت

سەربازی گەورەدایە، واتای ئەوەیە پەرلەمانی کوردستان هیچ پەیوەندییەکی بە خەڵکی کوردستانەوە نەماوەو ئەوان لە دۆڵێکن و خەڵکیش لە دۆڵێکی تر، واتای راکردنە لە بەرپرسیاریەتیە راستەقینەکەو فریودان و بە رێلابردنی رای گشتی ماندووی کوردستانە. واتای ئەوەیە پەرلەمان جگە لە دیکۆرێک، کە حیزبە ستۆکەکانی کوردستان دەیانەوێت رووی دزێو و ناحەزی خۆیانی پێ جوان بکەن، هیچ رۆڵێکی تر نابینینێت و لە بارگرانیەک زیاتر بۆ سەر ئابووری هەرێم، هیچ بە هایەکی تری نەماوە!. بۆیە دەبێت خەڵکی کوردستان درک بەوە بکات، کە چیتر ئەو دەزگایانە نوێنەرایەتی ئەو ناکەن و پێویستە لە رەگ و ریشەوە بگۆڕدرێن ئەو حیزبانە، کە بەم شێوەیە سووکایەتی بە دۆزی نەتەوەیەک دەکەن، بخرێنە بەردەم دادگاکان و وەک سیخوڕو وڵات فرۆش مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت.

2019\12\6

## بەهاری عەرەبی و پایزی ئەورووپی

لە کۆتاییەکانی دەیەکی یەکەمی هەزارەی سێیەمدا، رووداوەکان لە تونس لە رێگای خوسوتاندنی فرۆشیارێکەوە (محمد بوعزیز) ەوە دەستی پێکرد، وەکو یاری دۆمینۆ زۆربەی سیستەمە سیاسیەکانی باکوری ئەفریقای گرتەوە، لە تونس سەرۆکەکەی رایکردو لیبیا سەرۆکەکەی کەوتە بەر تووڕەیی خەڵک و سەرۆکی میسریش راپێچی بەردەم دادگا کرا! پاشان گۆڕانکاریەکان، ئەوەی ناونرا بەهاری عەرەبی، لە دەریای سوور پەڕیەوەو بەرەو کەنداو هات، لە سوریا چەقی بەست و سوریا بووە گۆڕەپانی ململانێیەکی نێودەوڵەتی، کە تاوەکو ئێستاش یەکلایی نەبوەتەوە، چونکە لە بنەڕەتدا ئەوەی پێی دەگوترا بەهاری عەرەبی، هەوڵێکی رۆژئاواییەکان، بە تایبەتی ئەمریکاییەکان لە پێناو رووخاندنی ئەو رژێمانەی لە رووسیاوە نزیک بوون، یاخود دەکەوتنە قوڵایی ستراتیژی رووسەکان!

گۆڕانکاریەکان بەردەوام بوو تا لە ساڵی (2014) لەرێگای ئۆکرانیاوە هەوڵیاندا دەروازەی ئەوروپاو دەریای رەش و، لە رێگای سوریاشەوە کاریان لەسەر ئەوە دەکرد دەروازەی دەریای سپی ناوەڕاست بە رووی رووسەکان دابخەن، واتە هەوڵی دروستکردنی ئیمپراتۆریایەکی ئۆراسی لای رووسەکان لە گۆڕنێن!، لە بەختی خراپی ئەمریکاییەکان، رووسەکان لە دوای ساڵی (2000) کەوتبوونەوە خۆیان و کاریان لەسەر چاک بوونەوەو هەڵسانەوە دەکرد، بۆیە لە ساڵی (2014) لە رێگای سەربازیەوە نیمچە دورگەی قرمیان بە خۆیانەوە لکاند، بەمەش دەروازەی دەریای رەشیان پاراست و لە رێگای پشتگیری رژێمی سوریاش پێگەکانی

خۆیان لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە شێوەیەک بەهێز کردەوە، کە زۆرجاران هەوڵدەدەن تاک لایەنەو بە بێ رەزامەندی ئەمریکاییەکان، بە پشتگیری تورکیاو ئێران، مەسەلەی سوریا چارەسەر بکەن، وەک ئەوهەولانەی بەم دواییە لە سوچی دایان!.

چەقبەستنی گۆڕانکاریەکان نەگەیشتن بەهیچ رێکەوتنێک لە نێوان ئەمریکاو رۆژهەڵات ، روس و چین و ئێران و تەنانەت هەندێک حار هیندستانیش، بۆتە سۆنگەی ئەوەی ململانێکان بەرەو ئەوروپا شۆڕبێتەوە، بە تایبەتی دوو زلهێزی ئەوروپی (ئەڵمانیاو فەرەنسا)، کە قووڵایی ستراتیژی خۆیان لەگەڵ روسیا دەبیننەوە! (ستالین) سەرۆکی یەکێتی سۆڤیەت لەماوەی جەنگی دووەمی جیهان پێی لەسەر ئەوە دادەگرت، کە یەکێک لەو هەڵانەی لە جەنگی دوەمی جیهاندا کردیان، ئەوەبوو رێگەیاندا ئینگلیزەکان (هیتلەر) بکەن بە دوژمنی ئەوان، لە کاتێکدا زۆر خاڵی هاوبەش لە نێوان روسیاو ئەڵمانیادا هەبوو، بۆیە پێی وابوو دەبوایە ئەوان هاوپەیمانیەتیان لەگەڵ ئەڵمانیادا ببەستایە!.

لە راستیدا جگە لە لایەنی جیۆپۆلەتیکی، دیارە ئەمریکاییەکان لە ماوەی هەردوو جەنگی جیهانیدا هۆکاری سەرەکی بوون بۆ دۆڕاندنی ئەلمانەکان، چونکە بە هاتنی ئەمریکاییەکان هاوسەنگی هیز لەبەرژەوەندی هاوپەیمانان گۆڕدار، کە لەکۆتایدا بوە هۆی دابەشکردن بە کۆلۆنیاکردنی ئەڵمانیا، ئەم دۆخە بۆ ئەڵمانیا بەردەوام بوو تا رووخانی یەکیتی سۆڤیەت، کە ئەمە دەرفەتی یەکگرتنەوەی بۆ هەردوو ئەڵمانیا هینایە پێشەوە، بەم چەشنە دیواری بەرلین روخاو شتێک نەکا بەناوی ئەلمانیای رۆژهەڵات و رۆژئاوا، ئەم دۆحە زۆر لە یەکێتی ئەڵمانیا نزیک بوو، کە لە

ساڵی (1871) لە کۆشکی ئاوێنەکان، لە کۆشکی ئەلیزێ ڕاگەیەنرا، بەمەش ئەڵمانیا بوە زلهیزێکی ئەورووپی کەوتە داوای شوێنێک لەبەر هەتاو، ئەو پڕۆژانەی ئەڵمانیا لە ڕۆژهەڵات پێی هەڵسا، لەوانە پڕۆژەی هێڵی ئاسنی بەغدا-بەرلین، وەک هەندێک توێژەر ناوی دەنێن، تارماییەک بوو بۆ جەنگی یەکەمی جیهانی.

یەکگرتنەوەی هەردوو بەشی ئەڵمانیا هەمدیس ئەلمانیای کردەوە بە گەورەترین زلهێزی ئەورووپی و لەسەر سەرکردایەتیکردنی ئەروپا بوو بە رکابەری فەرەنسا، بەم چەشنە لە پاڵ گۆڕانەکانی ئاسیا و باشوری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، گۆڕهانکاریەکانی ئەورووپاش بوو بە فشارێک بۆ سیستەمی تاک جەمسەری ئەمریکی، کە (جۆرج بوشی باوک) لە ساڵی (1991) ڕایگەیاند، ئەمەش یەکێک لەو هۆکارانەیە ، کە دوای ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، گۆڕانکاریەکان ڕاستەوخۆ بەرەو ئەورووپا بپەڕێتەوە، کە خۆی لە بنەڕەتدا بەدەم کۆمەڵێک قەیران دەیناڵاند، لەوانە مەسەلەی کۆچ بەری نایاسایی و کەم بوونەوەی ژمارەی دانیشتوان و گۆڕانی هاوسەنگی تەمەنەکان لە بەرژەوەندی تەمەنی پیر، کە ئەروپای کرد بە دەوڵەتێکی پیر!، ئەمە سەرباری ئەوەی ئەو یاسانەی دەریانکرد بە هۆی باش بوونی باری گوزەران، بەهۆی زیاد بوونی کۆچ بەران و سوود وەرگتن لە هەمان ئەو مافانە، ئابوری ئەو وڵاتانە دووچاری ماندوو بوون هاتوە.

خۆپیشاندانەکانی فەرەنسا وادێتە بەرچاو و وا وێنا دەکرێت، کە وا هۆکارەکەی زیادکردنی نرخی سووتەمەنیە، بەڵام ئەگەر بەوردی لێی وردبیەوە، زیادکردنی نرخی سووتەمەنیەکە لە ڕووداوی خۆسووتاندنەکەی (بوعزیز) لە تونس دەچێت، بۆیە دەبینین هەرچەندە

حکومەتی فەرەنسا بڕیاری بەرزرکردنەوەی نرخی سووتەمەنی هەڵپەسارد، بەڵام خۆپیشاندانەکان بەردەوامن، ئێستا فەرنسا بە شێوەیەک لە شێوەکان ئەمریکا بەوە تاوانبار دەستی لەو ڕووداوانە هەیە، بەڵام ئەوەی جێگای سەرنجە بەشی زۆری خۆپیشاندەرە هێلەگ زەردەکان چەپەکانن، کە ئەوانە زیاتر لە رووسیاوە نزیکن!!! ئەگەری ئەوە ئەو گۆڕانکاریانە بپەڕێتەوە ئەڵمانیاش، بە تایبەتیش ئەگەر ئەوەمان زانی ، کە تاوەکو ئێستا کۆمەڵگای ئەڵمانیا لە رووی ئابوری و مرۆییەوە هاوسەنگ نەبوەوە تا ئێستا جیاوازی لەنێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوا هەیە، بەشی رۆژئاوا تا ئێستا لە ژێر کاریگەریەکانی سۆڤیەتی پێشو و رووسیای ئێستا دەرنەچووە، هەر بۆ نمونە زۆربەی ئەو بەرپرسانەی، کە خەڵکی ئەڵمانیای رۆژهەڵات بوونە، زیاتر کاریان لە نزیک بوونەوەو بەهێزکردنی پەیوەندیەکانیان لەگەڵ رووسیا دروست کردووە. بۆیە وایدەبینم، کە ڕووداوەکانی فەرەنسا سەرەتای پایزێکی ئەورووپیە، هەرچەندە پەڕیوەتەوە بەلجیکا، بەڵام گریمانی پەڕینەوەی ئەڵمانیا، گۆرانکاریەکان بەهێزترو ترسناکتر دەکات، ئەگەر بێتوو ئەوەمان هینایە بەرچاو کەوا هەردوو جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم سەرەتاکانی لە ئەوروپا بوو.

2019\12\8

## کورد لەبەردەم مەترسیەکی گەورەو دەرفەتێکی مەزندا

بە کوشتنی قاسمی سلێمانی ، ئەمریکا هێڵی سووری خۆی ڕاگەیاند، ئەگەرچی ئەم ڕاگەیاندنە زۆر درەنگ بوو، ئەو گۆڕانکاریە مەترسیدارانەی دوای ڕاگەیاندنی سیستەمی نوێی جیهان لە قەوقازو ئاسیای ناوەڕاست و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست روویدا، هەرلە مەسەلەی مۆڵداڤیاوە تا دەگاتە تاجیکستان و چەچان و دواتر جۆرجیاو پاشان ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە کۆتایشدا ئۆکرانیا سوریا، هەمووی بە شێوەیەک لە شێوەکان تاقیکردنەوەی ئیرادەی ئەمریکابوو، بە هۆی دیارنەکردن و روون نەبوونی هێڵی سووری ئەمریکا بۆ سەربەرژەوەندیەکانی، چ هێزە گەورەکان، وەکو روسیا، چ هێزە هەرێمیەکان وەکو تورکیاو ئێران، توانیان هەژموونی خۆیان فراوان بکەن تا ئەو ڕادەیەی روسیا توانی پێگەی سەربازی خۆی لە دەریای ڕەش و دەریای سپی ناوەڕاست بەهێزبکاتەوە. تورکیا دەستیوەردایە سوریاو ئێراق و قوبرس و پاشان لە دەریای سوور پەڕیەوەو بەرەو ئەفریقا بەڕێکەوت، لەسەر هەمان ئەو پانتاییە جوگرافیەی دەوڵەتی عوسمانی پێکدەهێنا بە فراوانی چالاکانە کەوتۆتە جوولە. ئێران سەرکەوتنی بەدەست هێنا لە دروستکردنی نیوکەوانەیی شیعی و بە تەنیا ئێراق و سوریاو لوبنانی بەیەکەوە نەبەستەوە، بەڵکو پەڕیەوە بۆ یەمەنیش، هەوڵیدا کەنداویش بە شێوەیەکی کردەیی ئابڵوقە بدات !.

بێگومان ئەم سەرکەوتنانە هەمووی لەسەر حیسابی کشانە دواوەی هەژموونی جیهانی ئەمریکا بوو، تا گەیشتە ئەو رادەیەی لە سوریا پاشەکشە بکات و خەریکە لە ئێراقیش دەریدەپەڕێنن، بەمەش سیستەمی تاکجەمسەری ئەمریکی بەکۆتا دێت سیستەمێکی تری جیهانی دێتە بەرهەم، کە رێک لە شێوەی سیستەمی هاوسەنگی هێزی بەر لەجەنگی یەکەمی جیهانی دەچێت، نەحشەی سیاسی ناوچەکە لە زۆر رووەوە لە نەخشەی سیاسی بەر لەجەنگ دەچێت، کە بووە سۆنگەی بەرهەمهێنانی جینۆسایدی چەندین نەتەوە، لەوانەش کوردو ئەرمەن. لە ساڵی (1915) کوردو ئەرمەنەکان بە یاسای بەزۆر راگواستن(قانون التهجير القسری) لە ماڵی خۆیان هەڵکەنران و رەشەکوژ کران، دەربارەی جینۆسایدی ئەرمەن ئاشکرایەو ئەرمەنەکان توانیویانە ئەو تاوانە فەرامۆش نەکەن و بەنێودەوڵەتی بکەن، هەرچی کورد، کە هەر لەو ساڵەی جینۆسایدی ئەرمەنەکانی تیادا کرا، نزیکەی 700 هەزار کوردیش لەسەر دەستی عوسمانیەکان رەشەکوژ کرا، نەک هەر ئەو بابەتەی فەرامۆش کرد بەڵکو تا ئێستا توێژەران و رۆشنبیرانی کوردیش کارێکی ئەوتۆیان لەسەر نەکردووە!.

لەگەڵ هەوڵدان بۆ دەرکردنی ئەمریکا لە ئێراق، ئەمریکا لە رێگای کوشتنی قاسمی سولەیمانیەوە کارتی سووری خۆی بەرز کردەوە، بەرامبەر ئەوەش ئێران بنکەکانی ئەمریکای لە عێراق و هەریمی کوردستان مووشەک باران کرد، ئەگەری ئەوە هەیە دوای ئەوە هێزەکانی سەر بەئێران لە

عێراق و سوریاو لوبنان پەلاماری بنکەکانی ئەمریکاو ئیسرائیل بدەن!، کە ئەمە سەرەتای قۆناغیکی نوێیەو شەڕەکە لە شەڕی بەوەکالەتی هێزی ناوخۆیی، واتە ئەو گرووپ و حیزبانەی تاوەکو ئێستا بە وەکالەتی هیزە سەرەکیەکانی ململانێکە لەسەر گۆڕەپانەکە دەجەنگان، دەگوازرێتەوە بۆ شەڕێکی تێکەڵە لەو گرووپانەو دەوڵەتە هەرێمیەکان، ئەمەش قۆناغێکی مەترسیدارتر لەشەڕ دێنێتە ئارا!. زۆر لەوانەی لەسەر ئەم بابەتە دەنووسن و داخێون پێیان وایە، کە ئیدی لێرەدا یاریەکە دەوەستێنرێت، لەبەرئەوەی هەردوولا یەکسانن لە یاریەکەو دۆخەکە هێوردەبێتەوە!. بەڵام بە پێچەوانەوە، مووشەک بارانکردنی ئەمریکا، واتای تێکشکاندنی هەژموونی ئەمریکایە لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست و هەموو جیهان، بیگومان ئەمریکاش خۆی بۆ ئەو پەرچەکردارەی ئێران ئامادە کردووە. بۆیە دەبێت چاوەڕوانی وەڵامێکی ئێجگار توندی ئەمریکا بین بۆ ئێران، کە هاوکات پەیامێکیش بێت بۆ رووسیا. لەو لێدانە نوێیەی ئەمریکا رەنگ بێت هەندێک چەکی زۆ پێشکەوتوو بەکاربێت، کە تا ئێستا بەکارنەهێنراون، ئەمەش لە پێناو نیشاندانی ئاستی پێشکەوتنی چەکی ئەمریکی و نیشاندانی ئەو بۆشاییەی لە نێوان پێشکەوتنەکانی ئەمریکاو رکابەرەکانیدا هەیە، واتە نیشاندانی هێزی بازووی ئەمریکا. لێدانێکی لەم شێوەش ناوچەکە بەرەو فەورزای زیاتر دەبات، رەنگ بێت ببێتە سەرەتایەک بۆ هەڵوەشانەوەی کۆی نەخشەی سیاسی ناوچەکە، چونکە ئەمە دوا دەرفەتە بۆ ئەمریکا، ئەگەر بیەوێت پارێزگاری لە سیستەمی تاکجەمسەری بکات و باڵی رکابەرە

جیهانی و هەرێمیەکانی بکات!. لەبەرئەوەی یەکێک لە ئامانجەکانی پەرچەکرداری ئێران، راستە بۆ رازیکردنی رای گشتی ناوخۆی ئێران و پاراستنی ئاوی رووی ئەو دەوڵەتەیە، بەلام ستراتیژی بنەڕەتی ئەو هەنگاوە راکێشانی ئەمریکایە بۆ ناوشەڕێکی گەورەو بەمەبەستی داڕماندنی ئابووری ئەمریکاو تیکشکاندنیەتی لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست. بۆیە هەرگیز لەبەرژەوەندی ئەمریکادا نیە ئەو شەڕە درێژە بخایەنێت و دەبێت یا بەخێرایی یەکلایی بکاتەوە، یاخود خۆی نەخاتە شەڕەوە و ئاشتیانە ناوچەکە جێبهێڵێت. ئەمەش دەوەستێتە سەر ئەو چەکانەی بە شێوەیەکی راستەقینە لەبەردەست ئەمریکادایە. لە هەردوو حالەتدا کوردستان دەکەوێتە بەردەم هەڕەشەیەکی گەورە، هەڕەشەی تۆڵەکردنەوەی ئەو دەوڵەتانەی دەوروبەر، کە کورد بە چاوساغ و هاوپەیمانی ئەمریکا تێدەگەن، هاوکات مەترسی ئەوەی، کە وا پێدەچێت کوردستان دەکرێتە بەشێکی لەو تەختە شەترەنجەی جیهان، کە ئەو هاوکێشانەی لەسەر یەکلایی دەکرێتەوە. بۆیە لەو ململانێیە جیهانیە ئاڵۆزەدا، لە دوو ئەگەر زیاتر چاوەڕوان ناکرێت، یاخود ئەمریکا شکست دێنێت و دەکشێتە دوواوە، کە ئەمە رەنگ بێت یەکێک لە ئەگەرە بەهێزەکان بێت، ئەو کاتە کورد دەکەوێتە بەر رەحمەتی هێزە هەرێمایەتیەکان (عێراق و سوریاو ئێران و تورکیا) و رقی 28 ساڵەی خۆیانی پێدەردەکەن!. یا لەگەڵ لێدانی ئێران نەخشەی سیاسی ناوچەکە هەڵدەوەشێتەوە و نەخشەی جیهانگەرایی ئەمریکی پراکتیزە دەکرێت، کە دەبوایە هەر لە دوای رووخانی بلۆکی

ڕۆژهەڵاتەوە ئەمریکا جێبەجێی بکردبوایە، لە هاتنە دی ئەو ئەگەرە کورد دەکەوێتە قۆناغێکی نوێوەو دەرفەتێکی زێڕینی بۆ دەڕەخسێت، لەبەرئەوەی هەمیشە سەرکەوتوانی شەڕ ئەو نەخشەیە جێبەجێ دەکەن، کە شەڕیان لە پێناو کردووە!.

لەدۆخێکی وا ئاڵۆزدا کورد چی بکات باشە؟ ڕاستەقینەیەکی ئێجگار تاڵ هەیە، ئەویش ئەوەیە ئەگەر کوردیش لە دەرگای شەڕ نەدات، بە داخەوە شەڕ لە دەرگای کورد دەدات، بێدەستی کوردیش، بە هۆی پێگەی جیۆپۆلەتیکی کوردستانەوە، کوردستان وەکو قۆناغی جەنگی یەکەمی جیهانی دەبێتە گۆڕەپانی سەرەکی ئەم شەڕە، بۆیە دەبێت لەسەر چەند ئاستێکدا خۆی بۆ ئامادە بکات. لەسەر ئاستی سەربازی نابێت کورد بچێتە پاڵ هیچ لایەنێکەوە تا ئەو کاتەی شەڕەکە لە قۆناغەکانی کۆتایی نزیک دەبێتەوەو ئاسۆی لایەنی سەرکەوتوو بەدیار دەکەوێت، ئەو کاتە دەتوانێت باشتر بڕیار بدات. بۆئەوەی لە لایەک خۆی لە مالوێرانی و قوربانی بوون بپارێزێت، لە لایەکی تر بتوانێت دەرفەتەکە بقۆزیتەوەو لە دەستی نەدات، لە هەموو حالەتەکاندا دەبێت کورد ڕەچاوی ئەوە بکات، کە نابێت خۆی بکاتە دوژمنی هەموو گەلانی ناوچەکەو بیانووی ئەوەیان بداتە دەست، کە لە بچووکترین دەرفەتدا جینۆسایدی بکەن، چونکە تاوەک ئێستا ڕووی نهێنی هاوسەنگی هیزەکان دیارنیەو نابێت شەڕی ڕاگەیاندن و دەروونی وای لێبکات خوێندنەوەی هەڵە بۆ تواناکانی لایەنە ڕکابەرەکان بکات و لەسەر ئەو بنەمایە بڕیار بدات!. قۆناغەکە زۆر لەوە

مەترسیداترە، کە بیری لیدەکرێتەوە دەرئەنجامەکەی زۆر کارەسات ئامێزتر دەبێت. دەبێت کورد لەو قۆناغەدا زیاتر بایەخ بە خۆریکخستنەوەی ناومالّی خۆی و خۆ ئامادەکردن بۆ ئەگەرو پێشهاتەکان بدات، تاوەکو لەگەلّ بە دەرکەوتنی ئاسۆی ئەنجامی ئەو ململانێیە جیهانیە بتوانێت بە شێوەیەکی سیستەماتیک و کارامە تواناکانی خۆی بخاتە گەڕ، بە پێچەوانەی ئەمە ئەگەری ئەوە هەیە هەمان سیناریۆی دوای جەنگی یەکەمی جیهان دووبارە ببێتەوە و کوردستان بۆ جارێکی تر و بە شێوەیەکی مەترسیدارتر دابەشبکرێتەوە. بزاڤی کوردیش وەکو دوای ئەو جەنگە بە شپرزەیی و بە پەرتەوازەیی دەست پێبکاتەوە، ئەگەر بوار بۆ دەستپێکردنەوەی هەولّێکی لەم جۆرە بمێنێت!!!.

2020\1\8

## دابەشکردنی ئێراق بۆ سێ پارچە یاخود چوار پارچە؟!

زۆر لەوانەی دەربارەی ئەگەرەکانی دابەش بوونی ئێراق دەنووسن و داخێون، هەمیشە باس لە دابەش بوونی ئەو وڵاتە دەکەن لەسەر بنەمای ئەتنیکی و ئاینزایی، واتە دابەشکردنی بۆ سێ پارچە، کوردو شیعەو سوننە!. ئەم بیرکردنەوە تەقلیدیە بە کەسانی ئاسایی نەوەستاوە و تەنانەت زۆر لە هزرمەندو سیاسەتمەداری گەورەش لەو چوارچێوەیەدا بیردەکەنەوە!. لە راستیدا  ئەم بیرۆکەیە بنەمایە لەسەر تێڕوانینیکێ سەرپێ و نەبوونی شارەزاییەکی قووڵ دەربارەی ئێراق و پشت بە شێوازی دامەزراندنی ئێراق دەبەستێت لەسەر بنەمای هاوکێشەی (کورد + سوننە = شیعە). لەبەرئەوەی شیعە لە ئێراقدا زۆرینە پێکدەهێنن و بە تەنیا و لە رێگای دیموکراتیەوە دەتوانن بە بێکوردو سوننە ئەو بڕیارانەی بیانەوێت بیدەن، دوا دانیشتنی پەرلەمانی ئێراق و بڕیاردان لەسەر دەرکردنی هێزەکانی ئەمریکا لە ئێراق راستی ئەم بۆچوونە دەسەلمێنێت.

بۆ شیکردنەوەی ئەم بۆچوونە بەرلەهەموو شتێک پێویستە ئاماژە بە هۆکارەکانی دابەشکردنی ئێراق بکرێت،  کە نەگونجان و نەبوونی کەلتووری بەیەکەوە ژیان و یەکتر قبووڵکردنە، ئەمە سەرباری جیاوازی قووڵایی ستراتیژی هەریەک لەو پێکهاتانە، کە بۆتە سۆنگەی دەستتێوەردانی هەرێمی و بەرژەوەندی زۆر دەوڵەتی لەم ناوچەیە

چڕکردۆتەوە!. سوننە بۆ ماوەی هەشتا ساڵ حوکمی ئێراقی کرد، کوردو شیعە لەو ماوەیەدا سەرکوت کران، دوای رووخانی رژێمی سەدام شیعە هەموو وڵاتەکەی وابەستەی ئێران کرد و کوردو سوننەی پشتگوێخست!. لەبەرئەوەی لە بنەڕەتدا ئێراق هێندەی لەسەر پاراستنی بەرژەوەندی زلهێزەکانی ئەو کاتە دروستکراوە، هێندە رەچاوی سەقامگیری و بەیەکەوە ژیانی خەڵکەکەی نەکراوە. واتە ئێراق لە بنەڕەتدا لەسەر بنەمایەکی پووچ بوونیاتکراوەو ئەوەی لەسەر پووچیش بوونیات بنرێت هەمیشە پووچ دەردەچێت. لەگەڵ ئەو پووچیەشدا دابەشکردنی ئێراق کارێکی وا ئاسان نیەو پەیوەندی بە مەنزومەیەکی هەرێمی و جیهانیەوە هەیە. ئەگەر گریمانی ئەوە بکەین ئەو مەنزومەیەش گۆڕانکاری بەسەر داهات و ئەو دەرفەتەی هێنایە پێشەوە، ئەوا دابەشکردنی ئێراق لەسەر بنەمای سێ پارچە سەرکەوتن بە دەست ناهێنێت، چونکە دەوڵەتی شیعەکان دوو هێندەی دەوڵەتی کوردو سوننە دەبێت و هەمیشە هەوڵی لرف کردنیان دەکات. چونکە ئەو دوو پارچە بە بە بەشێک لەخۆی دەزانێت و هەمیشە هەوڵی گەڕانەوەیان دەدات!. بە لایەنی کەم لە قۆناغی سەرەتایی دابەشکردنەکە، ئەگەر بێتوو دابەشکردنەکە کۆگیر نەبێت و دەوڵەتانی تری هەرێمەکەش، وەکو ( تورکیاو ئێران و سوریا ) نەگرێتەوە!.

بۆیە لە پێناو هێنانەدی سەقامگیری دەبێت شیعەکانیش بکرێن بە دوو پارچە، لەبەرئەوەی لە بنەڕەتدا ئەوان لەسەر بنەمای یەکەکەی دوو بەقەدەر کوردو سوننە هاوسەنگیان پێکراوە، واتە (کورد + سوننە =

شیعە). ئەگەر بمانەوێت دابەشکردنە هاوسەنگ بێت دەبێت هاوکێشەکە بەم شێوەیەی خوارەوە دابرێژرێتەوە (کورد + سوننە + شیعە +شیعە= سەقامگیری)، چونکە شیعەکانیش لەناوخۆیاندا کێشەیان هەیەو بە شێک بۆ قووڵایی عەرەبی دەگەڕێنەوەو بەشەکەی تریشیان بۆ قووڵایی فارسی!.
بۆیە باشترین چارەسەر دابەشکردنی ئێراقە بۆ چوار پارچە، ناوەڕاست و باشوور بکرێت بە دوو پارچە بەغداشیان لەگەڵ بێت، کوردو سوننەکانیش هەریەکەی لە ناوچەی خۆی. ئەگەر ئەوەش هاتنە دی ئاستەنگ بوو، ئەوا دەکرێت بەغدا وەکو ئێستا بە سەنتەر بمێنێتەوە پارچەکانی تریش لەسەر بنەمای کۆنفیدراڵی رێککەوتنێک ئەنجام بدەن!. یاخود بەغداش بە تەنیا لەسەر شێوەی دەوڵەتانی کەنداو بکرێت بە دەوڵەتێکی سەربەخۆ، ئەو کاتە ئێراق دەبێت بۆ پێنج پارچە دابەش بکرێت!. هەرچەندە لە هەموو حالەتەکاندا ئەم پارچەکردنە بە بێ قوربانیدانی زۆر نایەتە بەرهەم و لە رووی جیۆپۆلەتیکشەوە دەروازەی دەریای ئەو ناوچەیە (شاری بەسرە) دەخاتە بەردەستی شیعەکان، ئەمەش بە شێوەیەک لە شێوەکان کاریگەری لەسەر زیادکردنی هەژموونی هەرێمی ئێران دەبێت!.

2020\1\13

## لە چاوەڕوانی جەولەیەکی تری شەڕ لە رۆژئاوای کوردستان

سەرباری گرژی و ئاڵۆزیەکانی نێوان سوریاو تورکیاو بوونی کۆمەڵێک کێشە لە نێوانیاندا، هەوڵەکانیان بەردەوامە بۆ لێدان و نەهێشتنی، یاخود بچووک کردنەوەی ئەزموونی رۆژئاوای کورستان. ئەوەی جێگای داخە لەم دوو ساڵەی دوایدا ئەم دوو دەوڵەتە بە هەماهەنگی نهێنی و ناڕاستەوخۆ توانیان سەرکەوتنی گەورە بە دەست بێنن و ناوچەیەکی زۆری ستراتیژی و گرنگ لە دەست کورد دەربهێنن، هەر لە عەفرینەوە بگرە تا دەگاتە گرێ سپی و سەریکانی، ئەمە سەرباری ئەوەی هێزەکانی رژێمی سوریا لەرێگای فشاری روسیاو تورکیاو بەناوی رێکەوتنەوە گەڕایەوە زۆر شوینی ستراتیژی لە رۆژئاوا، لەوانە شاری تەبقە و بەشێکی تر لەو ناوچە سنووریانەی لە ژێر دەستی یەکینەکانی پارساتنی گەلدایە. بەمەش زۆر کارتی جیۆپۆلەتیکی گرنگیان لە دەست کورد دەرهێنا. دیارە دۆخەکە بەمەندە ناوەستێت و لە ژێر سەرپەرشتی راستەوخۆی روسیا خەریکە شەڕەکە گەورەتر دەکرێت و دەیانەوێت لە رێگای لێدانی کوردەوە، ئەمریکا بە یەکجاری لە سوریا دەربکەن!.

راستە کورد لە رۆژاوا لە دۆخەکە گەیشتووەو لەگەڵ رژیمی سوریا لە دانوستاندایە، وەک وەزیری دەرەوەی روسیا سێرگی لاڤرۆڤ بەم دواییە رایگەیاند دانوستانەکانی نێوان کوردو دیمەشق پێشوەچوونی باشی

بەخۆیەوە بینیوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کۆبوونەوەی بەرپرسانی ئەمنی نیوان هەردوو وڵات لە ژێر سەرپەرشتی روسیا بەردەوامە، دوا کۆبوونەوەشیان چەند رۆژێک لەمەوبەر لە نێوان هاکان ڤیدان سەرۆکی دەزگای میتی تورکی و عەلی مەملوک سەرۆکی بیرۆی ئاسایشی سوریا بوو لە مۆسکۆ، کە پێدەچێت لە کۆبوونەوە ترسناکەکانی لوتکەی دەزگا ئەمنیەکانی نێوان ئەو دوو دەوڵەتە بێت!. چونکە ئەم کۆبوونەوە لە کاتێکدا بوو، کە مۆسکۆ لە ریگای تەواو بوونی پرۆژەی جۆگەی تورکی (السیل الترکی) و کۆبوونەوەی لوتکەی نێوان سەرۆکی روسیا پوتین و ئەردۆگانی سەرۆکی تورکیا، کە هاوکات بوو لەگەڵ ئەوەی ئێران بنکەکانی ئەمریکای لە ئێراق و هەرێمی کوردستان مووشەک باران کرد، سەرۆکی تورکیا دەست بەردانی کۆمەڵێک مەسەلە بووبێت، بە تایبەتی لە ئەدلەب، بەرامبەر دووبارە دەستکردنەوەی بۆ لێدانی رۆژئاوای کوردستان!. کەواتە هەمدیس گەلەکۆمەییەکی هەرێمی بە سەرپەرشتی روسیا لە ئارادایە بۆ لێدانی رۆژئاوای کوردستان. وەک هەوڵێکیش بۆ فریودانی رای گششتی دنیا باس لە مەسەلەی دانوستانی نیوان کوردو دیمەشق دەکرێت، کە هەموو ئامارژەکان بۆ ئەوە دەچن ئەو دانوستانانە دانوستانی تەکتیکین و روسیا جگە لە هەندێک مافی سەرەتایی وەک مافی رۆشنبیری هیچ شتێکی تری بۆ کورد پێ نیە!. بۆیە یەکەم هەوڵ دوای گەڕانەوەی ئەدلب بۆ ژێر دەسەڵاتی رژێمی سوریا، ئەگەری ئەوە هەیە دانوستان وەک فشارێک بەکاربهێنرێت بۆ داماڵینی چەک لە دەست هێزە کوردیەکان، دیارە ئەمەش

وەک بیانگەیەک دەبێت بۆ دەستپێکردنەوەی جەولەیەکی تری شەڕ. ئەمجارەیان تورکیا لە باکوورەوەو سوریا لە خوارەوە هێرش دەکەن، لە ئەگەری هاتنە دی ئەو سیناریۆیە دەبێت چاوەڕوانی هەڵوێستی ئەمریکا بکەین، کە جێگای داخە پێدەچێت ئەمریکا پەردەیەک بەسەر رۆڵی خۆی لە رۆژهەڵاتی ناوەراست دابدات و بگەڕێتەوە هەمان ئەو شوێنانەی، کە بەر لە رووخانی بلۆکی رۆژهەڵات تیایدابوو!.

بە شێوەیەکی گشتی دۆخەکە دەوەستێتە سەر هەڵوێستی ئەمریکاو رۆژئاوا، بۆ ئەوەی ئەو هەڵوێستەش لاواز بکرێت، یەکێک لە ئەگەرەکان ئەوەیە پلانی هیرش کردن بۆ سەر رۆژئاوای کوردستان دوا بخرێت بۆ کاتی هەڵبژاردنەکانی سەرۆکی ئەمریکا و خەریک بوونی ئەمریکا بە هەڵبژاردنەکان بقۆزرێتەوە. بۆیە پێویستە کورد لە رۆژئاوا لەوە ئاگاداربێت، کە لە چاوەڕوانی شەرێکی چارەنووس ئامێزدایە پێویستە بەزاناییەوە مامەڵە لەگەڵ کارتەکانی بەردەستی بکات و تا بۆی دەکریت خۆی لە چوونە ناو شەڕێکی لەو شێوەیە بپارێزێت، لەو قۆناغە ئاڵۆزەدا بە تەنیا مانەوەی هێزە کوردیەکان و ئەو دەستکەوتانەی بە دەستیان هێناوە، بە سەرکەوتنێکی گەورە هەژمار دەکرێت.

2015\1\15

## کاریگەری مەترسیداری زاراوە گشتگیرەکان لەسەر کۆمەڵگا

## رەخنەیەک لە شێوازی رەخنەگرتن لە هەرێمی کوردستان

یەکێک لە دیاردە مەترسیدارەکانی هەرێمی کوردستان، دیاردەی بەکارهێنانی چەمک و زاراوەکانە بە شێوەیەکی گشتگیر و بە بێ رەچاوکردنی دۆخی تایبەتی و پەنجە لەسەر دانانی ئەو بابەتەی، کە رەخنەگرەکان دەیانەوێت بیخەنە بەر تیغی رەخنەکانیان و شرۆڤەی بکەن. ئەم گشتیگیریە لە بنەڕەتدا لە دوو سەرچاوە هەڵدەقوولێت. یەکەمیان نەزانین و نەبوونی هوشیاری و زانیاری تەواوە لای رەخنەگر دەربارەی ئەو بابەتەی لەسەری دەنووسێت، دووەمیان نەبوونی بوێری پێویستە بۆ دەستدانان لەسەر کێشەکان و خۆدزینەوەیە لە بەرپرسیاریەتی یاسایی، ئەمە سەرباری ئەوەی زۆر جاران قەڵەمە بەناو رەخنەگرەکان فرۆشراون لە بەرژەوەندی لایەنێک و بە ئامانجێکی سیاسی ئەم کارە قێزەونە دەکەن!. کە ئەمە دەرئەنجامی زۆر مەترسیداری لێدەکەوێتەوەو ئەرکی رەخنەو رەخنە گرتن پێچەوانە دەکاتەوە، واتە لە جیاتی بەرەوپێشبردن و نیشانکردنی کەم و کورپیەکان، کۆمەڵگا دووچاری پەرتەوازەیی بێ متمانەییەکی تەواو دەکات بە هەموو کایەیەکی کۆمەڵگا، واتە ئومێدی گۆڕانکاری و هێنانەدی گۆڕانکاری پێویست لە نێوکۆمەڵگا نەک بە تەنیا لاواز دەکات، بگرە سەرکوتی دەکات و تا رادەی نەمان نایهێڵێت. ئەمەش

به پلەی یەکەم لەبەرژەوەندی ئەو دەسەڵاتەیە، کە رەخنەی لێدەگرێت و دژی کۆمەڵگا بەگشتی و هەموو نووزەیەکی چاکسازیە لەنێو کۆمەڵگادا بە شێوەیەکی تایبەتی!.

ناشیرینکردن و دزێوکردنی هەموو کایەکانی کۆمەڵگا رەشبینیەکی وا دروست دەکات، تاکەکان بەرەو سەرگەردانی و بێباوەڕی دەبات، ئەمە وا دەکات کۆکردنەوەو ئاڕاستەکردنی خەڵک بۆ ئەنجامدانی هەر گۆڕانکاریەک کارێکی ئاستەنگ و ئاسان نەبێت. کاتێک تۆ دەنووسی بۆ نمونە هەموو دادوەرانی کوردستان نا دادپەروەرن، هەموو دکتۆرەکانی کوردستان بازرگانن، هەموو مامۆستاکانی زانکۆ نەزان و نەخوێندەوارن، هەموو فەرمانبەرەکان بەرتیل خۆرو دزن، هەمووحزبیەک پیاوی خەڵکی ترەو هەموو .... هەموو... واتای هیچ پانتاییەکت بۆ ئەو دادوەرو پزیشک و مامۆستای زانکۆو فەرمانبەرو کەسانی حزبی وا نەهێشتەوە، کە تاوەکو ئێستا شەوو رۆژ بەیەکەوە دەبەستنەوە بۆ ئەوەی خزمەتی میللەتەکەی خۆیان بکەن و لەو پێناوەشدا روبەڕووی چەندین ململانێی سەخت و دژایەتیکردن و بێبەها کردن بوونەتەوە!. ناکرێت هەموو دادوەرەکانی کوردستان، هەموو مامۆستاکان ... هەموو دکتۆرەکان.... هەموو .. هەموو بەیەک چاو سەیر بکرێت، دادوەری وا هەیە پیشەکەی خۆی لەسەر هەڵوێستەکانی داناوەو لەکاریان لاداوە، یاخود دووریان خستۆتەوە لەبەرئەوەی ئامادە نەبووە نا دادپەروەری قبووڵ بکات، پزیشکی وا هەیە

ئامادە بووە نەک خۆبەخشانە کار بۆ هەژارەکان بکات، بگرە داودەرمانەکشیان لەسەر ئەرکی خۆی بۆ دابین بکات!.

ئەندازیاری وا بەڕێز لەم کوردستانە هەبووەو هەیە بەرتیلی زۆر گەورەیان داوەتێ و هەڕەشەی زۆریان لێکردووە بۆ ئەوەی پڕۆژەیەکی سەقەت لە بەڵێندەر وەربگرێت و چاو لەکەم و کوڕیەکان بپۆشێت، نە بەرتیل فریوی داوەو نەهەڕەشەش چۆکی پێداداوە. ناکرێت ئەندازیارێک و ... دادوەرێک .. دکتۆرێک و فەرمانبەرێک و .... هتد لەم چەشنە، کە باری گرانی کۆمەڵگاو راگرتنی ئێستا لەسەر شانی ئەوانەدایە، وەک هاوپیشە گەندەڵ و چرووکەکانیان سەیر بکرێت!. ئەو روانگە گشتگیریە لە پەنای رەخنەگرتن لە دەسەڵات، لە بنەڕەتدا رەخنەگرتن نیە لە دەسەڵات بەڵکو رووسپیکردنەوەو پاشەل خاوێنکردنەوەی دەسەڵاتە!. ئەم خوێندنەوە سەقەتە ئەو دەستەواژەیە بەرهەم دەهێنێت، کە ئێستا لە کۆمەڵگای کوردی باوەو بە داخەوە زۆر لە خەڵکی رۆشنبیرو دڵسۆزییش بەکاریدەهێنن، کە دەڵێت:" ئەو دەسەڵاتە پڕ بە پێستی ئەو میللەتەیە"، کە بە داخەوە ئەمە نەک هەر راست نیە، بەڵکو تاوانێکیشە بەرامبەر کۆمەڵگای کوردی دەکرێت.

خەڵک چی نەما نەیکات، ئەوە ئەو سیاسەتمەدارو حزبە بەکرێگیراوانەن، کە بەناوی دەسەڵات و ئۆپۆزسیۆنەوە بازرگانی بە خەونەکانی خەڵک دەکەن و خەڵک دەکەنە قوربانی و قوربانیدانەکانیان بێبەها دەکەن و لە پێناو بەرژەوەندیە کەسی و بنەماڵەییەکانی خۆیان

بەكاریدەهێنن!. ناپرسن بۆچی لەبەردەم پەرلەمانی كوردستان تەنیا چەند كەسێكی كەم و چەند دەم و چاوێكی دووبارە بووەوە هەمیشە نارەزایەتی دەردەبڕن و خەڵك هەمووی خۆ دوورە پەرێز دەگرێت!!!؟. یەكێك لە هۆیە سەرەكیەكانی ئەمە ئەو تەڕو وشك بەیەكەوە سووتاندنەیە، كە هیچ متمانەیەكی لای خەڵك نەهێشتووە. خەڵكی كوردستان لە پەنای وڵاتپارێزی چیما بۆ پارتی... بۆ یەكێتی... بۆ گۆڕان ... بۆ ئیسلامیەكان و چەپەكان نەكات!؟ ئەوە خەڵك بوو كەمتەرخەم بوو یاخود ئەو حزبانە بوون خەونەكانی خەڵكیان لە پێناو گیرفانی خۆیان بەكارهێناو سواری سەرملی خەونەكانی خەڵك بوون!؟.

هەرگیز راست نیە لە چاوی چەند حزبێكی ستۆك و چەند سیاسەتمەدارێكی بێبەهاو چەند رەخنەگرێكی بەكرێگیراو كۆی كۆمەڵگا هەڵسەنگێنیت و سفری بكەیتەوە!. تۆ كە وەك چالاكوانێك دەچیتە بەردەم پەرلەمانێك، كە خۆت داوات كردووە خەڵك بەشداری هەڵبژاردنەكان نەكات، كە خۆت دڵنیای زۆرینەی خەڵك بەشداری هەڵبژاردنەكانی نەكردووەو مەهزەلەترین هەڵبژاردن بووە لە مێژووی هەرێمی كوردستان و دڵنیای ئەو پەرلەمانە هیچ نوێنەرایەتی خەڵكی كوردستان ناكات ، كەچی دواتر هەر خۆت دەچیتە بەردەم ئەو پەرلەمانەو دەنگ بەرز دەكەیتەوەو داوای لێدەكەیت بە ئەركی مێژوویی خۆی هەڵسێت. تۆزێك بە هێمنی بیر بكەوە و لە خۆت بپرسە، ئایا لێرەدا كێشەكە لە هۆتدایە یا لەخەڵكە!. لە راستیدا كێشەكە لەوەدانیە خەڵك

بێدەنگە، بەلکو کێشەکە لەوەدایە تۆ نازانی چیت دەوێت و داوای نوێنەرایەتی کردنی خەڵک لە پەرلەمانێک دەکەیت، کە خۆت دڵنیای ئەو پەرلەمانە هەرگیز ناتوانێت نوینەرایەتی خەڵک بکات و ئەو چاکسازییەی دەیکات لە دێوجامەیەک زیاتر نیە بۆ فریودانی خەڵک و رای گشتی خەڵکی کوردستان!. ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە ئەو حیزبە ستۆکانەی وەک نەزانانە، یاخود خۆفریودەرانە داوای چاکسازیان لێدەکەیت، لە کاتێکدا چاکسازی راسیتەقینە ئەوەیە، کە ئەو هێزانە بخرێنە بەردەم دادگاکان و رەوانەی زبڵدانی مێژوو بکرێن، بخرێنە سفری دوای فاریزەو بیر لە قۆناغی دوای ئەوانە بکرێتەوە!.

لەجیاتی ئەوەی هەموو بەهاکانی کۆمەڵگای کوردی سووک بکرێت و رەش و سپی بەیەکەوە بسووتێنرێت، با وردبینانە تر بیربکەینەوەو لە بنەماکانی هزرو ئامانجەکانی رەخنە تێبگەین. تکا دەکەم و هیودارم چیتر نووسەرو رەخنەگرە راستەقینەکانی کوردستان بەم شیوە گشتگیریە نەنووسن و خەڵکی کوردستان و دەسەڵاتێکی وا گەندەڵ و زەمەن بەسەرچوو نەخەنە یەک تای تەرازووەوە، چونکە ئەگەر هەموو خەڵک بەو گشتیگیریە بێت، کە باسی دەکەن، ئیدی دەسەڵات رەنگدانەوەی ئەو خەڵکە دەبێت و لێشی زیاد دەبێت، کە ئەمەش لە بنەڕەتدا راست نیە و تاوەکو ئێستا کۆمەڵگای کوردی، کە تا ئەو رادەیەک توانیویەتی خۆی بپارێزێت بە هۆی ئەو توانا دڵسۆزانەیە، کە لەدەرەوەی حزبەکان بە شیوەیەکی پیشەییانە کاردەکەن و شێلگیرانەو بەرپرسانە خزمەتی گەل

ولاَتەکەی خۆیان دەکەن. لە هەموو دەزگایەک لە دەزگاکانی هەرێم، کە دەزگای نیشتیمانین و ئەو حزبانە داگیریان کردووە، ئەگەر ئەو جۆرە خەڵکانەیان لیدەربهێنێت، تەنیا ئەو گەندەڵ و حزبیە چاو برسیانە دەمێننەوە، کە بەردەوام خەریکی شەڕکردن و ملشکاندنی یەکترن لە پیناو پۆست و پارەدا. بۆیە دەبێت خالێک لە دوای ئەو شێوازە لە رەخنەگرتن دابنرێت و سەرەتایەکی نوێ دەستپێبکرێت، کە لە خزمەتی خەڵکی کوردستاندابێت.

2020\1\16

## مەسەلەی خانەنشینی و پرۆفیسۆرێکی زانکۆ

یەکێک لە مامۆستا بەڕێزەکانی زانکۆی سەلاحەدین، کە سالی رابردوو کۆچی دوایی کردو کۆمەڵێک حەسرەتی لەگەڵ خۆی بردە ژێر گڵ. ئاستی زانستی پرۆفیسۆر بوو، 48 ساڵ خزمەتی هەبوو، زۆربەی یاساناس و ماف پەروەرو دکتۆرو پارێزەرەکانی ئەگەر نەڵێم هەموو کوردستان، هەموو هەولێر لە ژێر دەستی ئەو خوێندیان و قوتابی ئەو بوون، بە 2.5 دوو ملوێن و نیو خانەشین کرا!. بێگومان بە دەیان نمونەی تری ئەو مامۆستا بەڕێزە هەیە، کەچی کابرایەک دێنن و چەندین ساڵ بەناوی کوردایەتیەوە خیانەتی لەو میللەتە کردووە، ناوی پلە باڵای لێدەنێن و بە چەند قاتی ئەو پرۆفیسۆرە بەڕێزە خانەنشینی دەکەن!.

پەرلەمانتارێک، کادیرێکی حزبی ، کە پێشتر تا توانای هەبوو خزمەتی بەعسی کرد، دواتر خۆی منداڵەکانی بوونە پارتی یاخود یەکێتی و هەر هەموویان بە پلە باڵا خانەنشین کران، یاخود دەکرێن، کە رەنگ بێت جگە لە زیان هیچی تریان بۆ وڵات و نیشتیمان نەبوو بێت، ئایا ئەو لینگەقووچ کردنەوەی پێگەکانی کۆمەڵگاو بینینی شتەکان بەپێچەوانەوە، رەنگدانەوەی ئاستی بیر کردنەوەی دەسەڵاتی سیاسی نیە لە هەرێمی کوردستان؟ یاخود سووککردنی مرۆڤە پایەبەرزەکانی نێوکۆمەڵگا نیە لە لایەن ئەو پایە نزمانەی جلی بەرپرس و سیاسەتمەدارو سەرکردەیان لەبەر

کردووە!؟. یاخود لە کۆتایدا جێبەجێکردنی ئەجێندایەکی دەرەکیە بۆ تێکشکاندن و چرووک کردنی هەموو بەهاکانی ئەو ئەو کۆمەڵگایە!.

تێبینی1: مەسەلەی خانەنشینەکەم وەک نمونە هێنایەوە لەبەر ئەوەی ئێستا قسە لەسەر ئەو بابەتە زۆر دەکرێت، ئەگینا ئەو بێرێزی و بێبایەخکردنە هەموو کایەکانی ژیانی کۆمەڵگای کوردی گرتۆتەوەو زۆر زانایانە کاری لەسەر دەکرێت!.

تێبینی2: بۆ ئەوەی بگەیتە پلەی پرۆفیسۆری دەبێت دوای وەرگرتنی دکتۆرا 4 ساڵ خزمەتت هەبێت و بەلایەنی کەم 3 توێژینەوەت لە زانکۆیەکی ئەکادیمی بڵاوکرابێتەوە، ئینجا دەینێرنە لیژنەی پسپۆڕو لەم وڵاتە یەک دوو ساڵی دەوێت، ئەگەر توێژینەوەکانت بە زۆرباشە و باشە هاتەوە دەبیە پرۆفیسۆری یاریدەدر. دوای ئەوە دەبێت لەو بەروارەوە 6 ساڵی تر خزمەت بکەیت و بە لایەنی کەم 6 توێژینەوەی ئەکادیمیی پێشکەش بکەیت، کە لە گۆڤارە ئەکادیمیەکان بڵاوکرابێتەوە یاخود فەرمانی بڵاوکردنەوەی وەرگیرابێت و لێژنەو بینەو بەردە، دەبێت بە لایەنی کەم 3 توێژینەوە لەو شەش توێژینەوەیە ڕەسەن بێت، ئینجا دەبێتە پرۆفیسۆر، ئەمە سەرباری 16 خوێندنی سەرەتایی و ئامادەیی و زانکۆ، ئەگەر هیچ ساڵێکیش نەمێنیەوە هەموو ساڵێک بەسەرکەوتوویی دەرچوو بێت. واتە 26 ساڵی ڕێک لە خوێندن و کارکردنی بەردەوام، ئەگەر هیچ دوانەکەوتبێت!. بێگومان ئێستا لە هەرێم ئەو حزبەکان ئەو پلە زانستیانەشیان وەکو هەموو شتەکانی تر سووک کردووە!.

2020\1\22

## گرنگ نیە خانەنشینیەکەت وەردەگری یاخود وەریناگری!!!

بەرلەهەمووشتێک دوا هەڵبژاردنی هەریمی کوردستان، دابڕانێکی یەکلایکەرەوە بوو لە نێوان خەلک و حزبەکانی کوردستان، بە دەسەڵات و ئۆپۆزسیۆنەوە، لەبەرئەوەی ڕێژەی بەشداربوونی خەڵک بە ئاستێک بوو، کە بە هەموو پێوەرەکان دەبوایە هەڵبژاردن دووبارە بکرێتەوە، یاخود دوا بخرێت و هەوڵی ئەوە بدرێت هێزی نوێ و دەم و چاوی نوێ بخرێتە ناو ئەو ململانێیەی هەڵبژاردنەوە. لەسەر ئاستی کاندیدەکانیش، دیارە بە بەراورد بە خولەکانی پێشووتر، بە تایبەتیش خولەکانی سەرەتایی و دوای راپەڕین، لاوازترین خولە.چ لەسەر ئاستی ئەو توانایانەی لەناو پەرلەماندان، چ لەسەر ئەو شیوازی ئەو کارکردنەی، کە ئێستا لەناو پەرلەمان بەڕێوە دەچێت، بەروونی ئەوە نیشان دەدات پەرلەمان لەم خولەدا زیاتر لە هۆڵێک دەچێت بۆ نمایشی سیاسی و کەسی و ئەندامانی پەرلەمان تا رادەیەکی باش لە ئەرکەکان و دەرهاویشتەی ئەرکەکانی خۆیان تێنەگەیشتوون! . مەسەلەی رەتکردنەوەی خانەنشینی پەرلەمانتاری، کە بەم دواییە بۆتە مۆدێل، ئەم راستیە بە ئاسانی دەسەلمێنێت. پەرلەمان و ئەندامانی پەرلەمان دەبێت درک بەو راستیە بکەن، کە مەسەلەی قبووڵکردن یاخود قبووڵنەکردنی خانەنشینی مەسەلەیەکی کەسی نیە، کە تۆ لە پەرلەماندا دەنگت داو رێژەی خانە نشینیەکەت بەیاسایی کردو هەستیش دەکەیت، نادادپەروەریەک لە رێژەکەدا هەیە و

یاسایەکەت تێپەڕاند، ئیتر دوای ئەوە چ پێویست دەکات، یاخود چ بایەخی دەبێت تۆ خانەنشینی وەربگریت یاخود وەرینەگریت!؟

بۆیە دوای ئەوەی کەوا دەستتان بۆ ئەو یاسایە بەرزکردەوە، واتای ئەوەیە ئێوە ئەو دۆخەتان قبووڵکردو پێتان باش بوو، ئێستا کەس پۆستی بێبەها لە سوشیال میدیاکان بڵاونەکاتەوەو نامەی پاکانە نەنووسێت، چونکە بە دەست بەرزکردنەوەتان ئیرادەی خۆتان پیادەکرد و ئەم کارە بە کۆتا هات، لە کوردەواریدا بەم حالەتە دەڵێن عوزر لە قەباحەت خراپتر بوون!. مەسەلەکە تێپەڕاندنی خودی یاساکەو رەوایی دانە بەو نادایەروەریە، نەک ئەوەی تۆ خانەنشینی وەردەگریت یاخود نا، تکایە چیتر بەر لەخەلک خۆڵ مەکەنە چاوی خۆتانەوە!!!.

2020\1\23

## پرۆژەی یەکێتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست

پرۆژەیەک بۆ بەردەم سەرۆکی دەوڵەتە هەرێمیەکان (سەرۆک کۆماری تورکیا، سەرۆک کۆماری ئیسلامی ئێران، سەرۆک کۆماری عێراق، سەرۆک کۆماری سوریا)

بەڕێزان، ئێوە لە هەموو خەڵک باشتر ئاگادارن کەوا ناوچەکە بەرەو ئاڵۆزی و شەڕێکی وێرانکار ئاڕاستە دەکرێت. خەریکە ئاگرێک لەو ناوچەیە دادەگیرسێنرێت، کە تەڕو وشک بەیەکەوە دەسووتێنێت و هەموو نەتەوەو ئاین و ئاینزاکان لێی زەرەرمەند دەبن. رەنگ بێت ئەوانەی، کە ئێستا هێزیان لەبەردەستەو خۆیان بەهێزی هەرێمی و خاوەنی بڕیار دەزانن، لە هەمووان زەرەرمەندتر بن!. هیچ کەسێک لەم دۆخە سەرکەوتوو نابێت، وەک ئەوەی لە هەشتاکانی سەدەی بیستەم بۆ ماوەی هەشت ساڵ شەڕ لەنێوان عێراق و ئێران روویدا، کە درێژترین شەڕ بوو لەسەدەی بیستەم، هیچ لایەکیان تیادا سەرکەوتوو نەبوون، هەردوو گەلی عێراق و ئێران زیانی زۆری بەرکەوت و بە سەدان هەزار مرۆڤی بێتاوان لە پێناو هیچدا کوژران و ئابووری هەردوو وڵاتیش وێران کرا.

ئەو دۆخەی لە ئارادایە دەرئەنجامی ئەو قەیرانە گەورەیە کەوا سیستەمی جیهانی و خودی دەوڵەتی نەتەوەیی دووچاری هاتووە، کە هەردووکیان بەرهەمی سەرمایەداری رۆژئاوایین و دوورو نزیک پەیوەندیان

به بەرژەوەندیەکان و کەلتووری گەلانی رۆژهەڵاتەوە نیە. بۆیە لە جیاتی ئەوەی لە پێناو کۆمەڵێک پرەنسیپ، کە بۆ رۆژهەڵات غەوارەنو بەرهەمی ئاوەزێکی نامۆیە، هەموو دژی یەکتر بجەنگین، ، با هەوڵی ئاشتەوایی بدەین و لەسەر بنەمای ئاشتی و بەیەکەوە ژیان و سەرلەنوێ بونیاتنانی متمانە لەنێوان گەلانی ناوچە، کە بۆ سەدان ساڵە بەیەکەوە ژیاون. سیستەمێکی نوێی یەکێتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بونیات بنێین، کە بنەما بێت لەسەر بەیەکەوە ژیان و بەشداریکردنی یەکسانی گەلان لە بەڕێوەبردنی ئەو سیستەمەو دابینکردنی خۆشگوزەرانی بۆ هەموو تاکێکی ئەو ناوچەیە!.

چونکە ئاشکرایە، کە سیستەمی نوێی جیهانی، کە سیستەمێکی پوخت رۆژئاواییەو ئەو نەخشە سیاسیەی بۆ ناوچەکە داڕێژراوە، رەنگدانەوەی واقعی ئەو ناوچەیە نیەو ناتوانێت نوێنەرایەتیەکی راستەقینەی گەلانی بکات و لەسەر ئێسک و پرووسکی مرۆڤی ئەو ناوچەیە بونیاتنراوە، سیستەمی دەوڵەت نەتەوەش هەموو گەل و نەتەوەکانی ئەو ناوچەیەی کرد بە دوژمنی یەکتر. هیچ کامێک لەو دوو سیستەمە پیرۆز نین. دەوڵەتی نەتەوەیی نەک هەر پیرۆز نیە، بەڵکو ئامرازێکی قێزەونە زیاتر لە سەد ساڵە خەڵکی ئەو ناوچەیەی لەسەر شێوازێکی ناتەندروست پێگۆش دەکرێت. لە هەموو حالەتەکاندا هیچ قەوارەیەکی سیاسی پیرۆز نیە، ئەوەی پیرۆزە پرەنسیپەکانی بەیەکەوە ژیان و رێکخستنی بەرژەوەندیەکانە لەسەر بنەمای سوودمەند بوونی

هەمووان وەکو یەک. ئەمریکا دۆستی ئەو ناوچەیە نیە، ئەمریکا نەدۆستی ئەو دەوڵەتانەیە، کە لەو ناوچەیە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی دروست بوون، نە دۆستی ئەو نەتەوانەشە، کە هەر لەو قۆناغەدا لە دەوڵەت بێبەش کران و بەدرێژایی یەک سەدە خوێنیان لە پێناو دامەزراندنی دەوڵەت رشت و قوربانیان لە پێناو دا. ئەمریکاو ئەوروپا سۆنگەی هەموو نەهامەتی و شەڕو ئاژاوەو ناخۆشیەکانی ئەو ناوچەیەی ئێمەیە، پێشکەوتن و خۆشگوزەرانی ئەمریکاو ئەوروپا، لەسەر حسێبی بەدبەختی و دواکەوتوویی گەلانی ئێمەیە. لای رۆژئاواییەکان و ئەمریکیەکان مرۆڤی رۆژهەڵات جگە لە ئامڕازێک بۆ خزمەتکردنی ئەوان هیچی تر نیە.

روسیاش هەمان ئامانجی هەیە، دەیەوێت گەلانی ناوچەکە لە پێناو بەرژەوەندیەکانی خۆی بەکاربێنێت. لە راستەقینەدا هیچ هاوپەیمانیەتیەک لە نێوان روسەکان و دەوڵەتە هەرێمیەکان نیە و نایەتە ئارا، هەرچەندە لە رووی سیاسیەوە کاری بۆ بکەن و وای نیشان بدەن، لەبەرئەوەی روسیا لە پێناو هەڵسانەوەو بە جیهانی بوونەوەی هێزی خۆی کار دەکات!. لە ماوەی تەمەنی یەکێتی سۆڤیەتدا لە پەنای ئایدیۆلۆژیای مارکسی و ئێستاش لە پەنای پرۆەی ئۆراسیاوە دەیەوێت خەونە فراوانخوازیەکانی خۆیان بێنیتە دی. گەلانی ئەو ناوچەیە تەنیا ئامڕازێکن بۆ هێنانە دی ستراتیژیەتەکانی ئەو. هاوپەیمانی راستەقینەی گەلانی ئەو ناوچەیە هەر لەنێوان گەلانی ئەو ناوچەیە خۆیان دەبێت. بۆیە لە جیاتی ئەوەی بنەما لەسەر پرەنسیپەکانی رۆژئاواو بۆ پاراستنی دەوڵەتی نەتەوەیی هاوپەیمانی

هەرێمی لەنێوان خۆتان و دژی خۆتان، واتە دژی نەتەوەیەک هەزاران ساڵە لەوناوچەیە دەژی ئەنجام بدەن، با هاوپەیمانیەتیەکە شۆڕ بێتەوە بۆ نێو هەموو نەتەوەو گەلانی ناوچەکەو هەموو هێزەکانی ناوچەکە بخرێتە چوارچێوەی یەک ئامانجەوەو هیچ نەتەوەیەک بە دوژمن نەکرێت!. چونکە لە کۆتایدا ئەمە دەبێتە ئەو بۆشاییەی زلهێزە داگیرکەرەکان لێی بێنە ژوورەوەو سەقامگیری و ئاشتەوایی تێکبدەن.

دەبێت هێندە ئازایەتیمان هەبێت کەلتووری مێژووی ئەو دوو سەد ساڵەی رابردوو، کە بە بەرژەوەندی پرەنسیپە ژاراویەکانی رۆژئاوا گۆش کراوە، توورڕ هەڵبدەین و کار بۆ دروستکردنی قۆناغێکی نوێ بکەین، ئەمەش لە رێگای رزگاربوون لە سیستەمی دەوڵەت نەتەوەو گەڕانەوە بۆ هاوپەیمانیەتێکی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی، کە هەموو پێکهاتەکان لە خۆوە بگرێت و بەرژەوەندی هەمووان مسۆگەر بکات، واتە لە جیاتی پەرتەوازەیی، کار لەسەر دروستکردنی یەکیەتیەکی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بکەین. ئەمەش دەکرێت لەرێگای دامەزراندنی ئیدارەیەکی نامەرکەزی بێت و هاوپەیمانیەتیەک لەنێوان ئەو ئیدارانە دروست بکرێت تاوەکو لە کۆتاییدا وردە وردە جێگای دام و دەزگاکانی دەوڵەت بگرێتەوەو هەر نەتەوەی بە گوێرەی پێگەو ژمارەی دانیشتوانی خۆی بەشداری تیادا بکات، واتە میکانیزمێکی وا بدۆزرێتەوە، کە بەرژەوەندی هەموو لایەک مسۆگەر بکات، لەمەشدا دەتوانرێت سوود لە مێژووی بەر لە هاتنی مۆدێرنیتە بۆ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست وەربگیرێت و لەسەر بنەمایەکی هاوچەرخ

ڕێکبخرێتەوە. بۆ ئەوەی بە کەمترین زیان لەو قۆناغە دەربچین و گەلانی ناوچەکە نەبنە قوربانی گەورەی ئەو دۆخە نوێیەی لە ئارادایە، پێویستە دەست بەجێ یەکێتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دابمەزرێت، بەم چەشنە هیچ کێشەیەک بە ناوی کێشەی نەتەوەکان نامێنیت و ئەو قەوارە سیاسیە نوێیە زیاتر بنەما دەبێت لەسەر کۆمەڵێک پرەنسیپی مرۆڤایەتی، لەوانە ئاشتی و بەیەکەوە ژیان و خۆشگوزەرانی و مافی مرۆڤ بۆ هەمووان. تاوەکو یەکێتیەکی وا دروست نەکرێت ئەو ناوچەیە سەقامگیر نابێت و ناتوانێت بە ئاشتی بژیت، وەک ئەوەی لە ماوەی زیاتر لە سەد ساڵی رابردوو بینینمان. هەنگاونان بۆ دامەزراندنی ئەو یەکێتیە، هەرچەندە هەنگاوی بچووکیش بێت، لە ئایندەدا گەورە دەبێت، دەتوانێت هێزێکی جیهانی وا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دروست بکات، کە چیتر ڕێگا نەدات ئەو ناوچەیە بکرێتە پێگەی ململانێیەکان و لە پێناو بەرژەوەندی زلهێزەکانی تر سوتماک بکرێت.

2020\1\7

## ئایا شکستی تورکیا لەسوریا لەسەر حیسابی کورد دەبێت؟!

لە ماوەی رابردوودا تورکیا بە هەموو شێوەیەک هەوڵیدا رووداوەکانی سوریا بۆ هێنانەدی خەونی بونیاتنانەوەی عوسمانیزمی نوێ بەکاربهێنێت و ئەو ناوچە سنووریانە بگەڕێنێتەوە سەر خاکی وڵاتەکەی، بەتایبەتی ناوچەی حەلەب و ناوچە کوردیەکان، کە لەمیساقی میللی تورکیادا وەک بەشێک لە تورکیا هەژمار کراون، بۆ ئەم مەبەسەتەش هێزە ئیسلامیە توندڕەوەکانی وەکو بەرەی نوسرەی بەکارهێنا. لەم هەنگاوەدا تورکیا ئەوەی بە بیانوو دەهێنایەوە، کە ئەو کار بۆ پاراستنی سەروەری و یەکپارچەیی خاکی سوریا دەکات!. کە لە راستیدا نەخشەی جوڵانەوە سەربازیەکانی تورکیا ئەوە ڕووندەکاتەوە، کە تورکیا ئامانجی سەرەکی لە گرتنی ئەو ناوچانە لێدانی کوردو ئەو رێگایانە بوو، کە کوردیان بە دەریا دەبەستەوە. لەمەشدا سەرکەوتنێکی بەرچاوی بەدەستهێنا، لەرێگای قەڵغانی فوراتەوە توانی نزیکەی 776 کم 2 داگیربکات و دەست بکات بە جێبەجێکردنی پرۆسەی بە تورک کردن لەو ناوچانە، هاوکات شاری عەفرینی داگیر کردو لە ساڵی (2019) ناوچەکانی سەرێکانی و گرێ سپی داگیر کرد. ئەوەی جێگای سەرنجە لە سەرەتاکانی ساڵی (2020)ەوە، خەریکە هاوسەنگی هێز بەشێوەیەک لە سوریا دەگۆڕێت، کە رێسەکە لە تورکیا دەکاتەوە خوری و دەیخاتە گۆماوێ قەیرانێکی هەرێمی و

ناوخۆییەوە، ئەوەی تورکیا زیاتر لێی دەترسێت، تەقینەوەی ناوخۆی تورکیایە، یاخود دۆڕاندتی ئاکپارتیە لە هەڵبژاردنەکانی ئایندەو دادگایکردنی ئەردۆگان و دارودەستەکەیەتی بەهۆی ئەو شکستانەی وا خەریکە رووبەڕووی دەبێتەوە.

لەبەرئەوەی گۆڕانکاریەکانی ئەم دواییە لەبەرژەوەندی رژێمی سوریایەو خەریکە بە یارمەتی روسیا تەواوی ناوچەکان کۆنترۆڵ دەکاتەوە، کە ئەمەش واتای ئەوەیە سوپای سوریا لە عەفرین و جەرابلوس ئەو ناوچانەدا رووبەڕووی تورکیا دەبێتەوە. ئەگەر تورکیا پێداگری بکات لە مانەوەی لەو ناوچانە، ئەوە لە لایەک پێچەوانەی ئەو بیانووانە دەوەستێتەوە، کە پێشتر بۆ داگیرکردنیان بەکاریدەهێنا، لێدانی تیرۆر(مەبەستی کورد بوو) و پاراستنی یەکارچەیی سوریا، چونکە گەڕانەوەی سوپای سوریا، واتە گەڕانەوەی شەرعیەتی دەوڵەت و تورکیا هیچی بە دەستەوە نامێنێت، یاخود دەبێت رووبەڕووی سوپای سوریاو روسیا ببێتەوە. کە دیارە ئەمەش بۆ تورکیا کارێکی سەختە، هەرچەندە لەوانەیە لە هەڵوێستێکی لەم شێوەیەدا ئەمریکاو ناتۆ پاڵپشتی بکەن، بەڵام ئەو کاتە شەڕەکە لە شەڕی بە وەکالەت دەردەچێت و خودی دەوڵەتی تورکیا دەچێتە ناو شەڕەوە، واتە لە جیاتی سوریا ئەمجارەیان تورکیا دەبێتە گۆڕەپانی شەڕیکی دژوار، کە بێگومان تورکیا ئامادەیی ئەو شەڕەی تیانیەو دڵنیاشە شەڕێکی لەمجۆرە، سەرباری ئەوەی تووشی

شکستێکی سەربازی گەورەی دەکات، هاوکات وڵاتەکەش دابەش دەبێت و لەسەر نەخشە دەسڕێتەوە.

ئەگەر ئەوەش نەکات، ئەوە واتای ئەوەیە تورکیا بە ناچاری لەو شوێنانە دەکشیتەوە، کە داگیری کردوون، پاشان ئەمە وەک سەرکەوتنێک نیشانی خەڵکی خۆی دەدات، گوایە ڕێگای لە دابەشبوونی سوریا گرتووەو نەیهێشتووە ئەو وڵاتە دابەش بکرێت، دیارە گەلی تورکیاش، بە تایبەتیش ئۆپۆزسیۆنی تورکیا، کە بەردەوام لە زیادبوون و بەهێزبووندایە، ئەمەی بەسەر تێناپەڕێت. لێرەدا ئەگەری ئەوە هەیە، تورکیا هەوڵبدات شکستەکانی خۆی لەسەر حیسابی کورد راست بکاتەوە، ئەویش داواکردنە بۆ نەهێشتنی حاڵەتی دیفاکتۆی کورد لە رۆژئاوای کوردستان و نەهێشتنی هێزە کوردیەکانە، کە ئەمە سەرباری ئەوەی کارێکی ئاسان نیە، چونکە واپێدەچێت روسیا و ئەمریکاش دەربارەی پاراستنی دۆخێکی تایبەت لە رۆژئاوای کوردستان ڕێککەوتبن!. لەو حالەتەدا تورکیا وەک زەرەمەندی یەکەم لەو هاوکێشەیە دەردەچێت و ناچار دەبێت هەڵوێستی بەرامبەر مەسەلەی کورد بگۆڕێت و هەوڵی چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد بدات لە وڵاتەکەی خۆشیدا، کە دیارە ئەمەش کارێکی ئاسان نیە، بەڵام ئەگەر روسیاو سوریا ئەو سازشکردنە لەگەڵ تورکیا بکەن و هەوڵبدەن ئاوی رووی بپارێزن، ئەوە بێگومان مەسەلەی کورد لە رۆژئاوای کوردستان دەبێتە قوربانی یەکەم. ئەو گەمە کردنەی تورکیا لە ماوەی رابردوو لەسەر هەردوو پەتی روسی و ئەمریکی، رەنگ بێت دەرئەنجامەکەی بۆ تورکیا

پێچەوانە بشکێتەوە، چونکە پێگەی جیۆپۆلەتیکی تورکیا بۆ هەردوو دەوڵەت و تەنانەت بۆ سیاسەتی جیهانیش بایەخی ستراتیژی خۆی هەیە، ئەمریکاو روسیاش هەردوو لایان ئەو راستیە بە باشی دەزانن و درک بە مەترسیەکانی دەکەن، بۆیە ناچار دەبن هەردوو بەرەوەندیەکانیان لەو ناوچەیە رێکبخەن، ئەمەش واتای ئەوە دەبیت جۆرە نەرمیەک بەرامبەر مانەوەی دۆخی تایبەتی کورد لە سوریا بێتە ئاراوەو بەمەش تورکیا رووبەڕووی شکستێکی گەورە دەبێتەوە!.

2020\2\8

## مەترسیە گەورەکە گەیشتە بەردەم دەرگا!

گەڕانە دواوەی ئەمریکا لەسەر ئاستی جیهانی و بێبەهابوونی سۆفت پاوەری ئەمریکی، بووە سۆنگەی بەهێزبوونەوەی روسیاو ستراتیژیەتەکەی، کە ئەمە لە سوریا بە روونی بەرچاو دەکەوێت!. ئەوەی لە سوریا روودەدات بەهێزکردنەوەی رژێمی سوریاو بونیاتنانەوەی دەوڵەتی سوریایە، بە واتایەکی تر دەرکردنی ئەمریکایە لەو ناوچەیە، ئەگەرچی لە رووکەشدا جۆرە گرژیەک لەنێوان سوریاو تورکیادا هەیە، بەڵام ئەمە زیاتر بۆ فریودانی رای گشتی تورکیایە، ئەگینا لەبنەڕەتدا ئەوەی لەکاتی ئێستا لە سوریا، واتە لە ئەدلب و دەوروبەری حەلەب دەگوزەرێت، رێکەوتنێکە لەنێوان تورکیاو روسیاو ئێران و رژێمی سوریا. ئەو کشانە دواوەی هێزەکانی سەربەتورکیا ئەمڕۆ لەناوچەی حەلەب، واتای ئەوەیە ئەو چەند هەزار سەربازیەی تورکیا لەم رۆژانە بۆ ئەو شەڕەی برد، لە بنەڕەتدا بۆ شەڕێکی ترە، ئەویش لێدانی رۆژئاوای کوردستانە. پێدەچێت تورکیاو سوریا لەسەرئەوە رێککەوتبن، کە تورکیا ئەو ناوچانە بۆ هێزەکانی سوریا چۆل بکات و دواتر بەیەکەوە پەلاماری رۆژئاوا بدەن، ئەو لێدوانەی چەند رۆژێک لەمەوبەر جێگری وەزیری دەرەوەی سوریا دای، دەربارەی ئەوەی هیچ حالەتێکی دیفاکتۆ لە باکووری رۆژهەڵاتی سوریا قبووڵ ناکەن و دانی پیانانێن، جۆرە ئاماژەیەک بێت بۆ ئەو رێککەوتنە، ئەمەش ئەوە

ڕووندەکاتەوە، کە ئێمە لە چاوەڕوانی شەڕێکی مەترسیدارین لە ڕۆژئاوای کوردستان لەنێوان ڕژێمی سوریاو بە پاڵپشتی تورکیاو ئێران و روسیا دژی ڕۆژئاوای کوردستان، دەیانەوێت شکستی تورکیا لە سوریا بە تێکشکاندنی کوردو نەهێشتنی ئەزموونی ڕۆژئاوا پەردەپۆش بکەن.

لە راستیدا ئەمە مەترسی بە تەنیا بۆسەر ڕۆژئاوای کوردستان نیە، بەڵکو هەڕەشەیە بۆسەر هەموو پارچەکانی کوردستان، بە تایبەتی بۆ باشوور، لەکاتێکدا، کە حکومەتی نوێ پێکدەهێنرێت و هەموو ئاماژەکان بۆ ئەوە دەچن، کە ئەو حکومەتە لەژێر کاریگەری ئەو رێککەوتنە هەرێمیە دروست دەکرێت.

2020\2\17

## ڤایرۆسی بچووک، زانیاری گەورە دەدۆزێتەوە، کۆرۆنا وەک نمونە!

کۆرۆنا ئەو ڤاپرۆسە بچووکەیە، کە جیهانی سەرقاڵکردووە و وەک دەڵێن هەڕەشە لە مرۆڤایەتی دەکات و تەڕو وشک بەیەکەوە دەسووتێنێت، هەندێک دەڵێن دەرئەنجامی گوناهو لەڕێلادانە، واتە بە غەزەبی خوای تێدەگەن!. هەندێکی تروای بۆدەچن لە پیسخۆی چینیەکانەوە هاتووە، بەشێک بەشەڕی بایۆلۆژی ئەمریکای لەقەڵەم دەدەن دژی نەیارەکانی!، ئیدی هەرکەسێک چۆنی گەرەکەو بە مگێزی خۆی لێکیدەداتەوە، ئەو لێکدانەوانە لای ئێمە گرنگ نیە، ئەوەی گرنگ ئەوەیە کۆرۆنا راستەقینەیەکەو پێویستە وەک راستەقینەیەک مامەڵەی لەگەڵ بکەین. راستە کۆرۆنا ڤایرۆسێکی بچووکەو بەچاو نابینرێت، بەڵام زۆر داهێنانی گەورەی لە کۆمەڵگاکەمان ئاشکرا کرد، کە تاوەکو ئێستا وەکو پێویست درکمان پێنەکردووە، لەوانە:

1- کۆمەڵگای کوردی هەمووی دکتۆرە. واتە پزیشکە، لەو لایەنەوە پێش هەموو کۆمەڵگاکانی جیهان کەوتووە، لەبەرئەوەی ئەوەی هەڵسا بووە قسەکەرو شرۆڤەکارو چارەسەرساز دەربارەی ئەو پەتایەو گوێگر نەمایەوە، کەواتە کۆمەڵگای ئێمە پێویستی بە هوشیارکردنەوە نیە، چونکە خۆی لە هەموو کەس شارەزاترە. هەموو نووسەرە، شاعیرە، دکتۆرە، مەلایە، بێدینە، بەدینە، ... هتد

2- کۆرۆنا ئەوی ئاشکرا کرد، کۆمەڵگای ئێمە لە کوردستان ناژی، بەڵکو بەشی زۆری ئەهلی ولاتی نەجدو حیجازن، ئەگەر ئەوقاف دوای ئەو پەتایە دەرگای مزگەوتەکان بکاتەوە، هەمووی خەڵک دەبێتە وتارخوێن و پێشنوێژی خەڵک دەکات، کەسێک نامێنیتەوە لە دواوەی مەلاکان بوەستێت و نوێژیان لە دوا بکات، واتە پێشنوێژیش وەکو پلەی حزبەکان دەکەوێتە بواری ململانێ و ملشکاندنی ناشەرعیەوە. لەبەرئەوەی دەرگای کەعبە داخرا، نوێژکەرەکانی خۆیان بە پێچەوانەی پڕەنسیپەکانی ئاینی ئیسلام، کۆڵیان نەداو لە دەرەوەی مزگەوتەکان نوێژی بەجماعیان کرد!!!.

3- ئەو ڤایرۆسە بچووک و بێدەسەڵاتە!، ئەوەی بۆ روونکردینەوە، کەوا چ گەلێکی قارەمانین، لە هەموو دونیا لە ترسی ئەو ڤایرۆسە خەڵک خۆی لە کونجی ژووەرەوە ناوەوەو دەرگای لەسەر خۆی داخستووە، کەچی گەلی قارەمانی ئێمە، سەرباری رێنماییەکانی لایەنە پەیوەندیدارەکان، نوێژی هەینیشیان تێکەڵ بە سەیرانی رۆژانی هەینی کردو زیاترو توندتر قۆڵیان خستە قۆڵی یەکترو لە یەکنزیک بوونەوە، ئەمەش هەموو ئەو دمگۆیانە پووچەڵ دەکاتەوە، کە دەڵێن کورد نەیتوانی لەبەردەم چەند سەد چەکدارێکی رێکخراوی داعش خۆی بگرێت و رایانکرد!، چونکە لە بنەڕەتدا خەڵک بەرامبەر داعش راینەکرد، بەڵکو پێشوازیان لە میوانێکی ئازیزو درەنگ وەختکرد!.

4- لەرووی سیاسیەوە ئەو ڤایرۆسە ئەوەی بۆ روونکردینەوە، کە یەکێتی و پارتی بە پێچەوانەی ئەوەی بانگەشەی بۆ دەکەن، کەوا کار بۆ حکومەتێکی دیموکراسی و کۆمەڵگایەکی دیموکراسی دەکەن، کاریان

کردووە بۆ دروستکردنی هەرێمێکی ئیسلامی روپۆشکراو بە دیموکراسیەکی شێواو، لەمەشدا سەرکەوتنی هێندە گەورەیان بەدەستهیناوە، کە نە تالّیبان لە ئەفغانستان و نە رێکخراوی داعش لە دەوڵەتی ئێسلامی و نە قاعیدە ئەو سەرکەوتنەیان بەدەست نەهێناوە، بۆیە پێویستە دوای ئەو سەرکەوتنە ئەو دووحیزبە ناوەکانیان بگۆڕن و تەنانەت شێوازی جل و بەرگەکانیشیان بگۆڕن و سەرکردەکانیان لەم گۆڕانکاریەشدا وەک کاری هەمیشەییان ببنە پێشەنگ!.

بێگومان کۆرۆنا زۆر شتی تریشی بۆ ئاشکراکردین و بۆمان ئاشکرا دەکات، کە ئەگەر زیاتر بمێنێتەوەو وا زوو نەڕوات، هەرچەندە لەو بڕوایەدانیم وا بە ئاسانی وڵاتەکەی ئێمە جێبهێڵێت، چونکە لەهیچ شوێنیکی دونیا وەک کۆمەڵگای ئێمە پێشوازی لێنەکراوەو شوینی وەکو ئەو وڵاتە خۆشی بە دەست ناکەوێت، ئەگەرخوا تەمەن بدات دەیبینین و شتی زۆر زیاتر دەبینین!. کورد نالّێت تاسەر مابێت.... عاجباتیان دەبینی!.

2020\3\7

## لەپاڵ کۆرۆنا ئەمەش لەیاد مەکەن!.

مەسەلەی کۆرۆنا ئەمڕۆ بەشیکی گەورەی میدیاکانی جیهانی داپۆشیوە، بە دەیان ڤیدۆیۆ و هەواڵ و رینمایی بڵاودەکرێتەوە، دەوڵەتانی دونیا یەک لەدوای یەک رێگای خۆپارێزی دەگرنە بەر، هاتوچۆ لەگەڵ دەرەوەی خۆیان وەک هەنگاوی یەکەم و دوای ئەوە رەنگ بێت وەک هەنگاوی دووەم لە ناوەخۆش قەدەغە بکەن، واتە چوارچێوەی خۆپارێزیەکە رۆژ بەرۆژ بچووکتر دەبێتەوە و ئەگەر ئەو ڤایرۆسە بەردەوام بێت دەشێت چوارچێوەی خێزانیش تێپەڕێنێت!. خەڵک لە ئاسیاو ئەمریکاو ئەورپاو ... هتد، خۆیان بۆ کرەنتینای ماڵەوە ئامادە دەکەن، واتە خۆراک و کەل و پەلی پێویست دەکڕن، بۆئەوەی توانای مانەوەیان هەبێت لە ماڵەکانی خۆیان، ئەگەر بۆماوەیەکی کورتیش بێت!. ئەمەش واتای ئەوەیە کارکردن تا رادەیەکی باش دەوەستێت، بۆیە یەکێک لەو خاڵانەی، کە گفتوگۆی لەسەر دەکرێت داهاتی خەڵکە، چۆن ئەو خەڵکە کارنەکات و بژێوی ژیانی دابین بکرێت، ئەگەر بۆماوەیەکی کورتیش بێت!.

لێرەدا حکومەتەکات هەوڵدەدەن مووچەی کارمەندانی خۆیان دابین بکەن، کۆمپانیا تایبەتیەکان لە هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی رێگا چارەیەک، کە لەلایەک خۆپارێزیەکە لەخۆوە بگرێت و لە لایەکی تریش کارەکانیان بەردەوام بێت بۆ ئەوەی بتوانن کرێی کرێکارەکانیان دابین بکەن، ئەوەی

دەمێنێتەوە ئەو خەڵکە هەژارو چین و توێژەن، کە ڕۆژانە هێزی بازووی خۆیان دەفرۆشن و لەسەر شەقامەکان دەوەستن بۆ ئەوەی کاریان دەستبکەوێت، ئەوەی بە چەمکە گریکیەکەی پێی دەگوترێت پرۆلیتاریا!. ئەوانە بەهیچ شێوەیەک نەکەوتوونەتە بەرباس و تارادەیەک فەرامۆشکراون، لەکاتیکدا ئەوانەش مرۆڤن و پێویستیان بە خۆراک و خۆپارێزی هەیە، ئەوانەش مرۆڤن و حەزیان بەژیانەو پێویستە وەکو مرۆڤ ژیانێکی شایستە بژین، بۆیە دەبێت حکومەت بەشێوەیەکی گشتی و کۆمەڵگا بەشێوەیەکی تایبەتی ئاوڕ لەوانە بداتەوەو لە یادیان نەکات، پێویستە خەڵک ئەو ڤایرۆس و نەهامەتیە بقۆزێتەوە بۆ ئەوەی سەرلەنوێ پەیوەندیە ویژدانیەکانی خۆیان ڕێکبخەنەوە و ئاسوودەیی دەروونی و مرۆڤبووی خۆیان بسەلمێننەوە، کە بۆ ماوەیەکی زۆرە بە هۆی ئەو گۆڕانکاریە سیاسی و ئابوورییەی لە کوردستاندا هەیە لە قەیراندایە. تکا و داوا لە خەڵکی کوردستان دەکەم، کە هەرکەس لە راستی خۆی و بەگوێرەی توانای خۆی ئەو چینە و خەڵکی هەژار بەگشتی لە یاد نەکەن و دەستباریان بکەن، با ڤایرۆسی کۆرۆنا سەرباری مەترسیەکانی ببێتە سەرەتایەکی باش بۆ ئاشتەوایی کۆمەڵایەتی زیندووکردنەوەی گیانی یارمەتیدانی یەکتر، تکایە هەرکەس لەلای خۆیەوە و بەگوێرەی توانای خۆی دەستی هاریکاری بۆ دەوروبەرەکەی خۆی درێژ بکات و یارمەتی ئەو کەسانە بدات، کە پێویستیان بە یارمەتی هەیە، هیوادارم وڵاتەکەمان

بەسەلامەتی ئەو قۆناغەش وەکو قۆناغە ناخۆشەکانی تری ژیانی تێپەڕێنیت و بەردەوام ئاوەدان بێت.

2020\3\12

## لەپشتی کۆرۆناوە چی دەگوزەرێت؟

### خوێندنەوەیەک لەژێر رۆشنایی تیووری بیروباوەڕی شۆکی نۆمی کلاین

سەرەتا بەباشی دەزانم روحی ئەو تیوورە بۆ خوێنەران روونبکەمەوە، ئینجا شیکردنەوەکەی خۆم ئەنجام بدەم، (تیووری بیروباوەڕی شۆک و بەرزبوونەوەی سەرمایەداری کارەساتەکان)ی نۆمی کلاین باس لەوە دەکات، کە لەو سێ دەیەکەی دوایی، سەرمایەداری هەوڵدەدات کارەساتە سروشتیەکان بقۆزێتەوە، یاخود خۆی کارەسات دروست بکات، بەمەبەستی ترساندن و تۆقاندنی خەڵک لە رێگای شۆکی ئەو کارەساتانەوە، بەکارهێنانی ئەو ترس و تۆقاندنە بۆ نەهێشتنی هیچ ئیرادەیەک لای مرۆڤەکان و بۆئەوەی بە تەواوی تەسلیم بە ئیرادەی سەرمایەداری ببن، ئەو کاتە ئەویش ئەو گۆڕانکاریانە ئەنجام دەدات، کە پلانی بۆ داناوە. ئەمەش واتای ئەوەی دوای ئەو کارەساتانە سەرمایەداری هەوڵدەدات گۆڕانکاری ریشەیی لە کۆی سیستەمەکانی ناو کۆمەڵگاو دەرەوەی کۆمەڵگا دروست بکات، بە شێوەیەک باشتر خزمەت بە بەرژەوەندیەکانی ئەو بکات. کلاین زۆر نمونە دێنێتەوە، کە ئەو تیوورەی لەسەر پراکتیزە کراوە، لەوانە لێدانی ئێراق.

### هاتنی ڤایرۆسی کۆرۆنا

لەراستیدا هاتنی ڤایرۆسی کۆرۆنا لەکاتێکدا، کە ئەمریکا کەوتۆتە دووریانێک، یاخود دەبێت هەڵوێستیکی توند بگرێتەبەرو بەرگری لە سیستەمی تاکجەمسەری و باڵادەستی جیهانی خۆی بکات، کە لەلایەن

روسیاو چین و هاوپەیمانەکانیانەوە لێی دەکرێت، یاخود دەبێت تەسلیم بە ئیرادەی رکابەرەکانی بێت و مل بۆ سیستەمێکی نوێی جیهانی کەچ بکات و دەستبەرداری پێگەی جیهانی خۆی بێت، هەردوو حالەتیش بە بێگۆڕانکاری ریشەیی نایەتەدی، ئەمە وا دەکات، کە دڵنیابین لەوەی قۆناغی دوای کۆرۆنا زۆر جیاوازتر دەبێت لە قۆناغی بەر لە هاتنی!.

**گومانەکان لەکوێوە سەرچاوە دەگرن؟**

هاتنی کۆرۆنا کارەساتێکی سروشتی بێت، یاخود دروستکراو، هیچ لەوە ناگۆڕیت، کە ئەو بابەتە ئێستا رۆڵێکی گەورە لە سیستەمی جیهانی و لە سیاسەتی نێودەوڵەتیدا دەگێڕێت!. ئەگەر بە تەنیا شیکردنەوەی بۆ ئەو لێدوانە دژ بەیەکانە بکەین، کە دەربارەی ئەو ڤایرۆسەو چارەسەری ئەو پەتایە دەخرێتەروو، گومانەکان زۆر زیاتر دەبێت. بۆیە لە ژێر رۆشنایی تیووری شۆک دەتوانین بڵێین ئێستا ئەو کارەساتە لە لایەن سەرمایەداری جیهانیەوە بەکاردەهێنرێت بۆ هێنائارای گۆڕانکاری ریشەیی لەکۆی کایەکانی ژیان، تا ئێستا ئەو گومانانەو دەرهاویشتەکانی ئەو کاریگەریانە دەتوانین لە چەند خاڵێک کورتبکەینەوە:

1-شکستپێکهینانی سیستەمی لیبراڵی دیموکراسی رۆژئاوایی، کە بەرلەئێستا وەک نمونەی بەرزی سیستەمی سیاسی سەیر دەکراو لەرێگای میدیاکانەوە وەک باشترین سیستەم هەژمار دەکرا، کە مرۆڤایەتی پێی گەیشتبێت، بەهۆی کۆرۆناوە دەبینین ئەو سیستەمە کەوتۆتە پەلەقاژێ و ئەو دیوارانەی خۆی لە پەنا حەشاردابوو ئێستا لە داڕماندایەو وەک

ماشێنێکی ماتریالی رووت کەوتۆتە بەرچاوان، کە جگە لەسەرمایەو بەرژەوەندی سەرمایەدارەکان چاوی هیچی تر نابینێت، ئەو راستەقینە هەر لەگەڵ لەدایک بوونی ئەو سیستەمەدا لە ئارادا بووە، بەڵام لەهیچ قۆناغێکی مێژوویدا بەو شێوەیە رووی دەرنەکەتووە!. ئەورووپای پۆتۆپیای سەرزەوی، کە خەڵک لە ئاسیاو ئەفریقاو هەموو شوێنێکی دونیا سەرۆییان بە ژیان و ماڵی خۆیان دەکرد بۆ ئەوەی پێیبگەن، ئێستا ئامادە نیە رۆڵەکانی خۆی چارەسەر بکات و وەک پاکتاوکردنێکی رەگەزی، هەوڵدەدات لەرێگای مردنی ژمارەیەکی زۆر لە مرۆڤە بە تەمەنەکان قەیرانی ئابووری خۆی چارەسەر بکات!. دەتوانین بڵێین رۆڵەکانی خۆی داوەتە دەست قەزاو قەدەر!.

2- بەرامبەر ئەوە چین وەک زلهێزیکی مەزن کەوتۆتە بەرچاو، توانا مرۆیی ئابووریەکانی چین، بۆ نمونە دروستکردنی نەخۆشخانەیەکی 1000 قەرەوێلەیی تەنیا لە ماوەی دە رۆژدا پەیامێکی سیاسی ئێجگار گەورەی بە دنیا راگەیاند، ئەم پەیامە وایکردووە سەرۆکی ئەمریکا راشکاوانە چین بە بوونی ئەو ڤایرۆسە تۆمەتبار بکات و تەنانەت ناوی بنێت ڤایرۆسی چینی، کە دەکرێت لە ئایندەدا ئەمە وەک بیانگەیەک بەکاربهێنرێت بۆ فراوانکردنی بەرەکانی رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەو وڵاتە.

3- کردنی کۆرۆنا بە مەسەلەیەکی جیهانی و بەگەڕخستنی میدیا زەبەلاحەکان بۆ خزمەتی ئەو گەورە کردنە، هەمدیس گومانەکان لەسەر بەکارهێنانی ئەو ڤایرۆسە وەک شەڕێکی بایۆلۆژی چڕتر دەکاتەوە،

بەتایبەتیش ئەگەر بینیمان لەپاڵ ئەو گەورە کردنە کۆمەڵێک کرداری تر بەڕێوە دەچێت، کە سەرنجی خەڵکی لەسەر لادراوە، وەکو شەڕی بازرگانی، شەڕی نەوت، شەڕی ئەلیکترۆنی، شەڕی ئابووری، شەڕی سۆفت پاوەر..هتد، ئەمانە گومانەکە بەهێزتر دەکەن.

4- لە هەموو ئەمانە گوماناوی تر، لەپەنای گەورەکردنی مەسەلەی کۆرۆنا خەریکە ئاڵوگۆڕ بەهێزەکان دەکرێت، وەک ئەوەی بیانەوێت گۆڕەپانی شەڕی ئاییندە ئامادە بکەن، بۆ نمونە لەو ماوەیە ئەمریکا بەهێزترین هێزەکانی مارینزی خۆی، کە ناسراون بە هەڵۆ تۆقینەرەکان گواستەوە بۆ ئێراق، هەواڵی ئەوەش هەیە، کە بەهەزاران سەربازی ئەمریکی بەرەو ئەورووپا جوڵاوە، کە ئەمە مەترسیەکی راستەوخۆ لەسەر روسیا دروست دەکات!. ئێران کەوتۆتە داوی نەخۆشی و واسرۆ لاوازتر دەکرێت، کە هاوپەیمانێکی ستراتیژی و جیۆپۆلەتیکی روسیاو چینە، شەڕەکان لەئێراق لەنێوان لایەنگرانی ئێران هێزەکانی هاوپەیمانان و هاوپەیمانەکانیان چڕتر بۆتەوە، کۆریای باکوور لەو کاتەدا رۆکێتی بالیستی تاقیدەکاتەوە، بەریتانیا سەربازی یەدەگ بانگ دەکات بۆ ئەوەی رووبەڕووی کۆرۆنا ببێتەوە، ئەڵمانیاو فەرەنسا هێزەکانیان خستۆتە ئامادەباشیەوە!. ئەو هەموو گۆڕانکاریانە گومانی ئەوەمان لا زیاتر دروست دەکەن، کە مەسەلەی کارەساتی ڤایرۆسی کۆرۆنا کارەساتێکی دروستکراوبێت لە لایەن سەرمایەداری جیهانیەوە، بەمەبەستی هینانەدی گۆڕانکاری گەورە، کە یەکێک لەئەگەرەکانیش ئەوەیە بە پێچەوانەی بەرژەوەندیەکانی خودی

ڕۆژئاوا خۆی بشکێتەوە، چونکە هەموو جارێک ئاڕاستەی باکان بەمگێڕی کەشتیەوانەکان نابێت.

2020\3\22

## کۆرۆنا، یاخود بەهاری ئەمریکی و ئەورووپی

دوای ئەوەی جیهانی رۆژئاوا بە گشتی و ئەمریکا بە تایبەتی بە سەرکەوتوویی لەشەڕی سارد دەرچوو، ئەمریکا سیستەمی تاکجەمسەری راگەیاندو وەکو زۆر لە نووسەرە ئەمریکی و رۆژئاواییەکان خۆیان دەڵێن ئەمریکا بووە پۆلیسی جیهان، ئەم دۆخە بەردەوام بوو تا ساڵی (2000-2001) لەم دوو ساڵەدا زۆر گۆڕانکاری گرنگ لەسەر گۆڕەپانی سیاسەتی نێودەوڵەتی هاتە ئارا، رووداوەکەی سەپتەمبەرو لێدانی ئەمریکا، هاوکات هاتنی پوتینی سەرۆکی روسیا بۆ سەر دەسەڵات. رووداوی سەپتەمبەر سەرباری دەرهاویشتە سیاسی و ئابووریەکانی، بووە سەرەتای شەڕێکی جیهانی، کە بەشەڕی تیرۆر ناسراوەو سەرۆکی ئەمریکا راشکاوانە رایگەیاند ئەوەی لەگەڵ ئێمە نەبێت دژی ئێمەیە، کە ئەمە دەکرێت وەک سەرەتایەکیش بۆ کاڵبوونەوەی سیستەمی دیموکراسی لیبڕالی ئەمریکی لە قەڵەم بدەین. بەرامبەر ئەو دۆخەی ئەمریکا سەرۆکێکی بەهێز لە روسیا جڵەوی دەسەڵاتی گرتبوەوە دەست و خاوەنی خەونی نەک بە تەنیا زیندووکردنەوەی ئیمپراتۆریای روسی بوو، بگرە کار لەسەر بونیاتنانی ئیمپراتۆریای ئۆراسی دەکات.

لەو کاتەوە قۆناغێکی تر لە سیاسەتی دەرەوەی روسیا دەست پێدەکات، ئەویش بوونەوە بە زلهێزو گەڕانەوە بۆ سەر گۆرەپاتی سیاسەتی

نێدودەوڵەتی. شان بەشانی ئەمەش بیرۆستریکای چین دەستپێکردو ئەویش بەهێزەوە کەوتە بونیاتانی ئابوورەیکی ئۆراسی و جیهانی، بۆ رێگا گرتن لەم هەنگاوانە ئەمریکا سەرەتا ئەفغانستان (2002) و دواتریش ئیراقی لە ساڵی (2003) داگیرکرد، ئەمەش بە مەبەستی دروستکردنی نیوکەوانەیەک بوو لە سنوورەکانی باشوورەوە بۆ ئابلۆوقەدانی روسیاو بلۆککردنی بواری فراوانبوونی بەرەو رۆژهەڵات و ئاسیای ناوەڕاست، لە رێگای ناتۆشەوە هەوڵیدا لە ئەوروپای رۆژهەڵاتەوە ئابلۆوقەی رووسیا بدات و هاوکات دیوارێک لەنێوان چین و روسیا دروست بکات، بۆ رێگا گرتن لە هەر هاوپەیمانیەکی ئایندە، ئەو دۆخە بەردەوام بوو تاوەکو ساڵی (2014) ئەو ساڵەی نفوزی رۆژئاوا گەیشتە ئۆکرانیا، دەروازەی روسیا بەرەو ئەوروپا.

هاوکات لە ساڵی (2011) ئەو رووداوانە دەستپێکرد، کە بە بەهاری عەرەبی ناوزەد کراو لە ئەفەریقاوە، سەرەتا لە تونس دەستپێکردو پاشان لیبیاو روسیاشی گرتەوە، پاشان لە دەریای سوور پەڕیەوە بۆ سووریا، لەوێ چەقی بەست، وەک سەرۆکی روسیا راشکاوانە رایگەیاند:" رێگانادەین سوریا وەک لیبیای لێبێت". راستە بەهاری عەرەبی رەنگدانەوەی تووڕەی خەڵک بوو بەرامبەر ئەو رژێمە سیاسیانەی، کە ببونە بار بەسەر کۆمەڵگاکانیان، وەلێ لەبنەرەتدا هەنگاوێکی جیۆپۆلەتیکی مەترسیدار بوو بۆ خنکاندنی روسیا لە چوارچێوە جوگرافیە بەرتەسکەکەی خۆی، لەبەرئەوەی بەشێک لەو دەوڵەتانەی بەهاری عەرەبی

گرتیەوە وەک لیبیاو سوریا دەروازەی روسەکان بوو بۆسەر دەریای سپی ناوەڕاست، بەمەش مەترسی بۆ بەرژەوەندیەکانی روسیا دروست کرد لە هەردوو دەروازەی روسی بۆ سەر دەریای سپی ناوەڕاست (میسرو سوریا)، لەساڵی (2014) روسیا تەنگەتاو بو و بەشێوەیەکی سەربازی و لە رێگای ریفراندۆمێکی رووکەشەوە دەستی بەسەر نیمچە دورگەی کریم، دەروازەی روسیا بۆ سەر دەریای رەش و لەوێشەوە بۆ دەریای سپی ناوەڕاست گرتەوە، لە ساڵی (2015) بە شێوەیەکی سەربازی خۆی لە سوریا هەڵقورتاند. بەرامبەر ئەمەش سەرۆکی چین لە ساڵی (2013) دەستپێشخەری پشتێنەورێگای راگەیاند، کە بریتی بوو لە زیندووکردنەوەی رێگای ئاوریشمی کۆن بە شێوازێکی نوێ، ئەم دەستپێشخەریە بەهۆی ئابووری بەهێزی چینەوە سەرکەوتنێکی ئێجگار خێرایی بەدەستهێناو گەیشتە ئەو قۆناغەی چین لە رێگای هۆکارەکانی گواستنەوە (هێڵی شەمەندەفەر، فرۆکەخانە، رێگای دەریایی، رێگای دیجیتەڵی) ئەوروپاو ئاسیا بەیەکەوە ببەستێتەوە. لە هەموو ئەمانە ئەمریکا نەیتوانی هێڵی سووری خۆی دیاربکات و بەرگری لە هاوپەیمانەکانی بکات، ئەمە وایکرد (هێزی نەرمی ئەمریکی (soft power) لەسەر ئاستی جیهان دابەزێت و پێگەی ئەمریکا بگەڕیتەوە دواوە، لەساڵی (2019) روسیا و چین بەوەندە نەوەستان بگرە هەوڵیاندا ئەمریکا لە شوێنی زۆر ستراتیژی وەدەرنێن، لەوانە سوریاو ئێراق، ئەمەش بەشێوەیەک لەشێوەکان واتای دەرکردنی یەکجارەکی ئەمریکایە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

ئەگەر تەماشای ڕووداوەکانی دوای هاتنی کۆرۆنا بکەین، هەمان شێوازی بەهاری عەرەبی لەخۆوە گرتووە لە هەلتەکاندنی سیستەمی سیاسی ئەوروپی و ئەمریکی، ئێستا ئەو سیستەمە ئەوروپیانەی بۆ ماوەی سەد ساڵ یاریان بەچارەنووسی جیهان دەکردو چی خراپە نەما بە مرۆڤایەتی نەکەن، دەستەوەستانن و ڕۆژانە کارەساتەکەیان گەورەتر دەبێت، بەرامبەر ئەمەش، بەپێچەوانەی چەند ساڵێکی کەم بەر لەئێستا فڕۆکە فریاگوزاریەکانی چین و روسیا پەیتا پەیتا بەرەو دەوڵەتانی ئەوروپا و ئاسیا و ئەفریقا دەچن، بۆ گەیاندنی یارمەتی و کەرەستەو ئامێری تەندروستی!، کە ئەمە بە ئاشکرا گۆڕانی هاوسەنگی هێز لە سیستەمی جیهانی دەخاتە روو، ئەو ئەمریکایەی، کە پێشتر وەک پۆلیسی جیهان رەفتاری دەکردو خۆی لە هەموو کێشەکانی سەر زەمین هەلدەقورتاند، ئێستا خەریکە دەروەستی کێشە تەندروستی و ئابووریەکانی خۆی نایەت!.

ئەم دۆخە لە کۆتایدا لە دوو گریمانە زیاتر بەخۆیەوە هەڵناگرێت، یاخود دەبێت ئەمریکا و ئەوروپا هێزە سەربازیەکەی خۆی بخنەکار بۆ راستکردنەوەی هاوسەنگی هێز، کە بەهۆی بوونی چەکی کاولکار ئەم هەنگاوە مەترسیەکی زۆری هەیەو بە سەرەڕۆییەکی ئێجگار گەورە لە قەڵەم دەدرێت، یاخود دەبێت دان بەو گۆڕانەی هاوسەنگی هیزی جیهانی دابنێن و سیستەمی جیهانی لەگەڵ چین و روسیا بەشێوەیەک رێکبخەنەوە، کە لەگەڵ ئەو واقعە نوێیەدا بگونجێت، کە هاتۆتە ئارا!. هەرچەندە ئەمریکیەکان لەکاتی ئێستادا هەڕەشە دەکەن بە گرتنەبەری سیناریۆی

یەکەم، وەک وەزیری دەرەوەی ئەمریکا گوتی :" باکێشەی کۆرۆنا چارەسەر بکەین، دواتر هەڵوێستمان دەبێت بەرامبەر ئەوانەی هۆکار بووینە". بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەری جێبەجێکردنی ئەو سیناریۆیە زۆر لاوازە، چونکە ئەمریکا ئێستا لەهەمان ئەو قۆناعەدا دەژیت، کە یەکێتی سۆڤیەت لە کۆتایی هەشتاکانی سەدەی بیستەم تیایدا دەژیا، واتە خاوەنی تەرسانەیەکی هێزی تەقلیدی و ناتەقلیدی گەورەیە، وەلی هاوکات لەناوەوە خەریکە ئابووریەکەی دادەڕمێت، بۆیە دەبێت لە ئەمریکاش چاوەڕوانی گۆرباچۆڤێک بکەین، کە دان بەراستیەکان بنێت و ئەو هەنگاوە هەڵێنێت، کە پێویستە هەڵینێت، ئەگینا کۆی مرۆڤایەتی دووچاری کارەساتێکی ئێجگار گەورە دەبێتەوە.

2020\3\27

## جەنگی دووەمی جیهانی میدیایی

هەندێک پسپۆڕانی دەزگای هەواڵگری روسی، پێیان وایە جەنگی سارد، یەکەمین جەنگی جیهانی میدیایی بوو، کە ێوسەکان تیایدا شکستیان هێناو دۆڕاندیان. کەواتە لەسەردەمی شۆڕشی گەیاندندا، کە ئامڕازەکانی بڵاوکردنەوە پێشکەوتنێکی ئێجگار گەورەو سەرسوڕهێنەری بە خۆیەوە بینیوە، لەپاڵ چەکەکانی تر، میدیا بۆتە یەکێک لە چەکە گرنگ و یەکلاییەکەرەوەکانی جەنگەکان، بۆیە رۆژنامەنووس ئەوانەی کاری میدیایی دەکەن، دەبێت زۆر هوشیارانە مامەڵە بکات و خۆی وەکو سەربازێک ببینێت، کە لە بەرەیەکی گەورەی جەنگدایەو دەشێت زۆر جار بەهەڵە رووی چەکەکەی لە میللەتەکەی خۆی بکات!.

ئەگەر سەیری دۆخی میدیایی ئێستا بکەین، بە ئاسانی ئەوهەمان بۆ بەدیاردەکەوێت، کە ئێمە لەناوجەنگێکی جیهانی میدیایداین و ئەگەری ئەوەشی لێدەکەوێتەوە ببێتتە جەنگێکی جیهانی گەرم و تەڕو وشک بەیەکەوە بسوتێنێت، شەپۆلی هەواڵ و زانیاریەکان هەموو ئامڕاەزەکانی میدیایی، هەر لە تۆڕە کۆمەڵایەتیەکانەوە تا دەگاتە تەلەفزیۆن و کەناڵە ئاسمانیەکانی گرتۆتەوە، هەر کامێک لەو کەناڵانە بکەیتەوە هەوالی جۆراوجۆرو دژ بەیەک هێرشت بۆ دێنێت و دەیەوێت شتیکت وەک راستەقینە لەمێشک بسەپێنێت، کە رەنگ بێت ئەوەی راستیە تیایدا نەبێت و هەواڵێک، یاخود شیکردنەوەیەکی چەواشەکاری بێت هەوڵبدات

بیرکردنەوەو دنیابینی تۆ بە ئاڕاستەیەک ببات، کە خۆی مەبەستیەتی، بە داخەوە لەم جەنگەدا زۆرینەی هەرە زۆری زانیاری و هەواڵەکان لەو جۆرە بابەتەن، کە بێگومان ئەمە لە دووتوێی جەنگێکی جیهانیدایەو هەر لایەنەی هەوڵدەدات کارتەکەی دەستی خۆی لە رکابەرو دوژمنەکانی بشارێتەوە!.
بۆیە زۆر گرنگە، کە هەواڵەکان وەک هەوال وەربگیرێت و مامەڵەی لەگەلدا بکرێت نەک وەک راستەقینە، بەداخەوە لە کۆمەڵگای ئێمەدا تێبینمکردووە، نەک لای کەسانی ئاسایی، بەلکو لای زۆرینەی ئەوانەش، کە خۆیان پێ رۆشنبیرە، زۆر بە ساویلکەیی مامەڵە لەگەڵ ئەو زانیاری و هەواڵانە دەکرێت و وەک راستەقینەیەکی چەسپاو مامەلەی لەگەڵ دا دەکرێت، ئەمە کۆمەڵگای ئێمەی دووچاری دۆگمایەک کردووە، نەرمی لە شیوازی بیرکردنەوەی لە دەستداوەو بۆتە سۆنگەی ئەوەی  ئاشتی و سەقامگیری کۆمەڵایەتی لە کوردستان بکەوێتە مەترسیەکی گەورەوە.
ئەگەر هاتوو ئەوەشمانزانی لەکوردستان ئەو شەڕە زۆر بەفراوانی و لەسەر ئاستی ناوەخۆو هەرێمی و نیودەوڵەتەیوە بەڕێوە دەچێت!.
بۆیە دەبێت تاکی ئێمە وا گۆش بکرێت، کە بەشێوەیەکی گوماناوی سەیری میدیاکان و تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان بکات و بە ئاسانی ئاوەزی خۆی تەسلیم بەو زانیاری و هەواڵانە نەکات، چونکە لەپاڵ ململانێیە ئاڵۆزز چڕەکان، دەبێت بزانێت لە ئێستادا ئێمە لەنێو جەنگێکی

جیهانی میدیاییدا دەژین، کە دەکرێت بە جەنگی دووەمی جیهانی میدیایی ناوزەد بکەین.

2020\4\5

**باشوور...سەنتەری بازرگانیکردن بەخوێن و هەتککردنی نیشتیمانێک**

ئەو مەهزەلەیەی لە ماوەی سەد ساڵی رابردوودا لە باشووری کوردستان ناویان ناوە شۆڕش و کوردایەتی، لە راستیدا جگە لەبەسنتەرکردنی ئەو بەشە بۆ هەڕاجکردنی خوێن و مەسەلەی کوردی شتێکی زیاتر نەبووە، لەدوای جەنگی دووەمی جیهانەوە، بەناوی شۆڕش و کوردایەتیەوە لەو بەشەی کوردستان باشترین و پڕ قازانجترین بازرگانی بەخوێنی رۆڵەکانی کورد لە هەموو پارچەکانی کوردستان کراوە، یەکێک لە ئەفسەرە پایە بەرزەکانی مۆساد دەڵێت، ئێمە لەگەڵ شای ئێران رێککەوتنین یارمەتی بارزانی بدات ، بەرامبەر ئەوەی رێگا لە شۆڕشی رۆژهەلات بگرێت ، گرتن و کوشتن و تەسلیمکردنەوە سەدان شۆڕشگێر راستی قسەی ئەو ئەفسەرە دەسەلمێنێت. بۆ ئەوەی تورکیا رازی بکەن، دەیان شۆڕشگێڕی کوردیان کوشت و تەسلیم بە تورکیایان کردەوە، بۆئەوەی شۆڕشی رۆژئاوا شکست بێنێت، دەروازەی سمێلکایان داخست و چەتەو جاشەکانیان هاندا شانبەشانی سوپای تورک پەلاماری عەفرین بدەن، دەیان رۆڵەی باکووری کوردستانیان کوشت و بۆ رازیکردنی تورکیا

کەمپی مەخموریان ئابڵووقەدا، لەپێناو مانەوەی خۆشیان ئەگەر گەنجێک راستیەک بدرکێنیت، بەعس ئاسا لەنیوەی شەودا دەرگای لێدەگرن و لەبەرچاوی دایکی رەوانەی نوگرە سەلمانەکانی دەکەن.

ئێستاش لە کاتێکدا تورکیای دۆست، تەرمی کوڕە کوردێک پارچە پارچە دەکات و لە جانتایەکدا لە رێگای پۆستەوە بە دیاری بۆ دایکە جگەرسووتاوەکەی دەنێرێت، هەر لەوکاتەدا لە باشوور بازرگانی بە کوڕە کوردێکی رۆژهەڵات دەکرێت و تەسلیمی ئێران دەکرێتەوە بۆ ئەوەی لە سێدارەی بدەن، ئاخۆ دەبێت ژمارەی ئەو کوڕە کوردانەی رۆژهەڵات، کە بەناوی کوردایەتیەوە رەوانەی بەر پەتی سێدارەی ئێران کراون، یاخود هەر لەو بەشەداو بەنهێنی تیرۆرکران بگاتە چەند؟ ئای ئەمەچ کارێکی قێزەون و چ تاوانێکی گەورەیە، تۆ لەبەر زەقەی چاوانی دنیا تەرمی گەنجێک لەنیوجانتا بۆ دایکی بنێریت و گەنجێکی تر لە زەمەنی قەیرانی کۆڕۆنادا بە پێچەوانەی هەموو عورف و یاسایەک بخەیتەوە بەردەستی قەسایەکانی!. ئەمەیە پێشبڕکێ لەسەر خیانەتکردن، هەرگیز لاپەڕەی وەک ئەمڕۆ رەش لەمێژووی کورددا نەبووە، هەرگیز مەترسیەکان وەک ئەمڕۆ بۆ سەر کورد زیاد نەبووە، تۆ وەرە بەناوی سیاسەت کردنەوە، بەناوی کوردایەتی و خەباتی رزگاریخوازەوە، وەک هێزێکی بەکریگیراو رۆژێک بۆ تورکیاو رۆژێک بۆ ئێران و رۆژێک بۆ ئەمریکاو رۆژێکی تر بۆ بەرژەوەندیەکانی ئێراق رۆڵەکانی کورد بەکوشت بدەیت. بەڵام هەرگیز زاتی ئەوەت نەبێت بەراستی لەپیناو خۆتدا خەباتبکەیت و تەنانەت باسی

مرۆڤوونی خۆشت بکەیت!. با هەزاران تۆن کاغەز ساختە بکەن، با دەیان هەزار مێژوونووس و رۆژنامەنووس و راپۆرتنووس و با سەدان میداو هەزاران پێگەی تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان و دەیان رۆژنامەی قێزەون بەکاربێنن بۆ ئەوەی رای گشتی و مێژوو فریوبدەن و رووی خۆیان بۆ ئێستاو ئاینده جوان بکەن، هیچ شتێک ناتوانێت لەوە کەمتر بەو قۆناغە بڵێ، کە قۆناغی بازرگانانی خوێن و هەڕاجکەرانی نیشتمانێکە، بەداخەوە بۆ باشوور، کە بۆتە سەنتەری بازرگانیکردن و هەڕاجکردنی کوردانی هەرچوار پارچەی کوردستان.

11\4\2020

## موسڵ، کەرکوک، ئەربیلی، ئاسللاردا تورکیلی

چەند رۆژێکە ڤیدیۆی گۆرانیەکی تورکی لە تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان بڵاوبۆتەوە، کە کەرکووک و وەک خۆیان دەڵێن ئەربیل و موسڵ بە خاکی تورکیا ناوزەد دەکات، هەر لەو رۆژانە مەسەلەی تەسلیمکردنەوەی کوردێکی پەناهەندە لەلایەن دەڤەری سەوزەوە بۆتە قسەو باسی میدیاکان، لە راستیدا ئەو رووداوانە ئاماژە بۆ دوو خاڵی مەترسیدار دەکەن، خاڵێکیان ئەوەیە خەڵکی کوردستان بە کێشەکانی ناوخۆ خەریک کراوەو رووداوەکانی دەوروبەری خۆی نابینێت، خاڵەکەی تر ئەوەیە داگیرکاری ئەو دوو وڵاتە بۆ هەرێمی کوردستان پێی ناوەتە قۆناغێکی نوێ. تورکیا ئێستا لە عەفرینەوە تاوەکو دەگاتە سیدەکان خەریکەو پشتێنەی ئەمنی خۆی تەواو دەکات، ئەمە جگە لەوەی هیزەکانی تورکیا لەهێڵی شەنگال و بەعشیقەو مەخمور دیوارێکیان لەنیوان باشوورو رۆژئاوای کوردستان دروستکردوە، لەلایەک هەردوولایان ئابلۆوفە داوە، لەلایەکی تر کۆسپیان لەبەردەم لەیەکترزیکبوونەوەی ئەو دووبەشە دروستکردووە، هەردوو بەشیشیان رووبەڕووی یەکتر کردۆتەوە!.

بەتایبەتی ئەو دووبەشەی لەرووی جوگرافیەوە هاوسنوورون وەک دەڤەری زەرد لەگەڵ رۆژئاوای کوردستان، کە تورکیا وەک قووڵایی ستراتیژی خۆی لێیان دەڕوانێت. ئەمەش بەشێکە لە پرۆژەی عوسمانیە نوێیەکان و هەردوو رەگەزی راسیزم و ئایدیۆلۆژیای ئاینی تێکەڵکردووە!.

کەواتە لە رووی سەربازیەوە، ئێستا تورکیا بەکردەیی هەردوو بەشی کوردستانی ئابڵووقەداوەو خنکاندوویەتی!. لەرووی سیاسیشەوە ئەو دوو وڵاتە دەست لەهەموو هەنگاوێکی ناوخۆی ئەو هەرێمە وەردەدەن، وەک سەرۆکی پێشووی هەرێمی کوردستان گوتبووی، ناتوانین بەڕێوەبەرێکی گشتی دابنێین و دەوڵەتە هەرێمیەکان خۆیان تێهەڵدەقورتێنن، بۆیە من پێم وایە ئێستا هیچ پلەیەک لە ئیدارەی هەردوو زۆنی زەردو سەوز بە بێ رەزامەندی ئەو دوو دەوڵەتە دانانرێت، ئەگەر بە خێرایی چاوێک بەو گۆڕانکاریانەی ئەم دواییە پۆستەکانی حکومەتی هەرێم و تەنانەت ناوەخۆی حزبەکانیش دابخشێنین بە تەواوی ئەو راستەقینەمان بۆ دەردەکەوێت. خودی فرۆکەخانەی نێودەوڵەتی هەولێر، کە دەروازەیەکی گرنگی هەرێمە بەرووی جیهانی دەرەوەدا لەلایەن کۆمپانیای ئەو ژەنەڕاڵە تورکیەوە دروستکراوە، کە بەرپرسی هێزەکانی پی ئێم ئێف یوو، ئەو هێزەی تورکیا گوایە هاتبوو ناوبژژی لەنیوان پارتی و یەکیتی بکات لەکاتی شەڕی ناوخۆو ناوەکەشی نراوە (فرۆکەخانەی ئەربیلی نێودەوڵەتی)، واتە ئەو ناوەی تورکەکان بە هەولێری پایتەختی کوردستانی دەڵێن و لە گۆرانیەکەدا هاتووەو خەڵکی پێ قەڵس بووە، لە دەڤەری سەوزیش سەیرنیە ئەگەر پەناهەندەیەک، مەبەستم کوردێکی رۆژهەڵات، کە پەنا بۆ هەرێم بێنێت و تەسلیم بکرێتەوە، لەبەرئەوەی خودی ئیدارەکە ئێستا خەریکە بەتەواوی مۆرکی کوردبوونی خۆی لەدەستدەدات و لەهەمولایەنەکانی ئابووری و سەربازی و سیاسی و ئیداری بەئێران

دەبەسترێتەوە، دیارە ئەمە بۆ دەڤەری زەردیش هەمان شتە، ئەگەر بەرلەئێستا وەک کۆلۆنیایەکی ئابووری تورکی سەیری ئەو بەشەمان کردبێت، ئەوا ئێستا لەرووی سەربازیشەوە راستەوخۆ داگیرکاوەو تەنانەت جوولانەوەکانی ئەم دواییەی هێزی پێشمەرگە لەناوچەی زینی وەرتێ ئەنجامدراو کێشەی لەنێوان حزبەکان لیکەوتەوە، دەکەوێتە ئەو چوارچێوەیەوە، بۆیە ئێستا دەبێت خەڵکی کوردستان ئەوە باش بزانن، شتێک بە کردەیی وەک هەرێمی کوردستان نەماوە، ئەو ئیدارەی هەیە دیکۆرێکە بۆ شاردنەوەی داگیرکاری راستەوخۆی ئەو دوو وڵاتە، ئەو حیزبانەشی، کە بوونەتە بنێشتەخۆشەی سەرزاران و بەردەوام رەخنەیان لیدەگیرییێت، جگە لە دێوجامەیەک بۆ شاردنەوەی ئەو راستەقینە تاڵە هیچی تر نین و ئەوانە جگە لە هەوڵی مانەوەی خۆیان هیچ پەیوەندیەکیان بە کوردو بەرژەوەندیە نەتەوەییەکانەوە نەبووەو نەماوە، ئەوەیە دۆخی ئێستای ئەو ناوچەیە و با چیتر خۆمان فریو نەدەین، ئەوانەی باسمان کرد هەموو دەکەوێتە چوارچێوەی پرۆسەیەکی داگیرکاری رێکخراو، دەبێت خەڵکی کوردستان ئەو راستیە باش بزانێت و چیتر بەرەخنەگرتن لەیەکێتی و پارتی خۆی لە رووبەڕووبوونەوەی ئەو داکەوتە تاڵە نەبوێرێت و لە بەرپرسیاریەتی راستەقینەی خۆیان رانەکەن، چونکە ئەگەر ئەوانەی باسمان کرد داگیرکاریەکی نوێی کوردستان نەبێت، ئەی داگیرکاری چیە؟

2020\4\13

**قوربانیدان لەپێناو سووکبوون..لەچاوەڕوانی تەقنیەوەیەکی جەماوەریدا!!!**

ئەو وانەیەی دەکرێت، لە دۆخی ئەمڕۆی کوردستانی هەڵێنجین، ئەوەیە، کە بەتەنیا قوربانیدان بەس نیە  بۆ بونیاتنانی وڵاتێک، چونکە ئەگەر بە قوربانیدان بوایە ئەوا هیچ میللەتەێک هێندەی کورد بەناوی کوردایەتی و بزووتنەوەی رزگاریەوە قوربانی نەداوە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە قوربانیەکە بۆ چی دەدرێت و کێ رابەرایەتی ئەو قوربانیدانە دەکات!.

جێگای داخە بەرهەمی ئەو قوربانیدانەی کورد لە کاتی ئێستا لە دەستدانی خاک و برسیی بوون و رووبەڕووی سوکایەتی بوونەوەو بێ رێزیە بەرامبەری، ئەو هەموو قوربانیە، ئەنجامەکەی دەوڵەمەندبوونی کۆمەڵێک کەس و بنەماڵەو ریسوابوونی میللەتێکە، تاوانێکی ئێجگار گەورەیە دەرحەق بەو میللەتە دەکرێت، کە ئەو هەموو قوربانیە دەدات و سیاسەتمەدارەکانی بەو شێوەیە بەری خەباتی بێ نرخ و سووک دەکەن و لە بەغدا هەڕاجی دکەن!. دوای چندین ساڵ قوربانیدان، برسی بوون، سوکایەتی پێکردن، تازە بە تازە وەک تاوانبارێک خۆیان دەخەنەوە کۆشی بەغداو ئەویش وەکو تاوانبارو یاخیەک مامەڵەیان لەگەڵ دەکات، زۆر سەیرە بە دەیان و بە سەدان ملیار دۆلار هاتبێتە کوردستان و باسی دەوڵەتی کوردی و خوێنی شەهیدان و ....هتد بکەن، کەچی بۆمووچەی خەڵک بکەونە سواڵ و خۆیان بخەنە بەر کەوشەکەی غەوسی بەغدایێ،

ئەمە سیاسەت نیە، ئەمە سەرلێشێواویە، کە لەدواجار دەبێتە بنەمایەک بۆ ڕاپەڕینێکی گەورە لە ئایندەیەکی نزیکدا.

میللەتان ڕەنگ بێت زۆر شت قبوڵ بکەن، بەڵام کاتێک دەگاتە قۆناغی سووکایەتی پێکردن ئەوا دەتەقنەوە، ڕەنگ بێت ئەو بۆچوونە رووبەڕووی زۆر رەخنە بێتەوە، بەناوی ئەوەی کورد هەرگیز هووشیار نابێتەوە، بە پێچەوانەی زۆر کەس پێم وابێت ئەو بێدەنگ بوونە درێژە ئەنجامی هوشیاری و هەولدان بووە بۆ پاراستنی دەستکەوتەکانی، نەک بە پێچەوانەوە وەک ئەوەی ساویلکانە شرۆڤەی بۆ دەکرێت، بۆیە لە ئێستادا کاتێک دەیانەوێت هەموو شتێک تەسلیمی بەغدا بکەن و وەک هێستریکی چەموش لە بن ئەو بارە خۆیان هەڵدێرێنن، لێرە خاڵی کۆتایی دادەنرێت و دەبێت چاوەڕوانی تەقینەوەیەکی جەماوەری گەورە بکەین لە هەرێمی کوردستان، چاوەڕوانی پەرتەوازەیی و لێکترازانێکی گەورەی نێو مالی کورد بکەین!.

بەداخەوە چاوەڕوانی دابەشبوونێکی کردەیی و یەکجارەکی هەرێمی کوردستان دەکەم، گۆڕان و یەکیتی لە پەنای لامەرکەزیەوە دەیانەوێت تەسلیمی بەغدا ببنەوە، هەرچەندە ئەو تەسلیم بوونەوەیە لە 16 ئۆکتۆبەرەوە دەستیپێکردووەو شتیکی نویٚ نیە، پارتیش لە پەنای دروستکردنی دەسەڵاتێکی یەکگرتوو دەیەوێت بەشەکەی تری هەرێم بداتەوە دەست تورکیا، لەراستیدا ئەوەی پارتی بەکوردی کردووە لەم چەند ساڵەی دوایدا، سیاسەتێک بووە، کە هیچ هێزێکی خاوەن ئیرادە

نایکات،   هەموو شتێک لە پیناو خۆی، مەغروری و سەرەڕۆیی خۆبەزلزانینی پارتی، داروبەردی کردە دوژمنی کوردو یەکێتی کوردانی لەرەگەوە هەڵتەکان، ئێستاش سیاسەتی نا تەندروستی پارتیە، هێزەکانی تر ناچار دەکات پەنا بۆ بەغدا ببەن، ئەو سووکایەتی و رێزنەگرتنەی پارتی بەرامبەر لایەنەکانی تر پیادەی دەکات، ئەو مەترسیەیە، کە لە دوای کۆنگرەی ویستیڤالیاوە لەسەر ئاستی نیودەوڵەتی قێزەون کراوە، " هەرگیز سووکایەتی بەهێزەکانی تر مەکەن، چونکە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی رق و تووڕەیی و دواتریش تۆڵە کردنەوە"، بۆ نمونە سوکایەتی کردن بە ئەڵمانیا دوای جەنگی یەکەمی جیهانی، بووە هۆی دایسانی جەنگی دووەمی جیهانی، بێ منەت کردنی هێزەکانی تر، یەکێک بووە لە هۆکارە مەترسیدارەکانی ئەو قۆناغە، کێشەی پارتی ئەوەیە سەنگی راستەقینەی خۆی نابینێت و هەمیشە لە روانگەیەکی دۆنکیشۆتانەوە سەیری خۆی دەکات، ئەگینا خۆی لە دۆخێکدا نیە شایەنی ئێرەیی پێبردن بێت، تەنانەت لەناو زۆنی زەردیش گرنگترین شوێنە ستراتیژی و سەربازیەکانی لە دەستداوەو کەوتۆتە دەست تورکیا، بۆیە لە دواجاردا دەکرێت تەنیا چاوەروانی ئەوە بن، کە لە شوێنێکی تورکیا وەک پەناهەندەیەک وەربگیرێن.

کەواتە ئێستا بە جدی کار لەسەر هەڵوەشاندنەوەی هەرێم دەکرێت، گومانی تیانیە ئەو کارە چەند ساڵێکە دەستپێکردووەو لەژێرەوە دام و دەزگاکانی هەرێم وردە وردە بە بەغدا بەستراونەتەوە، وەلێ ئێستا

کارەکە خێراتر و ئاشکراتر بەڕێوە دەچێت، زەمینەی دەروونی خەڵکی کوردستانیش بۆ ئەم هەنگاوە خۆشکراوە، وایان لە خەڵک کردووە هەموو کێشە ستراتیژیەکان و ئایندەی خۆی بە چاوی گەدەوە ببینێت، "خەڵک دەتەقێتەوە ئەگەر مووچە نەدرێ"، ئەم بیکردنەوە خۆی لە خۆیدا گەورەترین سووکایەتیکردنە بە خەڵک و بەرپرسیار کردنی خەڵکە بەرامبەر ئەو هەموو شکست و خیانەی ئەوە دەسەلاتە کردوویتی، راستە خەڵک لە تەقینەوە، بەڵام بەهۆی مووچە نا بەڵکو بەهۆی ئەو سووکایەتیەی ئەو خیزانە بە وڵاتەکەی دەکەن، لە هەموو راستیەکان راستتر ئەوەیە ئەو دوو بنەماڵەیە ئیفلاسیان کردووەو دەیانەوێت هەریمی کوردستان تێک بدەن، وەک سەدام کاتێک گوتی ئەوەی دوای من دێت دەبێت حوکمی وڵاتێکی وێران بکات، ئێستا ئەوانە هەمان دروشم دووبارە دەکەنەوە، دوای ئێمە دەبێت کوردستان سووتماک بکرێت و بدرێتەوە دەست داگیرکەران، مل بۆ هەموو کەسێک و هەموو داگیرکەرێک کەچ دەکەن و سازش لەسەر هەموو پیرۆزیەک دەکەن، بەڵام ئامادەنین سازش بۆ یەکتر بکەن، ئەو بیرکردنەوە خێلەکیە، واتای بچووک بوون و هیچ نەبوونە، نەک گەورەیی!.

گرنگ ئەوەیە لەو قۆناغە هەستیارەدا ئەوەی کاری بۆ ناکرێت ئەو ئامانجەیە، کە دەیان ساڵە کورد خەباتی بۆ دەکات، هەردوو سیناریۆ(تەسلیم بوونەوە بە بەغداو ئەنقەرە) لە خزمەتی کورد دانیە، چونکە لە دواجاردا ئەو دوو دەوڵەتە لە چوارچێوەیەکی هەرێمیدا پەیوەندیەکانیان رێکخستووەو بە هەردوولایان رووبەڕوی کورد دەبنەوە،

بەداخەوە سەرکردایەتی کورد لە ئێستادا باکی بە میللەت نەماوەو خەریکە لەناو لەناو دەمی ئەژدیهادا بەجێیدێڵێت بۆیە ئەگەر خەڵکی کوردستان هەموو ئەو زوڵمانەی رابردووی لەپێناو هیوایەکی دیماگۆکیدا قبووڵکردبێت، ئەوا ئێستا چاوەڕوانی ئەوەین پەردەی شانۆکە دابخرێتەوە، دەبێت چاوەڕوانی تەقینەوەیەکی جەماوەری بکەین، نەک بەهۆی مووچە بەڵکو بەهۆی لەدەستدانی هەموو شتێک و ئەو سووکایەتیە گەورەی بەچارەنووسی ئەو میللەتە دەکرێت، دەبێت چاوەڕوانی گۆڕانکاری ئیجگار گەورەو مەترسیدارو چارەنووس ئامێز بکەین لە ناوچەکەدا...

2020\5\4

## پلانێکی سەیری تیرۆرکردنی بارزانی و.....!!!

یەکێک لەکێشەکانی کورد ئەوەیە ناخوێنیتەوەو بە دواداچوون بۆ زانیاریەکان ناکات، نەک هەر ئەو زانیاریانەی لەلایەن بێگانەکانەوە دەربارەی دەگوترێن، بگرە ئەو زانیاریانەی لەناوەخۆشەوە دەگوترێن و ئەو رووداوانەی دەگوزەرێن، ئەگەر سەیری ئاستی رۆشنبیری کوردی لە قرناغێکی وەکو ئێستادا بکەین، کە مرۆڤایەتی ئاستێکی باشی بڕیوەو قۆناغی شۆڕشی گەیاندنی پێدەگوترێت، دەبینین زانیاریەکان زۆربەی وەرگیراوو دەستاو دەستپێکراوەو وەکو توتی لە دەمی یەکتر وەردەگیرێتەوە، کە ئەمە مەترسیەکی زۆر گەورەی هەیەو وا دەکات ئاوەزی تاکەکان لەکاربکەوێت و بە ئاوەزی خەلکانی تر بیربکرێتەوە، ئەم دیاردەیە ئێستا زۆر بەزەقی کەوتۆتە بەرچاو، نەک هەر بە تەنیا لە تۆڕە کۆمەڵاتیەکان، بگرە لە کایە رۆشنبیری و ئەکادیمیەکانیش!. خەڵک لەسەر بنەمانی بۆچوونی خەڵکانی تر بە شان و بالی کەسێک، یاخود حزبێک یاخود کتێبێک هەڵدەدات، یاخود دەکەوێتە وێزەی بە بێئەوەی خۆی بینیبێتی، یاخو بیناسیت، یا خویندبێتیەوە ریسوای دەکات، وا مامەلەی لەگەڵ دەکات، وەک ئەوەی بینیبێت و بیناسێت و زیاتر لە جارێکیش خوێندبیەوە، ئەمە کارەساتیکی گەورەیەو لەلایەک کۆمەڵگا بەرەو تەوەزلی و خووێکی خراپ دەبات، لەلایەکی تر بەناوی سیاسەت و رۆشنبیری و .... هتد، دووچاری فەوزای دەکاتەوە، هەر ئەمەش وایکردووە، کە

خەلکانی تر تا وەکو ئێستا لە ئاستیکدا مامەڵە لەگەڵ کورد بکەن، کە جێگای بەزەیی پیاهاتنەوەو شەرمەزاریە بۆ کورد، " ئێوە نەتەوەیەکی جەنگاوەرن، نەتەوەیەکی شەڕکەرو قارەمانن، نەتەوەیەکی واو ... واو... وانە"، هەر کاتیکیش کاریان پێی نەمابێت، ئەوا کارتەکەیان خستۆتە لاوە، بەداخەوە ئەمە ئاماژەیەکە بۆئەوەی ئەوەی، کەوا کورد تا ئێستا ئاوەزی پێنەگەیشتووەو قۆناغی منداڵی تێنەپەڕاندووە، بۆیە وەکو منداڵیکی ساویلکە مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت.

لەو رۆژانە لە کەناڵی یوتوب سەیری بەرنامەیەکم دەکرد، گەواهیدانی وەلید سامەرائی ، دەربارەی ئەو قۆناغەی لە ناو حزبی بەعس ژیاوە، کە لەکەناڵی فەلوجە پێشکەش کرابوو، شتێک سەرنجی راکێشام دەربارەی نەخشەی هەوڵێک بۆ کوشتنی بارزانی، کە ئەفسەرێکی هەواڵگری لە زیندان بۆی گێڕابووەوە، وەک ئەوەی باس دەکات سیناریۆیەکە بەم شێوەیە بووە، هێزێک دروست بکەن جلی فسفۆریان لەبەر بکەن، هەروەها باڵی فسفۆریان بۆ بکەن بە شێوەیەک بەشەو رووناکی بدات و بتریسکێتەوە، ئەو هێزە لە رێگای فڕۆکە بخرێنە خوارەوە لە نزیک بارەگای بارزانی، بە تێگەیشتنی ئەوان وەک سامەرائی باس دەکات پێیان وابووە، بارزانی کابرایەکی مەلایەو واتێدەگات ئەوانە فریشتەنەو لە ئاسمانەوە دێنە خوارەوەو بۆ لای ئەو دەچن، بەم چەشنە دەتوانن بە ئاسانی تیرۆری بکەن، دوای ئەوەش چەکدارەکان بێگومان لە لایەن پیاوەکانی بارزانیەوە دەکوژرێن، بەڵام ئەوان وایان لە چەکدارەکان

گەیاندبوو، کە دوای ئەوەی ئەرکەکەیان ئەنجام دەدەن فرۆکەکان دەگەڕینەوەو لەگەڵ خۆیان دەیانبەنەوە، دیارە ئەم پلانە جێبەجێ نەکرا و سامەرائی هۆیەکەی باس ناکات، لێرەدا بەسەرهاتەکە کۆتایی دێت، بەڵام ئەگەر بەوردی لەو سیناریۆیە بکۆڵینەوە دەتوانین لە چەند ئاستێکدا شرۆڤەی بۆ بکەین، لە لایەک، ساویلکەیی دەزگاکانی هەواڵگری و ئاسایشی عێراق نیشان دەدات، کە زانیاریەکانیان لەسەر بنەمای هەڵەی باو هەڵچنیوە دەربارەی ئەو کەسەی پلانی تیرۆرکردنی بۆ دادەڕێژن، کە پێیان وابوو بارزانی مەلاو پیاویکی ئاینی بووە، کە دیارە ئەمە راست نیە، بەڵکو بارزانی هەر ناوی مەلا مستەفا بووە، واتە ناوێکی لیکدراوە، وەک دەڵێن دایکی وەک رێزێک بۆ مەلایەکی گوندەکەیان، کە ناوی مەلا مستەفا بووە ئەو ناوەی لێناوە، لەلایەکی تر تێگەیشتنی ئەوان بۆ بیرکردنەوەو ئاوەزی کورد دەردەخات، کە جۆرە سووکایەتیکردنێکی پیوەدیارە و بۆمان دەردەخات لە چ ئاستیکدا مامەڵەیان لەگەڵ کردووە، جێگای سەرنجە تاوەکو ئێستاش ئەوە روانگە بەکەمزانینەی کورد لەلایەن شۆڤینیە عەرەبەکانەوە بەردەوامەو لەسەر هەمان بنەمادا سیاسەت لەگەڵ کورد دەکەن، ئەمە تا رادەیەک دەتوانین بڵێین شتیکی ئاساییەو نەتەوەی سەردەستەو باڵادەست هەمیشە بەچاوی کەمتر لە خۆی سەیری نەتەوەکانی تر دەکات، بەڵام ئەوەی ئاسایی نیە و جێگای شەرمەزاریە، ئەوەیە تاوەکو ئێستا تاکی کوردی نەیتوانیوە ئەو قۆناغە تێپەڕێنێت و جێگای داخە ئەویش بەکەمتر سەیری خۆی دەکات، ئەمە ئەوە دەردەخات،

که رۆشنبیری کوردی نەیتوانیوە وێنایەکی وا بۆ تاکی کورد لای دوژمنانی دروست بکات، کە بەشێوەیەکی گەورەتر لەمە سەیری بکەن، هاوکات ئەوەمان بۆ روونەدەکاتەوە، کە ئەم خۆ بەکەم زانینە بۆتە نەخۆشیەکی دەروونی و رۆشنبیری لای تاکی کوردو پێویستی بە بونیاتناوەو پەروەدەکردنێکی نوێ هەیە، کە لەماوەی رابردوودا، نەک هەر کار لەسەر ئەمە نەکراوە بگرە قووڵتر کراوەتەوە، بیرکردنەوە لەگەڕانەوە بۆ بەغدا، لە جیاتی پشت بەخۆبەستن و هەوڵدان بۆ بونیاتنان و ئالنگاریکردنی قەیرانەکان، بە داخەوە دەکەوێتە هەمان ئەو خانەیەوە.

2020\5\5

## لەپێناو رزگارکردنی خوێندن لە هەرێمی کوردستاندا

ئەو دۆخەی ئێستا وڵاتەکەمانی پیادا تێپەڕدەبێت، بەهۆی نەخۆشی کۆرۆناوە، وایکردووە خوێندن و زۆر لەم بوارانەی تر، کەوا کاری بە کۆمەڵن، پەکیان بکەوێت، ئەوەی پەیوەندی بە پەروەردەو خویندنەوە هەیە، نەک بە تەنیا ئەو بوارە کەوتۆتە قەیران بەڵکو گەڕان بەدوای دەرچەو چارەسەرییەکانیش خراوەتە قەیرانەوە، بێگومان ئەمەش یەکێک لە دەرهاویشتەکانی نەبوونی کالاَ بە قەد بالاَیەو دەرئەنجامی ئەو شێوازەیە، کە پلەو پۆستەکانی لە هەریمی کوردستان پێبەخشراوەتەوە، بۆیە بیرکردنەوە لە چارەسەرییەکانیش مۆرکێکی سیاسی وەرگرتووە تا رادەیەکی زۆر خەمساردی بەرامبەر پەروەردەو فێرکردنەوە پێوە دیارە!. ئەو بژاردانەی بۆ چارەسەری خرانە روو، هەر لە خوێندنی ئەلیکترۆنی و ئۆنلاینەوە تا دەگاتە بەڕێکردن و تێپەڕاندنی قۆناغەکان، بژاردەی تەندروست نەبووینهو نینە، هەرچەندە خویندنی ئۆنلاین، ئەگەر ژێرخانەکەی لەبواربێت، بژاردەیەکی لەبارە، بەڵام بەو خێراییە ئەو بژاردەیە ناکەوێتە بواری پراکتیزەکردنەوە، دەبوایە پێشتر بایەخی پێبدرابوایەو فەرامۆش نەکرابوایە، کەواتە چی بکرێت باشە؟

بەرلە هەموو شتێک دەبێت دۆخی وخوێندن و پەروەردە لە هەریمی کورد بەو شێوەیە سەیر بکرێت، کە هەیە، نەک وەک ئەوەی چۆن خۆمان

دەمانەوێت وێنای بکەین و ڕووی ڕاستەقینەی بشارینەوە، سەیری دۆخی خویندن لە هەرێمەکەمان بکەین وەک ئەوەی لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا هەیە، لە کاتێکدا بەر لەکۆرۆناش پرۆسەی خوێندن و پەروەردەو خویندنی باڵا لە هەریمی کوردستان لە قەیرانی گەورە ژیاوە و لە لێواری داتەپین نزیک بۆتەوە، دیارە، کە خوێندن زیاتر بڕوا نامە بەخشینەوە بووەو حزبەکان بەگوێرەی بەرژەوەندیەکانی خۆیان بڕوانامەیان بەسەر کادیرەکانی خۆیان بەخشیوەتەوە و دەوڵەمەندەکان ئەو بەشانەیان بۆ منداڵەکانیان کڕیوە، کە ئارەزوویان لێیی بووە، نەک بەگوێرەی تواناکانیان بووە، کەواتە لە پاڵ قوتابی و خوێندکار، کە ئێسستا کراوەتە خاڵی سەرەکی چارەسەریەکان، سوپایەک خاوەن بڕوانامەی نەخوێندەوار بەرهەم هێنراوەو ساڵانە بە دەیان ملوێن دۆلار چ لە بەرهەمهینانیان چ لەکارپێکردنیان بە هەدەر دەدرێت، بێگومان بەر لەهەموو شتێک دەبێت ئەمە چارەسەر بکرێت، چونکە کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر کۆی پرۆسەی خوێندن هەیەو بەشێکی زۆری ئەوانەی ئێستا لە هەرێمی کوردستان جلی دکتۆرو ماستەرو پرۆفیسۆری یاریدەدرو پرۆفیسۆریان لەبەرکراوە، تەنانە ئەگەر لەو بابەتانەی خۆیان دەیڵێنەوە تاقیان بکەیتەوە لەوانەیە دەرنەچن، تەنانەت گومانی ئەوە دەکەم خۆیان بزانن بە دروستی وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەنەوە، کە خۆیان بۆ قوتابی و خوێندکارەکانیان دادەنێن، هاوکات ئەو بابەتانەی بەدرێژایی ساڵیش دەیڵێنەوە، لە چەند لاپەڕەیەک و مەلزەمەیەکی کۆن تێناپەڕێت، کە ڕەنگ بێت، هەموو ساڵەکە ئەگەر کۆی

بکەیتەوە تەنیا بەشی یەک هەفتەیە بخوێنرێت، ئەمە سەرباری جۆری ئەو بابەتانەی دەیڵێنەوە، کە بابەتی ستۆک و کۆن و لە ئاستی زانیاریەکانی سەردەم دانینە، بەداخەوە ئەمە قوتابی و خوێندکارەکانیشی لەسەر ئەوە راهێناوە، کە ئامادەنەبن لەمە زیاتر وەرگرن و بخوێنن، بەمەش ئاوەز لەم وڵاتە فەرامۆش و پشتگوێخراوە!. بێگومان ئەمە واتای نادیدەگرتنی رۆڵی ژمارەیەک مامۆستای بەرێز نیە لە کوردستان، کە زانای گەورەن و بەوپەڕی توانی خۆیان شەڕی ئەو دۆخە دەکەن و دەیانەوێت رۆلەکانی گەلەکەیان بە باشترین شێوە پێبگەیەنن، بەڵام جێگای داخە ئەوانە ژمارەیان هێندە کەمە، کە کاریگەریان نەک دەرناکەوێت بگرە دەخنکێنرێش!.

کەواتە ئەگەر بەوردی و روانگەیەکی ریالیستیەوە سەیری ئەو دۆخە بکەین، کە پرۆسەی فێربوون وپەروەردەو خوێندنی باڵای تێکەوتووە، خوێندن و نەخوێندن وەکو یەکی لێهاتووە لە هەریمی کوردستان، تەنانەت بەردەوام بوون لە خوێندن بەو جۆرەی لە ئارادایە زیان و مەترسیەکانی ئێجگار زیاترە، تەنیا ئەو جۆرە ئاوەزە بەرهەم دەهێنێت، کە ئێستا خەریکە کۆمەڵگای کوردی دەگرێتەوە:" چش لە وڵات و نیشتیمان و هەموو شتێک لە پێناو خۆم و بەرژەوەندیەکانی خۆم، تاکە راستەقینە ئەوەیە، کە من بتوانم چۆن بە زووترین کات هەموو ئەوشتانە بەدەست بێنم، کە دەمەوێت خۆم بەشایەنی زۆرینەی ئەو شتانە بزانم، کە شایەنی نیم". دیارە دەرئەنجامی ئەمەش هەر ئەو بەرپرس و کادیرە

حزبیانەی لێبەرهەم دێت، کە هەموو شتێک بۆ خۆیان حەلاڵ بکەن و " شاپ لە مامۆستاکان هەڵدەن". ئامادەن دەست لەگەڵ ئەهریمەنیش تێکەڵ بکەن  بۆ ئەوەی بەرژەوەندیەکانی خۆیان مسۆگەر بکەن!. لەم روانگەیەوە کێشەی بەردەوام بوونی و بەردەوام نەبوونی خوێندن لە هەرێم زۆر زیاتر لە قەبارەی خۆی گەورە کراوەو کۆمەڵگای ئێمە لەمبارەیەوە لە درۆیەکی گەورەدا دەژیت، بەم شێوەیەش هەرگیز ناتوانێت چارەسەری بۆ بدۆزێتەوە، چونکە تاکە ریگا بۆ چارەسەری ئەوەیە، کە بەرلەهەموو شتێک لە دۆخەکە تێبگەین، تا دۆخەکە نەبینین وەک ئەوەی هەیە چارەسەریەکانیش وەکو دۆخەکە دەکەوێتە قەیرانەوە!.

ئەگەر سەیری دۆخی ئێستای هەرێم بکەین، تەنیا دوو رێگا بۆ چارەسەری هەیە، چارەسەری راستەقینە، کە پێداچوونەوەیە بە کۆی پرۆسەی پەروەردەو خوێندن و خویندنی بالا، چارەسەری کاتیش بۆ ئەو دۆخەی هاتۆتە ئارا بە هۆی نەخۆشی کۆرۆناوە، قەیرانی یەکەم پێویستی بە چارەسەریەکی ریشەیی هەیەو کێشەیەکی قووڵە، بەلام قەیرانی دووەەم کاتیەو تیدەپەڕێنرێت، بە بۆچوونی من بۆ دۆخی ئێستا یەکێک لە بژاردە کردەییەکان لە یەکتردانی دووساڵی خویندنە، واتا پەڕاندنەوەی قوتابیان و خوێندکاران بۆ پۆلی دوایی و دواتریش لە سالی داهاتوو، خویندن زیاتر چڕ بکرێتەوەو هەردوو پۆل بەیەکەوە بخوێندرێت !، ئەمە لەوە باشترە هەموو دەربچوێنرێت و لەسەر بنەمای رازیکردنی قوتابی و خوێندکار خوێندن ریسوا بکرێت، رەنگ بێت ئەو بژاردەیە بۆ هەندیک لەو

بابەتانەی دەخوێنرێت هیچ کێشەیەکی تیا نەبیت و بگرە زۆر ئاسانیش بێت، مەبەستم ئەو بابەتانەیە، کە تەواوکەری یەکترین، لە رووی زانستیەوە باشتریشەو هیچ دابرانێک لەنێوان بابەتەکان بۆ قوتابیان دروست ناکات، بۆ نمونە لە بەشی یاسا، دەروازەی شەریعە هەیە، یاسای باری کەسێتی، میرات و وەسیەت، ا×ولی فقە، ئەوانە لە قۆناغە جیاجیاکان و لەدوای یەکتر دەخوێنرین، هەمووی تەواکەری یەکترن و دەشێت دوو قۆناغی ئاویتەی یەکتر بکردرێت، دیارە ئەمە بەگوێرەی زۆربەی بابەتەکانی تر راستە، بێگومان لەبەشەکانی تریش ئەو لەیەکتر نزیک بوونە هەیە، هاوکات بەگوێرەی بابەبەتەکانی تر دەتوانرێت دەوام درێژتر بکرێتەوە، بۆ نمونە لە جیاتی ئەوەی کاتژمێر دوو دەوام تەواو بێت و خشتەی رۆژانەی قوتابیان لەسەر ئەو بنەمایە دابنرێت، دەتوانرێت تاوەکو کاتژمێر پێنج و شەشی ئێوارە درێژ بکرێتەوە، بۆ یارمەتی باری دارایی قوتابی و خویندکارانیش لەرێگای زانکۆکانەوە، تەنانەت دەکرێت لە رێگای دەزگا خێرخوازیەکانەوە، ئەگەر حکومەت نەتوانێت ئەو ئەرکە هەڵبگرێت، خواردن بۆ قوتابیان بە نرخێکی رەمزی دابین بکرێت!.

دیارە ئەمە بژاردەیە بۆ بەشی زانستە مرۆڤایەتیەکان زۆر لەبارترە، بەشە زانستیەکانی تریش، کە تاقیگەیان هەیە، کە رەنگ بێت زۆر رۆژ بەشێوەکی ئاسایی دەوامیان بگاتە کاتژمێری چواری ئێوارە لەسەر هەمان بنەما، کاتەکانیان رێکبخەن. ئەو کێشەیە کێششەیەکی کاتیەو دەتوانرێت بەم چەشنە تێپەرێنرێت، بەڵام وەک ئاماژەی پێکرا، کێشەو قەیرانی

راستەقینە خودی ئەو دۆخەیە، کە خویندن و پەروەردەو بەتایبەتیشش خویندنی باڵای تێکەوتووە، کە پیویستی بەهەڵوەشاندنەوەو سەرلەنوێ دارِشتنەوەی کۆی کایەکانی هەیە، کە بەداخەوە ئێستا بەو ئامرازو کادیرانەی حیزبەکان خستوویانەتە ناو ئەو بوارە چارەسەری ئاستەنگە، چونکە بەر لەهەموو شتێک دەبێت دەستی ئەو حیزبانە لە زانکۆکان و بوارەکانی تری خویندنی باڵا ببرِدرێت، کە هۆکاری سەرەکی ئەو دۆخەن.

2020\06\02

## ئەو سوکایەتیکردنە بە زانکۆکان رابگرن...

سڵاو و رێز

بەڕێزان ناکرێت وەک نەخوێندەوارێک مامەلە لەگەڵ مامۆستای زانکۆ بکرێت و ئەو هەموو رێنماییە نازانستی و نایاساییەی لەسەر بسەپینرێت، بەراستی وەزارەتی خویندنی باڵاو سەرۆکایەتی زانکۆکان سەلماندیان، کە بەگۆترە مامەلە لەگەل زانست دەکەن، ئەگەر دەیانەوێت خویندنیش وەکو زەوی و خاکی کوردستان ببەخشنەوەو بیکەنە چاکەو پیاوەتی، ئەوە ناکرێت رێگاتان پێبدرێت لەمە زیاتر خویندن سووک بکەن، ئەگەر دەتانەوێت ئەمساڵ هەموو قوتابیان دەربچوێنن، بڕیاریک بدەن و واز لەو گەمە مەهزەلە ئامێزە بێنن، ئەو شێرو رێویە لەگەڵ مامۆستا مەکەن، بیانوو بۆ راکردن لە بەرپرسیاریەتی مەهێننەوە گەندەڵیەکە بە مامۆستایان مەکەن!.

چۆن دەکرێت وەرەقەی مانگانەی قوتابی لەجیاتی پەڕاوی تاقیکردنەوەی کۆتایی ساڵ هەژمار بکرێت، چۆن دەبێت بە راپۆرتێک ساڵێک تێپەڕێنرێت؟، کە خۆتان باش دەزانن لەسایەی ئەو دۆخەی خۆتان و حیزبەکانتان بەسەر زانکۆکانتان هێناوە، قوتابی لە ماوەی یەک ساڵدا توێژینەوەیەکی پێنانوسرێت، تەنانەت قوتابی هەیە لە ماوەی یەک ساڵدا زیاتر لە رۆژێک دەوامی نەکردووەو بوێری ئەوەتان نەبووە فەسڵی بکەن،

چۆن دەکرێت بەچەند رۆژێک راپۆرتیک بنوسێت و بکرێتە بیانگەیەک بۆئەوەی ساڵێکی بۆ تێپەڕێنرێت، ئێمە هەموو دەزانین، کە زۆرینەی قوتابیان چۆن ئەو راپۆرتانە ئامادە دەکەن و بەشێکیشیان بە ئامادەکراوی دەیهێنن، کەواتە ئەم هەنگاوانە جگە لە هەوڵدان بۆ سووککردنی مامۆستا هیچی تر نیە، بۆچی هەوڵدەدەن مامۆستا لەبەرچاوی خۆی و کۆمەڵگا لەمە زیاترسووک و ریسوا بکەن؟ ئەگەر ئێوە رێنمایی لە حیزبەکانتان وەردەگرن، ئەوا ناکرێت مەرجەعی زانستی مامۆستایانی دڵسۆزو رۆشنبیر حیزبە نەخویندەوارەکان بێت، کە هەموو خەڵک دەزانێت چیان بەسەر هەرێمی کوردستان داهێناوە، بۆیە دەبێت خاڵێک بۆ ئەو رەفتارە نا بەرپرسانەی خۆتان دابنێن، لەوە زیاتر دۆخی زانست لە هەرێمی کوردستان ریسوا مەکەن، ئەگەر بڕیاریشتان داوەو هەر ئەو کارە بکەن و لەمە زیاتر ئاوەزتان بەسەر چارەسەری داناشکێت، ئەوا بەرپرسیاریەتیەکە مەخەنە ئەستۆی مامۆستایان و خۆتان لە ئاستی ئەرکەکانتان ببیننەوە، بڕیارێک بدەن کۆی ئەمساڵ تێپەڕێنریت وساڵیکی تر خوێندن زیاتر چڕ بکرێتەوە، ئەگەر بڕیارتان داوە هەر بەردەوامیش بن لەو هەنگاوە نایاساییانە، ئەوا لە جیاتی ئەوەی مامۆستا بەڕێزەکان بخەنە ناو ئەو پڕۆسە گەندەڵیەو لەکەداریان بکەن، ئەوا لیژنەیەک لە کادیرەکانی حیزبەکانتان لەناو زانکۆ دابنێن و چۆن مامەڵە دەکەن، کەیفی خۆتانە بەڵام لەمە زیاتر بێڕیزی بەرامبەر مامۆستای راستەقینە مەکەن!

## پەیامێک بۆ : ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان

بەڕێزان بەهۆی ئەو دۆخەی کوردستان تێیکەوتووە، واباشە هەرچیەک ئەگەر پێت دەکرێت بیکەیت و درێغی نەکەیت، لەو روانگەیەوە ئەو پەیامەم نووسی، سەرەتا ویستم ژمارەیەک ئیمزا کۆبکەمەوە وەک ژمارەیەک ئەکادیمیستی کورد ئەو کارە بکەین، بەڵام بەداخەوە زۆربەی ئەوانەی پەیوەندیم پێوەکردن بیانووی زۆر ساویلکەو بێمانایان دەهێنایەوە، بۆیە بڕیارم دا پەیامەکە لەرێگای ئیمڵەکانی یوئێنەوە بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی بەناوی خۆم بنێرم، ئەمە واتای ئەوە نیە، کەوا هیچ ئەکادیمیستێکی خاوەن هەلوێست نیە، بەڵکو تەنیا ئاماژەکە بۆئەوەی ئەوانەی من دەستم پێیان گەیشت ئەوە هەلوێستیان بوو، کە ئەمەش جێگای داخە، داخەکە لەوەش گەورەتر ئەوەیە هەندێکیان پاساو بۆ تورکیا دەهێننەوە رەخنە لە پارتی کرێکارانی کوردستان دەگرن، واتە ئاستی بیرکردنەوەیان لە ئاستی بیرکردنەوەی دەروێشەکانی حیزبەکان تێناپەڕێت، ئەمەش ئەنجامی ئەو تێکدان و وێرانکردنە رێکخراوەیە، کە حزبەکان لە باشووری کوردستان ئەنجامیان داوە، هەرچۆنێک بێت بە باشم زانی دەقی پەیامەکە وەک خۆی بە زمانی کوردی بۆ خوێنەری کورد بڵاو بکەمەوە:

بەڕێز: ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان

لەلایەک تورکیا هێرشی سەرهەرێمی کوردستان دەکات، بە بیانووی لێدانی

پارتی کرێکارانی کوردستان، دەیەوێت ئەو پشتینە تەواو بکات، کە لە ڕۆژئاوای کوردستانەوە دەستیان پێکردووە بۆ گۆڕینی دیمۆگرافیای ناوچە سنوورییەکانی کوردستان، بەمەبەستی دابەشکردنەوەی کوردستان لەسەر بنەمای دیمۆگرافی، کە ئەم دابەشکردنە قۆناغی دووەمی دابەشکردنی کوردستانە، کە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی لەسەر بنەمای جوگرافی ئەنجامدرا، ئەو قۆناغە لە قۆناغی یەکەم ئیجگار مەترسیدارترەو هەڕەشە لەسەر بوونی کورد دەکات وەک نەتەوەیەک و بۆ هەتایە مۆرکی کوردستانی بوون و نەخشەی کوردستان لەسەر نەخشەی جیهان دەسڕێتەوە. لە لایەکی تر ئێران بە هەموو توانایەکی ناوچە سنوورییەکانی هەرێمی کوردستان بۆردومان دەکات، ئەمە واتای ئەوەیە قۆناغێکی تر لە گەلە کۆمەی هەرێمی دەستپیکردووە، کە دیارە بە هۆی گۆڕانکارییەکان لە هاوسەنگی هێزی جیهانی و سیستەمە هەرێمیەکەدا هاتووە، وا دەکات ئەم هەڵمەتەش زۆر مەترسیدارو چارەنووس سازتر بێت لە هەڵمەتەکانی پێشووتر. بێدەنگی هەموو دنیاش بەرامبەر ئەو تاوانە گەورەیە، کە لەبەرزەقەی چاوانی بەڕیوە دەچێت. پرسیارێکی گەورە لای گەلی کورد دروست دەکات و دایساندنی گڵۆپی سەوزە بۆ تورکیاو ئێران بۆ ئەنجامدانی ئەو تاوانە. هاوکات، شەرمەزاریەکی گەورەیە بۆ کۆمەڵگای نێودەوڵەتی و لەکەیەکی گەورەیە بەرووی هەموو ئەو هێزانەی پاڵپشتی ئەو دەوڵەتانە دەکەن بۆ ئەنجامدانی ئەو ڕەشەکوژیە، چونکە ئاشکرایە تورکەکان بە فڕۆکەی ئەمریکی و تانک و زرێپۆشی ئەڵمانی و ئێرانیەکان

به چەکی روسی و چینی ئەو پەلاماری هەرێمی کوردستان دەدەن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە هەردوو بەرە بەشدارن لەو تاوانانەی دژ بە میللەتێکی بێوەی دەکرێت.

بەڕێزان لاتان روونە ئەم هەلمەتەی لەناوبردنی میللەتێک هەڕەشە لەسەر ئاشتی و ئاسایشی جیهانی دەکات، بۆیە پێویستە ناوچەکە بەگشتی بخرێتە ژێر بەندی حەوتی میساقی نەتەوە یەکگرتووەکان و هاوکات بەهۆی ئەو بڕیارەی لە لوتکەی سەرکردەکانی جیهان لە نەتەوە یەکگرتووەکان لە ساڵی (2005) دەرچوو، لەسەر کۆمەڵگای نێودەوڵەتی پیویستە بەرپرسیاریەتی پاراستنی نەتەوەی کورد بگرێتە ئەستۆ، چونکە ئێستا ئەو دەوڵەتانەی کوردستانیان بەسەر دابەشکراوە نەک ناتوانن کورد، کە بەشیکی گرنگە لەدانیشتوانی ئەو وڵاتانە (تورکیاو ئێران و سوریاو ئێراق) بپارێزن، بەڵکو ئەوان خۆیان مەترسی سەرەکین و هەڕەشە لە بوونی ئەو نەتەوەیە دەکەن، بۆیە لەسەر کۆمەڵگای نیودەوڵەتی و کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بەتایبەتی پیویستە بەرۆڵی مێژوویی خۆیان هەڵسن و نەتەوەیەک لە جینۆسایدو پاکتاوی رەگەزی بپارێزن، لەمڕووەوە داوا لە بەڕێزتان بە ئەرکی خۆتان هەڵسن ودەستبەجێ داوا لە ئەنجومەنی ئاسایش بکەن بۆئەوەی کۆبوونەوەیەکی بەپەلە ببەستێت و رێگا لەو تاوانە گەورە دژ بە مرۆڤایەتی بگرێت

2020\6\21

## چارەسەری مەسەلەی موچەی بندیوارەکان

زاراوەی بندیوارەکان، زاراوەیەکی نوێیە لە زمانی کوردی و لە هەشتاکانی سەدەی بیستەمەوە، ئەو کاتەی حکومەتی ئێراق هێزەکانی عەشایری سووک، واتە فەوجی جاشەکانی تۆماردەکرد، جیگای خۆی کردەوە، ئەمەش بەو کەسانە دەگوترا، کە لەپیناو پاراستنی خۆیان ناویان لای سەرۆک جاشەکان تۆماردەکردو دەوامیان نەدەکرد، بەرامبەر ئەوهش سەرۆک جاشەکە مووچەکەیانی بۆخۆی دەگێرایەوە، ئەمە لە بەرژەوەندی هەردوولایاندا بوو، کەسی بندیوار دەیتوانی لە لایەک ژیانی خۆی بپارێزت و نەچێتە بەرەکانی جەنگ لە سوپای ئێراق، هاوکات بۆخۆی دەیتوانی کارێکیش بکات، سەرۆک جاشەکەش مووچەیەکی بۆخۆی وەردەگرت و لەپاڵ ئەمەش چەندانی تری بەشێوەیەکی نایاسایی تۆماردەکردو مووچەکانیانی وەردەگرت، لەراستیدا ئەم کەلتووره لەمێژووی کوردا شتێکی نوێ نیە، ئینگلیزەکان لەسەردەمی شێخ محمود، ئامۆزایەکی شێخیان، کە قائمقامی ناوچەی رانیە بوو، بەوە تۆمەتبار دەکرد، کە بەزاراوەکەی ئێستا زیاتر لە بیست بن دیواری هەبوو!

دوای راپەڕین ئەو کەلتووره لەرێگای ئەو سەرۆک جاشانەوە هاتەوە ناو کایەکانی کۆمەلگای کوردی، جاشەکانی دوێنی، ئەمرۆ بەناوی پێشمەرگایەتیەوە، بە تایبەتی لە قۆناغی شەری ناوخۆ ناوی خەڵکیان

وەک پێشمەرگە دەنووسی و مووچەکانیان بۆ خۆیان وەردەگرت، ئەو نەخۆشیە ئەوانەشی گرتەوە، کە بەخۆیان دەگوت پێشمەرگە و ئەم پەتایە بەخێرایی هەموو شوینیکی گرتەوە، لەناو سوپاو هێزەکانی پێشمەرگەو فەرمانبەرەکان، حزبەکانی کوردی ئەو بندیوارانەیان بۆ خزمەتکردنی خۆیان بەکارهێناوە بە شێوەیەکی نایاسایی، زۆربەی ئەو بندیوارانەش لەکادیرو لایەنگرانی حزبەکانن، بۆ نمونە لە کاتی دەنگدانەکاندا دەنگیان پێساختەدەکردن و هەموو کارێکی بیانویستبوایە پێیان دەکردن، واتە بەشێوەیەکی گشتی ئەوانە خزمەتێکیان پێشکەش بەو حزبانە کردووەو دەکەن، بەرامبەر ئەمەش، وەک پاداشتێک ئەو حزبانە بە مووچەیەکی بندیوارچاکەی ئەو کەسانەی داوەتەوە، بەڵام لەگیرفانی خۆیان نا، بەڵکو لەگیرفانی حکومەت، کە ئەمە باری بۆجەی حکومەتی تا رادەی شەکەتکردن، شەکەتکردووە، بەڵام بەهۆی ئەو پارە زۆرەی دەهاتە کوردستان کێشەی ئەوانە زەق نەببوەوە، ئەوکاتە ئەو کێشەیە هاتە بەرباس، کاتێک هەرێم دووچاری قەیرانی دارایی بووەوە، ئێستا ئەوانە کێشەیەکی گەورەن، لە زۆربەی فەرمانگەکانی کوردستان لە پاڵ چەند فەرمانبەرێکی راستەقینە بەدەیان فەرمانبەری لەو شێوەیە هەیە، کە ناویان هەیەو مووچە وەردەگرن، بەڵام نەدەوام دەکەن و نەهیچ کارێکی فەرمی دەکەن، ئەمە وایکردووە لە هەرێمێکی بچووکدا ژمارەی فەرمانبەران لە ملوینێک و چارەگێک رەتبکات، کە ئەمە هاوشێوەی نیە لەهیچ وڵاتیکی تری دنیا.

کێشەی بندیوارەکان یەکێکە لەو کێشانەی حکومەتی هەرێم ئیرادەی ئەوەی نیە ئازایانەو راشکاوانە مامەڵەی لەگەڵدا بکا، چونکە ئەو بندیوارە لە بنەڕەتدا سەرەبە هێزە سیاسیەکانی کوردستانن، ئەمە وایکردووە، ئەو کێشەیە ببێتە کێشەیەکی سیاسی قووڵ لەنێوان حزبەکانی هەرێم بە تایبەتیش لەنێوان پارتی و یەکیتی، کە زۆرترین رێژەی بندیواریان هەیە، تاوەکو ئێستا نەیانتوانیوە هیچ چارەسەریەک بۆ ئەو کێشەیە بدۆزنەوە، جگە لە چارەسەریەکی نادادوپەروەرانە، کە لەسەر حیسابی فەرمانبەری راستەقینەیەو بۆ رازیکردنی ئەو بندیورانە و حزبەکانیان غەدر لەو فەرمانبەرانە دەکەن، کە بڕبڕەی پشتی ئیدارەکانی هەرێمن و سەنگی کارەکان بەشێوەیەکی سەرەکی کەوتۆتە ئەستۆی ئەوان، دیارە ئەم چارەسەریە رەنگ بێت لە ئایندەیەکی نزیکدا دەرهاویشتەی مەترسیداری لێبکەوێتەوە.

کەواتە چارەسەر چیە؟ بەرلەهەموو شتێک دەبێت دان بەراستیە بنێین، کە ئەو بندیوارانە ئەو مووچەیان بەرامبەر پێشکەشکردنی خزمەتگوزاریەکانیان بە حزبەکان وەرگرتووەو وەردەگرن، ئەمانە شێوازی ژیانی خۆیان لەسەر ئەوە بنیاتناوە، رەنگ بێت بڕینی ئەو مووچەیە ببێتە هۆی تیکدانی شیرازەی زۆر خێزان، هەرچەندە زۆرینەی بندیوارەکان لەوانەن، کە دەستیان دەڕوات لەناو حزبەکان، یاخود دەستیکیان لەپشتەو دۆخی ئابوریان باشە!، بەڵام ئەمە پاساو بۆ بڕینی مووچەی هەزاران کەس ناهێنێتەوە، ئەم کێشەیە لە بنەڕەتدا کێشەی حکومەتی هەرێم نیە، بەڵکو

کێشەی حزبەکانەو دەبێت ئەوان خۆیان چارەی بکەن، دیارە خەڵکی ئاسایش هەست بەوە دەکات، کە لەماوەی 30 ساڵی رابردوودا چ سەرمایەکیان بەیەکەوە نا، کە دەتوانن نەک چەند هەزار بندیوارێک، بەڵکو وەک دەڵێن گەلی چینیش بەخیوبکەن، بۆیە باشترین ریگا بۆ چارەسەری، گەڕاندنەوەی مووچەی ئەو بندیوارانەیە بۆ سەرحیزبەکان و لە هەوکی حکومەت بکرێنەوە، پێویستە حزبەکان حۆیان لە داهاتەکانی خۆیان، کە زۆر لەداهاتەکانی حکومەت زیاترە، مووچەی ئەوانە بدەن، بەم چەشنە نەبێت کێشەی بندیوارەکان نەک چارەسەر ناکرێت، بەڵکو کۆی کایەکانی کۆمەڵگای کوردی و سەقامگیری ئاشتەوایی کۆمەڵایەتیش دەخاتە مەترسیەوە.

2020\7\1

**ئاشبەتاڵێک بەتامی سەرکەوتن، ئاشبەتاڵێک بەکپی و بە بێدەنگی**

ئەوەی ئەمڕۆ دەگوزەرێت ئاشبەتاڵێکە بەبێدەنگە بەڕێوە دەچێت، ئەگەر پێشتر هەڕەشەی ئەوە دەکرا، کەوا ئەلتەرناتیڤی ئێراق، تورکیایە، ئەوا هێزەکانی سوپای ئێراق بەنوێژی نیوەڕۆ گەڕێنرایەوە ناوقووڵایی هەرێمی کوردستان و سنوورەکانی داگیرکردەوە، سەرۆکی پارتی خۆی لەچیاکان شاردۆتەوەو نووزەی لێوە نایەت، نەباسی دەوڵەتی کوردی و نەباسی مافەکانی کورد دەکات، لەهەوڵی پاراستنی سەری خۆی و بنەماڵەکەیەتی، تاڵەبانی و دواتریش منداڵەکانی تالەبانی، کە ئامادەبوون جگە لە بنەماڵەی بارزانی شەیتانیش قبووڵ بکەن، تازە لەدوا چرکەدا بە زەلیلی دێنە هەولێر، بۆئەوەی رێکبکەون لەگەڵ بنەمالەی بارزانی و بە تەبایی هەموو شتێک تەسلیمی ئێراق بکەنەوە !وا باڵکردنی ئێران دەستپیپێکردووە، هەربزانە بەم زوانە سوپای ئێراق گەڕایەوە بۆ سەرسنوورەکانی ئێرانیش، بەڵام رەنگبێت بۆ ئێران تۆزێک جیاوازتر بێت، سەرەتا هەوڵبدرێت لە بەغداوە رۆلی کەم بکرێتەوە، ئەم گۆڕانکاریە خێرایانە واتای ئەوەیە دۆخەکە دەگەڕێتەوە بۆ پێش دەستپێکردنی هەژموونی جیهانی ئەمریکاو دەستپێکردنی سیستەمی تاکجەمسەری، واتە قۆناغی بەهێزکردنەوەی ئێراق و بە تامپۆنیبوونەوەی کوردستان، بۆیە دەبێت کوردستان بۆ ماوەی چەندین سالی تر بچێتەوە قۆناغێکی تر لە بندەستی و کۆیلایەتی، لەجیاتی ئەوەی لەماوەی بیست و نۆ ساڵدا وڵاتێک ئاوەدان بکەنەوە، وڵاتیکیان وێران کرد، لەجیاتی ئەوەی ناوچە بەعەرەبکراوەکانی کوردستان رزگاربکەن، لەبەعس و هەموو رژیمەکانی تر

خراپتر کوردستانیان تەعریب کرد، ئەوەی ئێستا جگە لە ئاشبەتاڵێک هیچی تر نیە، کورد لە دانووستانەکان خراوەتە دەرەوەو تاکە رێگا لەبەردەمیدا ماوەتەوە ئەوەیە بەزەلیلی خۆی بخاتەوە بەر قاپی بەغداو داوای مەرحەمەتی لێبکات، بەڵام لەدواجاردا بەغدا بەهیچ رازی نابێت ئەمەش، بێگومان ئەمەش لەپیناو کورد نیە، بەڵکو تەنیا لەپێناو رزگارکردنی سەری خۆیان و ئەو پارانەیە، کە دزیویانە، فەرموو با ئەو ملوێنان دۆلارەی دزویتانە، جگە لە ریسوابوون بتوانێت شتێکی ترتان بۆ بهێنیت، فەرموون ئەو پارانەی لەماوەی رابردوودا شەڕتان لەسەر دەکردو مندالی کوردتان لەپیناو بەکوشتن دەدا، دەبێت بە مەمنونیەوە بیگەڕێننەوە بۆ بەغدا، بەغدای عروبەو پایتەختی ئێراق، بەڵام دڵنیابن ئەمجارەیان وەکو ئاشبەتالی 1975 نابێت، ترسنۆکانە تێیتەقێنن و ئەوەی دزیوتانە ببەن و رابکەنە ئەو دیو سنوورەکان، چونکە سنوورەکانیشتان لێگیراوە، ئەمجارە خەلکی کوردستانیش نەک هەر دواتان ناکەوێت بەڵکو، بەپشوودرێژیەوە چاوەروانی ئەوە دەکات تۆلەی بیست و نۆ سال لەجاشایەتیتان لێبکاتەوە، ئێوە هیچتان لەبەردەست نەماوە تەنیا وەک پەیکەرێکی بەتاڵ بەکاردەهێنرێن و مامەڵەتان پێوەدەکرێت بۆ لیدانی مەسەلەی کورد، بەراستی گەورەترین دەستکەوتی ئێوە لەو ماوەیەی حوکمڕانیە سەقەتە، سووک کردنی مەسەلەی کوردو هەڕاجکردنی نیشتمانیک بوو، لەکوێن ئەوانەی هێندە حیسابیان بۆ هیچ کەس نەدەکرد، لەکوێن ئەوانەی لەخۆبایی ببوون و وەک قارەمانێکی راستەقینە خۆتان بەرامبەر گەلەکەتان نیشان دەداو وەک ترسنۆکیش لەبەردەرباری دوژمنانتان هەلدەلەرزین، لەکوێن ئەوانەی هیچ حیسابیان بۆ رای گشتی کوردستان نەدەکرد، کوا ئەو سوپاو چەک و تفاقەی هەتانە، کوا ئەو هێزانەی

بەناوی پێشمەرگەی کوردستانەوە لەپێناو مانەوەی خۆتان بەکارتاندەهێنا، کوا ئەو هیزانەتان، کە تا ئێستا ئامادە نەبووە و نەیتوانیوە تەقەیەک بەسەرکەوتوویی دژی هیچ دوژمنێک بکات، کوا ئەو ئۆپۆزسیۆنە گەمژەیەی بەبێئەوەی تێیبگات شەڕی حوکمی پەرلەمانی و سەرۆکایەتی دەکرد، لەکوێن ئەو ئەکادیمست و چڵکاوخۆرو کاسەلێسانەی حزبەکان، کە ئەو بەناو سەرکردە ترسنۆک و نەزانانەیان لە خەلکی کوردستان کردبووە پێغەمبەر، قارەمانی سەر شاشەکان لەکوێن، دەی باهەمدیس دەست بەدەهۆڵ لێدان و حەکیمی سەرۆکەکانیان بکەنەوە، کە چۆن و بەچ زانایەکیەوە سوپای ئێراقیان هێنایەوە ناو قووڵایی کوردستان، باسی ئەو مناوەرە سیاسیە گرنگەش بکەن، کە سەرکردە پێشمەرگەو قارەمانەکانی ئەوان دەیکات و بەغداو ئێران و تاران و ئەنقەرە دەکات بەگژ یەکدا، باسی شێخ و بەگ و سکرتێرو سەرۆکی کۆمارو تەڕەماشەکانتان بکەن، دەی دیسان ئەو ریسواییە بکەنە سەرکەوتنی بێوێنەو مێژووی ئەو میللەتەی پێفریو بدەن، فەرموون بەرگری لەکوردستان مەکەن، تەنیا لەو پارانە بکەن، کە دزیوتانە، تازە بەنهێنی سەردانی یەکتر دەکەن و دەتانەوێ ئاشت بنەوە؟! وەک کورد گوتەنی " پاشی تڕی خەپشەی برێ"، تازە بۆچی ئاشت دەبنەوە!، تازە بۆچی ئەو چاکسازیە مەهزەلە ئامیزە دەکەن، کە 29 سالە مێشکی خەلکی کوردستانتان پێکاس کرد، تازە هیچ شتیک سوودی نەماوە ئەو دەرفەتە زێڕینەی رەخسا، هەمووتان کردە قوربانی خۆتان، دەبڕۆن سەرکردەو بنکردە خائینەکانی کوردستان، دەبڕۆن ئاو ئاو چن و بەغدا نیوەی رێتان بێت.!

2\7\2020

## با خۆمان بەهانای جووتیاری کورد بچین

## هەنگاوێک بۆ کەمپینێکی سەرتاسەری، کە هیوادارم هەموو تاکێکی کورد بەم ئەرکە نیشتیمانیە هەڵسێت

هەموو ساڵێک کاتێک بەرهەمی ناوخۆ پێدەگات، کێشەی بەبازاڕکردنی ئەو بەرهەمانە دێتە بەرباس و دیمەنی ئەو جووتیارە بێئومێدو رەنج بەخەسارانەی بەدیار بەرهەمەکانیانەوە دانیشتوون، دووبارە دەبێتەوە، هەمیشە رەخنە لە حکومەتیش دەگیرێت، کە ناتوانێت ئەو کێشانە چارەسەر بکات، بەبێئەوەی بزانین هەندێک کێشەی گەورە هەیە بە هەنگاوی بچووک چارەسەر دەکرێت، بۆ نمونە کاتی خۆی هیچ کەسێک دۆشاوی تەماتەی نەدەکڕی، کەلتوورێکی هیندە جوان لە ئارادابوو، کە خەڵک پێیان وابوو، دۆشاوی تەماتەی قووتووکراو شتێکی پیس و قێزەونەو ئەوانەی بەکاریاندەهینا ژمارەی ئێجگار کەم بوو، لە جیاتی ئەوە کاتی رنینەوەی تەماتە هەر ماڵەی چەند سندووقێک تەماتەی دەکڕی و هەندێکی وشک دەکردەوە، کە پێیان دەگوت لەتکە تەماتەوەو بۆ زستانیان هەڵدەگرت، بەشێکی تریشیان دەکردە دۆشاوی تەماتە، ئەگەر لەو ماوەیەدا سەیری سەربانی ماڵەکانت بکردبوایە، بەڕێز سینی پڕ لە دۆشاوی تەماتەت دەبینی لە تەک یەکدا دانرابوو دیمەنێکی جوان و دڵڕفێنی بەو سەربانانە دەبەخشی، ئەمە بۆ زۆر لە بەرهەمەکانی تریش گونجاوو لەبارە، بۆیە بەباشی دەزانم لە لایەک وەک یارمەتیدانێک بۆ جووتیاری کورد و

بەردەوام بوونی پرۆسەی پشتبەستن بە بەرهەمی خۆماڵی، لەلایەکی تر بۆ پاراستنی تەندروستنی خۆمان و دوورکەوتنەوە لەو لەقووتوونراوانەی، کە لەدەرەوە بۆمان دێت و کەس نازانێت چۆن بەچ شێوەیەک دروست کراون، ئەو کەلتوورە جوانە زیندووبکەینەوە، دیارە بەشێکی زۆری ئەو بەرهەمە لەقوتوونراوانە، لەو دەوڵەتانە دێت، کە خۆیان بە دوژمنی باوەکوشتەی کورد دەزانن و وەک شەڕێکی بایۆلۆژی هەموو گومانیکی خراپیان لێدەکرێت، بۆیە پێویستە ئەو کەلتوورە زیندوو بکەینەوەو خۆمان فێربکەین لە بازاڕیش تا بەرهەمە خۆماڵیەکان هەبێت بەرهەمی بیگانە نەکڕین، با هەر حکومەت لە پێناو بەرژەوەندیەکانی خۆی و فشاری دەرەکی نەتوانێت سنوورەکان دابخات، ئەگەر تۆ رۆشنبیری ئەوەت هەبێت تا بەرهەمی خۆمانە هەبێت بەرهەمی دەرەوە نەکڕیت، ئەو کاتە ئەو بەرهەمانەی دەرەوە، کە بەراوردکرنیان بە بەرهەمە خۆماڵیەکانەوە زۆر خراپترن وبەهۆی دووری رێگاکان زۆر درەنگتر دەگەنە بازاڕەکان، هیچ بەهایەکیان نامێنێت، گەلانی پێشکەوتوو تا بەرهەمی خۆیان هەبێت، ئەگەر گرانتریش بێت، بەرهەمی بێگانە ناکڕن، ئەوان دروشمیکی جوانیان هەیە، دەڵێن جووتیاری ئێمەش مرۆڤەو دەبێت ژیان بکات و کار بکات، بۆیە بۆ ئەوەی جووتیاری کوردیش ژیان بکات و بەرەو پێشەوە بچێت، فەرموو هەرئێستا برۆ بازاڕو چەند سنددوقێک تەماتە بکڕەو خۆت بیکە بە دۆشاوی تەماتە، کە لەهەموو رووێکەوە تۆ قازانج دەکەی جووتیارانی کوردیش قازانج دەکەن، فەرموو لەجیاتی گلەیی، بڕیابدەو خۆت کێشەکە چارەسەر بکە.

2020\7\7

## تورکیاو پارتی دیموکراتی کوردستان

### دەستێک لەنێو تەڵەو سەرێک لەبەردەم چەقۆی قەساب

زۆر کەس واتێدەگات، کە پەیوەندیەکی پتەو لەنێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و تورکیادا هەیە، ئەو بیرکردنەوە ساویلکەیە گەیشتۆتە ئەو رادەیەی ساڵانە لە زانکۆکانی هەرێمی کوردستان، چەندین توێژینەوە دەربارەی پەیوەندیەکانی نێوان تورکیاو هەرێمی کوردستان بنووسرێت، کە لەراستیدا هیچ پەیوەندیەک لەنێوان تورکیاو هەرێمی کوردستاندا نیە، تا ئێستا تورکیا وەک قەوارەیەکی سیاسی مامەڵە لەگەڵ هەرێم ناکات، بەڵکو وەک هەرەشەیەکی جوگرافی سەیری ئەم بەشە دەکات و تەنانەت بە بەشێک لە خاکی تورکیای لە قەڵەم دەدات، کەکار بۆ گەڕانەوەی دەکات، راستە قونسوڵگەری تورکیا لە هەولێر هەیە، بەڵام ئایا تورکیا رێگای داوە، کە نوێنەرایەتی هەرێمی کوردستان لە تورکیادا هەبێت، ئایا ئەو کونسوڵگەرییە کاری کونسوڵگەرییەکی ئاسایی دەکات، یاخود پێگەیەکی گرنگی تورکیایە لەهەرێم بۆ گەڕاندنەوەی ویلایەتی مووسڵ!؟

لە راستیدا پەیوەندیەکەی تورکیا لەگەڵ پارتێکی سیاسیە، کە ئەو ناوچانەی لەژێر دەستدایە، کە هاوسنوورە لەگەڵ تورکیاو کونسوڵگەری تورکیاش لەهەرێم کار بۆ گەڕاندنەوەی ئەو بەشە دەکات، نەک کاری تر، واتە وەک بەشێک لە دەزگایی هەواڵگری تورکیا کاروباری داگیرکردنی

هەرێمی کوردستان، کە ئەوان دەڵێن باکووری ئێراق، یاخود ویلایەتی مووسڵ بەڕێوە دەبات، تەنانەت دەتوانین بڵێین تورکیا هیچ پەیوەندیەکی سیاسیشی لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستاندا نیە، بەڵکو وەکو هێزێکی خێڵەکی سەیری دەکات و لە پێناو بەرژەوەندی و ستراتیژیەتیەکانی خۆی بەکاریدەهێنێت، بۆیە لە هەر گۆڕانکاریەکداو هەر کاتێک ئەو کارە بەکۆتا هات، رەنگ بێت پارتی خۆی ببێتە یەکەم قوربانی دەستی تورکیا، پێناچێت کاتێکی زۆریش بۆ ئەو قوربانی بوونە مابێت! چونکە ئێستا تورکیا گەیشتۆتە قۆناغێک توانیویەتی نەک کایە گرنگەکانی هەرێمی کوردستان، تەنانەت کایە گرنگەکانی ناو خودی ئەو حزبەش کۆنترۆڵ بکات، ئەمە جگە لەوەی ناوچە هەستیارو ستراتیژیەکانی ژێر دەستی ئەو پارتەشی کۆنترۆڵ کردووەو رۆژ بە رۆژ زیاتر ئابڵووقەکەی سەری بەر تەسک دەکاتەوە، تەنانەت ناوچەی بارزان، کە بنکەی سەرەکی پارتیە، لە ئێستادا کەوتۆتە بەر رەحمەتی سوپای تورکیا، ئەمە سۆنگەی ئەوەیە لە ئێستادا پارتی هاواری لێهەڵسێت و هوشیار زێباری داوا لە حکومەتی ئێراق بکات سنوورێک بۆ تورکیا دابنێت، بە بێئەوەی هەست بەوە بکات، کە لە بنەڕەتدا گەمەیەکی سیاسی لەنێوان تورکیاو ئێراقدا هەیەو هەردوولایان هاوبەرژەوەندین لە بچووککردنەوەی چوارچێوەی هەرێمی کوردستان!

لێرەدا پرسیارێک دێتە ئارا، ئایا گریمانەی ئەوە دەکرێت رۆژێک تورکیا پارتی و سەرکردایەتیەکەی وەک پرۆژەیەکی سیاسی تەسلیم بە

ئێراق، یاخود هەردەوڵەتێکی تر، یا هەر دەزگایەکی نێونەتەوەیی بکاتەوە؟ یاخود بەلایەنی کەم دەستیان لێبەردات و گورگان خواردوویان بکات؟ بە داخەوە وەڵامی ئەو پرسیارە بەڵێیە، چونکە تورکیا ئەزموونێکی زۆری لەم بوارەدا هەیە و ئەو سیاسەتێکی پراگماتیکیانە جێبەجێدەکات، نمونەی ئەم سیاسەتەش روون و ئاشکرایە، وەک سەرۆک وەزیرانی پێشووی تورکیا داودئۆغڵو لە وتارێکیدا ئاماژەی پێدەکات، چۆن تورکیا لە سەردەمی ستالین ئازەربایجانەکانی تەسلیم بە یەکێتی سۆڤیەت کردەوە، لە ئێستاشدا بە هەمان شێوە، پەنجا هەزار کەس لە بەرهەڵستکارە ئیگۆریەکان، کە پەناهەندە بوون لە تورکیا تەسلیم بەتاجیکستان کردۆتەوە، بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ تەسلیم بە چین بکرێنەوە، جا ئەگەر تورکیا ئیگۆرەکان، کە بەڕەگەز تورکن و دەکەونە چوارچێوەی پرۆژەی توورانی گەورە، تەسلیم بەچین بکاتەوە، بۆچی ئاسایی نابێت رۆژێک سەرکردەکانی پارتی و تەنانەت سەرکردەکانی حزبەکانی تریش، کە لەژێرەوە دەستیان لەگەڵ تێکەڵکردووە، تەسلیم بە ئێراق، یاخو بە هەر دەوڵەتێکی تر بکاتەوە!؟ ئەمە ئەوە دەردەخات، کە پارتی دیموکراتی کوردستان لە ئێستادا نەک بەهێزترین حزبی کوردی نیە لەباشوور، وەک بانگەشەی بۆ دەکرێت و دەهۆڵی بۆ دەکوترێت، بگرە حزبێکە پڕ بەواتای وشەکە بە بارمتە گیراوە، لەدۆخێکی زۆر هەستیارو ئاڵۆزدا دەژی و دەستی کەوتۆتە ناوتەڵەی تورکیاو سەریشی کەوتۆتە بەر دەم چەقۆی قەساب.

2020\7\31

## مێژوو لەرابردووەو بۆ ئایندە، نووسینەوەی مێژووی ئایندە

مێژوو یەکێکە لە مەترسیدارترین ئەو چەکانەی دژی میللەتان بەکاردێت، لەرێگای مێژووە میللەتان بەکۆیلە دەکرێن، لەڕیگای مێژووەوە شەرعیەت بە دەسەڵاتە نا شەرعیەکان دەدرێت، لەرێگای مێژووەوە شەڕێکی رۆشنبیری ترسناک بەڕێوە دەچێت، ئەمەش هەمووی دەرئەنجامی تێگەیشتنێکی تەقلیدی و چەق بەستووە بۆ مێژوو، کە بەداخەوە زۆربەی گەلانی دنیای گرتۆتەوە، بەتایبەتی گەرنی ئەو ناوچانەی جیهانی سێیەمیان پێدەگوترێت، کە یەکیک لەوانە میللەتی کوردە، بەداخەوە نغرۆی جەهالەتی مێژوو کراوەو مێژوو خراپترین رۆڵی لە کۆیلە کردن بە کۆیلە هێشتنەوەی بینیوە، زانکۆکان و کایە ئەکادیمیەکانیش نەزانانە کار لەسەر پیرۆزرکردن و هێشتنەوەی ئەو نەزانییە دەکەن!

بەریتانیەکان کاتێک هیندستانیان داگیرکرد، مێژووێکیان لەسەر بنەمای ئەو میرنشینانە نووسیەوە، کە بوونە داردەستی ئەوان و بەرژەوەندیەکانی ئەوانیان دەپاراست، واتە مێژوویان هیندستانیان کرد بە مێژووی راجاکان، لەکاتیکدا نزیکەی بەر لە 11 هەزار ساڵ هیندستان یاسای خۆی هەبووە و تەنانەت زۆر لە توێژەران پێیان وایە فەلسەفەی گریکی، کە بەباوکی فەلسەفەی رۆژئاوایی دەناسرێت، لە ژێر کاریگەری فەلسەفەی هیندیدا بووە، بەمەش بەریتانیەکان هەوڵیاندا لەسەر بنەمای مێژووێکی ساختەوە کەسایەتیەکی هیندی وا دروست بکەن، کە ببێتە

کۆیلەو گوێڕایەڵی ئەوان، واتە مێژوو لە پیشەسازی دروستکردنی کۆیلەدا بەکاربهێنن!

کورتکردنەوەی مێژوو لە رابردوو، واتە دوورخستنەوەی مرۆڤ لە چرکەساتەکانی ئێستاو فۆرمۆڵەکردنی دنیابینی خۆی بۆ دواڕۆژ، بە واتایەکی تر پیرۆزکردنی رابردوو و بێبەها کردنی ئێستا، کە ژیانی راستەقینەیەو چرووک پێکردنی ئەو ئایندەیەیە، کە مرۆڤ بە ئاڕاستەی ئەودا هەنگاو دەنێت و کار دەکات بۆ ئەوەی ئەو خەونانەی تیا بەدیبێنێت، کە لە چرکەساتەکانی ئێستا دا بەدیهینانیان ئاستەنگە یاخود ئاسان نیە، کە ئەمەش جۆرە کۆیلایەتیەک بۆ رابردوو بەرهەم دەهێنێت و رەوڕەوەی پێشکەوتنەکان بەرەو ئایندەیەکی گەشترو باشتر دەوەستێنێت، مرۆڤ لە بوونەوەرێکی ئاوەزمەندەوە دەکاتە بوونەوەرێکی وەهمدار، ئەو کاتە هیچ بەهایەک بۆ ژیانی راستەقینە نامێنێتەوە لەرێگای پیشەسازی دروستکردنی وەهمەکانەوە، مرۆڤەکان هەمیشە لە ژیانی راستەقینە دووردەخرێنەوەو دەخرێنە خزمەت وەهمەکان! لەو کاتەدا مرۆڤ شێوەی رۆبۆتێک وەردەگرێت و لەلایەن وەهمەکانەوە ئاڕاستە دەکرێت و ژیانە پیرۆزەکەی خۆی دەکاتە قوربانی کۆمەڵێک وەهمی دروستکراوی پیرۆزکراو.

کورتکردنەوەی مێژوو لە رووداوەکانی رابردوو واتە پارچە پارچەکردنێکی ناتەندروستانەی یەکەکانی زەمەن، کە لەبنەڕەوە بەشێوەیەکی سروشتی بەیەکەوە گرێدراون و لەیەکتر جیا ناکرێنەوە، کرۆکی ئەو یەکانەش زەمەنی ئێستایە، واتە ئەگەر بچووکترین یەکەی

زەمەن خورد بکەینەوە، لە سێ چرکە سات پێکدێت، رابردوو، ئەو چرکەیەی رۆڵی فیزیکی خۆی تەواو کردو تێپەڕیوە، چرکەساتی ئێستا، ئەو زەمەنی پرۆسەی ژیانی تیادا بەردەوامەو بەکۆتا نەهاتووە، چرکەساتی ئاییندە، ئەو چرکەساتەیە، کە هێشتا نەهاتووە، مرۆڤ بەشێوەیەکی ئاوەزمەندا پلانی بۆ دادەنێت و ژیانی خۆی بەئاراستەی ئەو تەکان پێدەدات. ئەو چرکانە لە دووتوێی چرکەساتی ئێستادا بەتوندی بەیەکەوە بەستراون، بەڵام چرکە رەسەنەکە چرکەکانی ئێستایە دەبێت هەردوو چرکەکانی تر لە خزمەت ئەودا بن، نەک بەپێچەوانەوە، چونکە ئەو ژیانی راستەقینەیە، وەلێ ئەمە واتای بێبەها کردنی رابردوو و ئێستا نیە، کە یەکێکیان تێپەڕیوەو ئەوەی تریشیان هێشتا نەهاتووە، پێویستە ئەو دوو چرکە ساتە بەچڕی لە خزمەتی ئێستا بە پلەی یەکەم و ئاییندە بەپلەی دووەم دابێت، هەرچەندە رابردوو و ئاییندە لە زۆر خاڵدا هاوبەشن، بۆ نمونە لە هەردوو چرکە ساتەکە دروستکەرانی رووداوەکان راستەوخۆ لەسەر تەختەی رووداوەکان نین، لەچرکەساتی رابردوو کەسەکان ئەرکەکانیان تەوا کردووەو ئێستا ئێمە وەکو وەزیفەی کارەکانیان مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەین، لەچرکەساتی ئاییندەش بەهەمان شیوە، کەسان دیارنین و هێشتا نەهاتوونەتە سەر تەختەی شانۆکە، دەمانەوێت لەرێگای تێکەڵکردنی رابردوو بە ئێستا رۆڵێکان بۆ دروست بکەین، بۆ ئەوەی بەشێوەیەک بێنە بەرهەم، کە مرۆڤ لە قۆناغێک لە قۆناغەکانی مێژووی خۆیدا هەوڵی بۆ دەدات و کاری بۆ دەکات، بۆیە نووسینەوەی راستەقینەی

مێژوو، دەبێت مێژووی ئاینده بێت، بەمەش سەرلەبەری پرسیارەکان دەبێت هەڵبوەشێنرێتەوە، چۆن ژیاوین، چەمکێکە تێپەڕیوەو دەبێت هێندە بایەخی پێببەخشین، کە خزمەت بە چرکەسلتەکانی ئێستاو ئاینده دەکات، نەک بکرێتە کاراکتەری سەرەکی و مێژوو لەو کورتبکریتەوە، کە بەداخەوە ئێستا لە زانکۆکانی کوردستان مێژوو بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەلدا دەکرێت، ئەمەش وایکردووە جگە لەچەند درۆیەکی گەورەو پیشەسازیەکی ساختەی ڕووداوەکان هیچ شتێک دروست نەبووبێت، کە ئێمە شانازیەکی ڕاستەقینەی پێوە بکەین و فریو نەخۆین، تەنانە خودی شانازیەکانیش داگیرکراون خراونەتە خزمەت پرۆسەی بەکۆیلە کردنەکە، بۆیە پێویستە لە مەودوا سەیری مێژوو بکەین وەک ڕووداوەکانی ئاینده و چۆن پلانی بۆ دادەنێین، چۆنمان گەرەکە ئاڕاستەی بکەین، نەک ڕووداوە کۆنەکان ئێمە ئاڕاستە بکەن!. بۆیە دەبێت لەمەودوا هەوڵبدەین مێژووی بۆ ئاینده دروست بکەین و سەرلەنوێ و بە چەمکێکی نوێوە سەیری مێژوو بکەین.

2020\8\22

## بیرەوەریەک لەگەڵ دەزگای سەردەم

ساڵی 1999 ماستەرنامەکەم( کوردستان لەنێوان ململانێی نێودەوڵەتی و ناوچەیدا) تەواو کردو گفتوگۆی لەسەر کرا، هەوڵمدا وەکو کتێب چاپی بکەم، لەهەولێر لەگەڵ دەزگایەکی بڵاوکردنەوە قسەم کرد، کە بەرپرسەکە کۆنە برادەرێکم بوو، بەڵام ئامادەنەبوون چاپی بکەن، لەرێگای برادەرێکەوە پەیوەندیم کرد بە دەزگای سەردەم، ئەوان بەخۆشحاڵیەوە پێشوازیان لەکتێبەکردو بڕیاریاندا چاپی بکەن، دوای ئەوە وا هەستم کرد ئەو برادەرەی هەولێر زانیبووی کتێبەکەم ناردۆتە سەردەم، بۆیە گوتیان کتێبەکەت بێنە ئێمە بۆت چاپ دەکەین، منیش بێدەنگ بووم و بڕیارم دا بڵاوبوونەوەی کتێبەکە وەک وەڵامێک بێت بۆ ئەوان، هەر واش دەرچوو، دوای ماوەیەکی کەم کتێبەکە کەوتە بازاڕو پێشوازییەکی باشی لێوەکرا، دوای ئەوە لە دەرفەتێکدا سەردانی دەزگای سەردەمم کرد، چووینە لای شێرکۆ بێکەسی شاعیر، کە بەرپرسی ئەو دەزگایە بوو، سەرەتا منی نەناسی، دواتر کە زانی من خاوەنی ئەو کتێبەم زۆر بەشێوەیەکی پۆوەتیڤانە قسەی لەسەر کتێبەکە کردو روونیکردەوە، کە کورد پێویستی بەم جۆرە توێژینەوانە هەیەو راشکاوانە هانیدام بۆئەوەی بەردەوام بم لەسەر ئەو کارە. ئەوەی جێگای سەرسامیە دوای ئەوەی کتێبەکە کەوتە بازاڕەوە ئیدی لە کۆلیژەکەی خۆم کێشەم بۆ دروست دەکراو رێگەیان نەدا بگەڕێمەوە کۆلیژ، راگرەکەی ئەو کاتی راشکاوانە پێی گوتم کاکە بۆ لە

سلێمانی و له دەزگای سەردەم کتێب چاپ دەکەیت، منیش بەراستی سەیرم بەو بیرکردنەوەیە هات، گوتم من مرۆڤێکی ئەکادیمیم کێ کتێبم بۆ چاپ بکات لای من گرنگ نیە، ئیدی ئەو چاپکردنە زۆر کێشەی بۆ دروستکردم بووە یەکێک لەو هۆکارانەی دەرفەتی خوێندنم لەهەولێر نەمێنێت، بۆیە دوای ئەوەی رژێمەکەی سەدام رووخا چوومە زانکۆی موسڵ و دکتۆراکەم لەوێ تەواو کرد.

2020\4\9

## دیوه ڕاستەقینەکەی شەڕی خواکوڕک

### ئەوەی، کە لەشەڕی خواکوڕکدا دیزە بە دەرخۆنە کراوە

یەکێک لە کێشەکانی کورد بەتایبەتی لەسەدەی بیستەم مێژووەکەیەتی، کە کۆمەڵێک ئەفسانەو شتی ناڕاستی تیا گەورە کراوە لایەنەو باڵا دەستەکان چۆنیان گەرەک بووە وایاننوسیوەتەوە، بەشێوەیەک، کە بۆتە بنەمایەکی ترسناک بۆ پەروەردەکردنی تاکی کورد لە ئایندەدا، بەراستی یەکێک لەو چەکە ترسناکانەی دژی خەڵکی کوردستان بەکارهاتووە، چ لەلایەن دوژمنانی کورد، یاخود ئەوانەی بەناوی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردەوە خەڵکیان فریوداوە، مێژووە، بۆیە زۆر پێویست و گرنگە سەرلەبەری ئەو مێژووە بخرێتە ژێر پرسیارو سەرلەنوێ لەلایەن کەسانی پسپۆڕو شارەزاو ئەکادیمی ڕاستەقینە بنووسرێنەوە!

پارتی دیموکراتی کوردستان، وەک حزبێک، کە تەمەنی زیاتر لە حەفتاو شەش ساڵە پشکی شێری بەردەکەوێت لە چەواشەکردن و ساختەکردنی ئەو مێژووە، زۆر بە زانایانە ئەو قۆناغەیان ساختەکردووەو چۆن لەبەرژەوەندی ئەواندا بووە وایاننووسیوەتەوە، بێگومان ئەم خووە خراپە هەموو حزبەکانی تریشی بەپلەی جیاواز گرتووەتەوە، ئەوانیش یا ئەم ساختەکردنەیان لەبەرژەوەندی خۆیان بینیوەتەوە، یاخود هێندە

بوێرییەیان نەبووە ڕاستیەکان بدرکێنن، کە ئەمەش بە هەردوو دیوەکەی بەشداریکردنە لە تاوانەکە.

شەڕی خواکوڕک یەکێکە لەو ڕووداوانەی میدیاکانی پارتی ساڵانە یادی دەکەنەوە و بەرنامەی دۆکیومینتاری دەربارە دەکەن و نووسەرەکانی شتی لەسەر دەنووسن، بەڵام تەنیا باسی ئەو شتانە دەکەن، کە لەبەرژەوەندی ئەوانەو خۆیان لەقەرەی هەموو ڕاستیەکان نادەن، کە ئەمەش پێچەوانەی هەموو میتۆدەکانی نووسینەوەی مێژووە، کە ناکرێت بەشێک لەڕووداوەکە باس بکەیت و بەشەکەی تری فەرامۆش بکەیت. (ولا تقربوا ال×لاة) ەکەی بنووسیت و ( وانتم سکاری) یەکەی فەرامۆش بکەی!

لە ڕاستیدا شەڕی خواکوڕک بەشێک بوو لەشەڕی ئێراقی – ئێرانی و دوورو نزیک هیچ پەیوەندیەکی بە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردەوە نیە، هێزە کوردیەکان بە وەکالەتی ئێران و بەناوی بەرگریکردن لە بوونی کوردەوە ئەو شەڕەیان کرد، ئەو شەڕە دەکەوێتە قۆناغەکانی کۆتایی شەڕی ئێراق – ئێران، ڕاستە ئەو شەڕە بەگوێرەی بڕیاری 0598 ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی لە مانگی تەموزی ساڵی (1987) وەستێنرا، بەڵام ئێران بەردەوام فشاری دەکردو دەیویست شەڕەکە لەبەرژەوەندی خۆی یەکلایی بکاتەوە، چونکە ڕاگرتنی شەڕ بۆ ئێران وەک ڕابەری شۆڕشی ئیسلامی ئێران (ایە اللە خمینی) گوتی : "وەک خواردنەوەی پەرداخێک ژەهر وابوو"، بۆیە سەرباری ئەو بڕیارەی

ئەنجومەنی ئاسایش شەڕ بەردەوام بوو، تاوەکو لە کۆتایدا لەژێر هەڕەشەی ڕۆکێتی زەمین – زەمینی و زەمین – ئاسمانیەکانی ئێراق، ئێران ناچار بوو شەڕەکە بوەستێنێت، هەندێک پێییان وایە تاوەکو 20 ئابی 1988 بەردەوام بوو،، ئەو شەڕە وەک (هنری کیسنجەر) دەڵێت:" درێژترین شەڕ بوو لەسەدەی بیستەم و هیچ لایەک تیایدا سەرکەوتوو نەبوو!". ئەو مێژووە ڕێک هاوکاتە لەگەڵ شەڕی خواکوڕک، کە لە 1988\7\19 دەستیپێکردو لە 1988\8\28 بە کۆتا هات.

دیارە، کە لەشەڕی ئێراق – ئێران هێزەکانی پارتی شان بەشانی سوپای ئێران دژی سوپای ئێراق دەجەنگان، پێشکەوتن و چاوساغی کردنی پارتی بۆ سوپای ئێران دەرئەنجامی کارەسات ئامێزی لەسەر گەلی کورد لێکەوتەوە، کە یەکێک لەو دەئەرنجامانە بەداخەوە ئەنفالکردنی بارزانیەکان بوو، هەرچەندە ئەو حیزبە سوودی لەو ئەزموونە تاڵە وەرنەگرت و بەردەوام بوو لە چاوساغی و شەڕکردن بۆ ئێران.

بەرلەهەموو شتێک دەبێت ئەو ڕاستیە بزانین، کە شەڕی خواکوڕک بە تەنیا پارتی دیموکراتی کوردستان تیا بەشداری نەکرد، بگرە حزبە هاوپەیمانەکانیشی لە حزبی شیوعی و سوسیالیست و ئاشی مەلابەختیارو حزب الله کەی ئەدهەم بارزانیش بەشداریان تیا کرد، کەچی ئێستا پارتی بە تەنیا باسی خۆی دەکات و زۆینەی ڕاستیەکانیش دەقرتێنێت! هیچ کەسێکیش لەوانەی بەشداری ئەو شەڕەیان کردووەو لە

ڕۆژگارێکدا خۆیان بە شۆڕشگێرو قارەمان زانیوە تا ئێستا بوێری ئەوەیان نەبووە ڕاستیەکان وەک ئەوەی هەیە باس بکەن!.

وەک ئاماژەی پێکرا شەڕی خواکوڕک بەوەکالەت بۆ ئێران دەکرا، هێزە کوردیەکانیش وەک سەرە ڕم لەلایەن ئێرانەوە بەکاردەهێنران و لەدواوە یارمەتی دەدران، قۆناغەکانی سەرەتایی شەڕەکە بەم چەشنە دەستیپێکرد، تا لەکۆتایدا پاسدارە ئێرانیەکان ڕاستەوخۆ هاتنە ناوشەڕەکە، هەر ئەمەشە وایکردووە پارتیەکان لە نووسینەکانیاندا باسی کۆتایی شەڕەکە نەکەن، ئەو هێزەی ئێران پاسدارە خۆبەختکەرەکان بوون و زیانێکی زۆریان بەسوپای ئێراق گەیاند، لەدواجار خۆشیان زیانێکی زۆریان بەرکەوت، ناچار لەدواجاردا کشانەوەو بەهۆی وەستانی شەڕەوە ئێراق ئەو ناوچانەی داگیرکردەوە.

یەکێک لەو کەسانەی چاوپێکەوتنم لەگەڵیدا کردووەو خۆی بەشداری شەڕەکەی کردووە، کە نەیوست ناوی بهێنم، بەو شێوەیە کۆتاییەکانی شەڕی خواکوڕکی بۆ گێڕامەوە:" من لەبەرەی پێشەوەی شەڕەکە بووم لە خواکوڕک، نامەیەکم لە حزبەکەمەوە بۆ هات، کە دەست بەجێ و هەرچۆنێک بێت بگەڕێمەوە دواوە، کە گەڕامەوە (ناوی چەند بەرپرسێک دێنێت) لەناو خیوەتێک دانیشتبوون، ئاگاداریان کردمەوە، کە بەهیچ شێوەیەک نابێت لەخێوەتەکە دەربچم، وەک پێیان گوتم ئەو شەوە کاتژمێری سفر دیاریکرابوو، پاسدارێکی ئێجگار زۆر هاتبووە ئەو ناوچەیە بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر سوپای ئێراق، بۆ ماوەیەک وەک دەست

بەسەرکراوێک لەنێو خێوەتەکە هێڵرامەوە، بۆئەوەی بڕۆم تەنیا یەک ڕێگایان بۆ دانام، کە من دەبێت لەناوچەکە بڕۆم و جێیبهێڵم، هەر ئەو شەوە شەڕێکی گەورە لەنێوان پاسدارانی ئێران و سوپای ئێراق روویداو هەردوولا زیانێکی زۆریان بەرکەوت". هەر ئەو بەرپرسە باسی ئەوەی کرد، کە بەڕێز (مسعود بارزانیش) زۆر لە دوورەوە، کە چەند چیایەک دوور بوو لەبەرەی شەڕەکەدا، وەکو دەڵێن لە دوورەوە بە دووربین سەیری شەڕەکەی دەکرد، کەچی ئێستا میدیاکانی پارتی بەشێوەیەکی تر باسی دەکەن و شێوازێکی ئەفسانەیی پێدەبەخشن ، شانازیەکان هەموو بۆخۆیان و سەرکردەکەیان دەگەڕێننەوە، هەرچەندە ئەو شەڕە بە وەکالەتە هیچ شانازییەکی بۆ کورد تێدانیە!.

2020\9\3

## زۆر بەکورتی.....

### پەرلەمان و سیاسەتمەدارە دانسقەکان!!!

بۆ ماوەی 30 ساڵە لە شارو چل ساڵیشە لەشاخ بەشیوەیەکی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ یاری بە چارەنووسی ئەو میللەتەوە دەکەن، لە سایەی ئەواندا چەندین هەزار گەنج بەکوشتن درا، چەندین هەزاریش وڵاتی بەجێهێشت و پەڕاگەندەی وڵاتان بوو، لە سایەی ئەواندا ئابووری وڵات داڕما، ئەوان دەوڵەمەند بوون و بوونە خاوەنی کۆمپانیاو بیرە نەوت و پاڵاوگە، خەڵکیش کەوتە سەر ساجی عەلی، پیاوەکانی خۆیان چەندین مووچەو کاریان بۆ دابینکرا، مووچەیی خەڵکی ئاسایشیان بڕی، شەڕی ناوخۆیان کردو بەدڕندەترین شێوە گەنجەکانی یەکتریان ڕەشەکوژ کرد، ئەوەی جنێوی ناشیرینیە هێنایانە ناو فەرهەنگی کوردی، لەرێگای میدیا سەقەتەکانیانەوە کەلتوورو بەهاکانی کۆمەڵگای کوردیان لەرەگەوە هەڵتەکاند، ڕاستیەکانیان شێواندو کۆمەڵگەیەکیان لەسەر درۆ بینا کرد، سوپایەکی ئەلیکترۆنیان دروست کرد، نەخویندەواری بۆینباخ لەبەریان کردە مامۆستای زانکۆو رۆشنبیرو نوسەر، تەنیا بۆ ئەوەی ڕاستیەکان پەرتەوازە بکەن و مێژوویێکی ساختە بۆ ئەوان دابڕێژن و ترسنۆکی و دۆڕاندنەکانیان بە قارەمانیەتی نیشانی نەوەکانی داهاتوو بدەن!. لەرێگای

سوشیال میدیاکانەوە، ئەفەندی و پیاوی بەتەمەن و لەخۆگەڕاوەیان فێری جنێوی سووک و قێزەون کرد، هەرچی جوانی هەبوو لەو کۆمەڵگایەدا ناشرینیان کرد، ئەوەی ناشرین و قێزەون بوو هێنایانە ناو کۆمەڵگا، لەگەڵ هاتنی ئەوان تریاک و حەشیشەو جۆرەها مادەی هۆشبەر رووی لەکوردستان کرد، لەشفرۆش و سیخوڕو چەتەکانی هەموو هەرێمەکە مۆڵگەیان گواستەوە کوردستان، ئەوەی دام و دەزگا هەبوو هەڵیانوەشاندەوەو دامودەزگای خێلەکانیان لەشوینیان دانا، تەنانەت وەزیفەشیان کردە ویراسی، نەک کاڵا بەقەد باڵا نەما بگرە ئەوەی خراپ بوو لەجێی باشیان داناو ئەوەی باش بوو پشتگوێخراو شاربەدەر کرا، وڵاتیان والێکرد بێگانەیەک تیایدا زیاتر هەست بە ئارامی و ئاسوودەیی بکات، لەو هاوڵاتییەی خوینی خۆی بۆ کردۆتە قوربانی! تورکیاو ئێرانتان هێناو لەپێناو مانەوەی خۆتان و بنەماڵەکانتان کوردستان تەسلیمکردن، لە 31 ئاب سوپای ئەنفالچی و دڕەندەی بەعستان هێناوە، لە 16 ئۆکتۆبەر نیوەی کوردستانتان تەسلیم بە حەشدی شەعبی کرد و ترسنۆکانە سەنگەرەکانتان بەو پێشمەرگە قارەمانانە چۆڵکرد، کە بەگریانەوە سەنگەرەکانی خۆیان جێدەهێڵا، ناوی کوردو پێشمەرگەو کوردستانتان سووک کرد، خەڵکتان والێکرد قێز لە کوردبوونی خۆی بکاتەوە، دایکی شەهیدتان ناچارکرد، کوردستان وەکو ئەمانەت تەسلیمی کازمی بکات! جوتیاری کوردتان والێکرد بە عەرەبیەکی شڕوور لەبەردەم بەرپرسەکانی حکومەتی عێراقی بپاڕێتەوەو بێتە سەرچۆک، تەنیا بۆئەوەی پارەی رەنجی

شانی خۆی بدەنێ، ئەو مامۆستایانەی هەرگیز بۆ مووچە سەری بەرزیان نەوی نەدەکرد، بە چەند ساڵێک واتان لێکرد دروشمی (کازمی تۆ بۆ ئێمە لازمی) بەرزبکەنەوە!. لەوەش سەیرتر دوای ئەو هەموو کوشت و بڕینە بۆ خەڵکی تازە ئاشکرای دەکەن، کە ئێوە مام و برازای یەکترن، تالەبانی ئەو جنۆکەیەی ئاما نەبوون دەستی بخەنە ناو دەستی، ئێستا جێگای بەتاڵ بووەو بۆ خەڵکی ڕووندەکەنەوە، کە چەند پێویست بووە بۆ کوردستان و جێگای چەند بەتاڵەو دوای ئەو کوردستان دووچاری چ مالوێرانیەک بووە!.

دوای ئەو هەموو کارەساتە ئامۆزاکانی شیری، لە پەرلەمان لە تەنیشت یەکتر دادەنیشن و باس لە شەرعیەتی خۆیان دەکەن، باس لەسەرکەوتنەکان و دەستکەوتەکانی خۆیان دەکەن، باس لە بێتاوانی خۆیان لەو هەموو تاوانەی دەرهەق بەوڵات و خەڵکی ئەو وڵاتەیان کردووە، بەراستی نازانم چۆن وەسفی کارامەییان بکەن، هیچ وشەیەک نادۆزمەوە پێناسەی ئەو سیاسەتمەدارە دانسقانەی پێبکەم، چونکە هەموو مێژوو گەڕام نمونەیەکی لەو شێوەیەم دەستنەکەوت، تەنانەت نیرۆنیش وا مامەڵەی لەگەڵ ڕۆما نەکردووە!!!

2020\10\7

## لەنێوان لقی چوارو لقی پێنجی پارتیدا

له شوباتی 2011 چەند گەنجێک خۆپیشاندانیان کرد لەسلێمانی، ڕێڕەوەی خۆپیشاندانەکان وەک دەڵێن بە بەردەم لقی چواری پارتی دیموکراتی کوردستان تێپەڕی، بە نەزانی بووبێت یاخود بە زۆرزانی، چەند گەنجێکی خوێن گەرم بەردیان گرتە بارەگای لقی چوار، کۆمەڵێک چەکدار لەسەربانی لقەوە بە بیکەی سی و کلاشینکۆف دەسرێژیان له خۆپیشاندەران کردو چەند منداڵ و کەسی بێتاوانیان شەهید کرد، بیانووی پارتی ئەوەبوو ڕێگا نادات و لەهیچ کەسێکی قبووڵ ناکات، که دەسدرێژی بکاتە سەر بارەگاکەیان، هێندە مەسەلەکەیان ئاوەژوو کردبووەوە، وەک ئەوە بارەگای پارتی مزگەوتێک بوو بێت و سووتێنرابێت، کەچی دوای زیاتر له 9 ساڵ ، واتە ئەمڕۆ، که دەکاتە 2020\10\17، واتە هەمان 17 مانگ، بەهۆی لێدوانێکی هوشیار زێباری، ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی، که تیایدا بەزمانی حەشدەکان، سووکایەتی بەحەشد کردبوو، خۆپیشاندەران پەلاماری بارەگای لقی 5 پارتیان داو ئاگریان تێبەردا، بەڵام ئەوە جێگای سەرسوڕمانە، هیچ کەسێکمان نەبینی لەسەرەوە بە بیکەیسی و کلاشینکۆف تەقە لەخۆپیشاندەران بکات، وەک بەرپرسی ئەو لقەی پارتی له میدیاکان رایگەیاند، سکاڵا لەسەر حکومەتی ئێراقی تۆمار دەکەن، هەر دوای ئەوەش لێدوانی هوشیار زێباری بڵاوبۆتەوە، که

لەلێدوانەکەی پێشووتری دژی حەشدی شەعبی پەژیوان بۆتەوەو ئەو هێزە نەک بە میلیشیا بەڵکو بەهێزێکی دەستووری هەژمار دەکات و ئاماژە بەوە دەکات، کە رۆڵی گەورەیان لە شەڕی داعش دا بینیوە، بەڵام وادیارە لێرەدا زێباری رۆڵی حەشدی لە داگیرکردنەوەی کەرکووک لەیادچووەو فەرامۆش کردووە!. ئەو هەنگاوەی پارتی لە بەغدا هەنگاوێکی دروستە، ناکرێت لەپێناو بارەگایەک خەڵکی تووڕەو خۆپیشاندەر گولە باران و تیرۆر بکرێت، بەڵام کێشەکە لەوەدایە ئەوەی لە سلێمانی و لەبەردەم لقی 4 پارتی لە 17 شوباتی 2011 روویدا، رێک پێچەوانەی ئەو هەڵوێستەیە! ئەگەر ئەوە سروشتی پارتی بێت و بەرامبەر بێگانە ترسنۆک و بەرامیەر خۆیش قارەمان و کەڵەگا بن، ئەوە ئەو هەڵوێستەیان لێقبووڵ دەکرێت و هیچ شیکردنەوەیەک بەخۆوە هەڵناگرێت، ئەگەر گۆڕانکاریش بێت لە سروشتی ئەو حیزبەو بمانەوێت وەک بەرەو پێشوەچوونێک لەهزری سیاسی ئەو حیزبە شیکردنەوەی بۆ بکەین، ئەوە دەبیت ئەو حیزبە دەم و دەست تاوانیارنی 17 شوبات، ئەوانەی تەقەیان لەخۆپیشاندەران کردو منالی هەژارانیان تیرۆر کرد بداتە دەست دادگا، چونکە ناکرێت لەسەر ئەوەی بەرد بگیرێتە بارەگاکەت خەڵک گولە باران بکەیت و خەڵکی تریشت بارەگاکەت بسووتییێت پەنا بۆ دادگا ببەیت، ئەمە بابەتێکەو دەبیت پارتیەکان وەڵامی خەڵکی کوردستان بدەنەوە....

2020\10\17

## یەکێتی وگۆڕان و گەمەیەکی قێزەون

هەرێمی کوردستان بە دۆخێکی قێزەون و ترسناکدا تێدەپەڕێت، لە دووڕیانێکدایە، کە هەموو هێزە هەرێمیەکان بە چاوساغی هێزەکانی کوردی بۆی لەبۆسە دان و دەیانەوێت نەک بە تەنیا وڵاتەکە وێران بکەن، بەڵکو مرۆڤی کوردیش تا ئەوپەڕی ریسوابوون ریسوای بکەن، کە جێگای داخە لەمەشدا هەنگاوێکی باشیان بڕیوەو سەرکەوتنی گەورەیان بەدەستهێناوە.

لەم دۆخە نالەبارە، لەجیاتی ئەوەی هەموو هێزەکان یەکبخرێن بۆ رووبەڕوبونەوەی دوژمنان و باشترکردنی ژیانی خەڵک، کە زۆر لێزانانە سیاسەتی ریسواکردن و برسیکردنی بەرانبەر پیادە دەکرێت، لەکاتێکدا تورکیا خەریکە باشوور بە تەواوی داگیر دەکات و بنەماڵەی بارزانی پێشبڕکێیانە لەسەر خزمەتکردنی ئەو وڵاتە دوژمن بە کوردە، لەکاتێکدا ئێران هەموو کایەکانی زۆنی سەوزی کۆنترۆڵکردووە و منداڵ و برازاکانی تاڵەبانی بوونەتە بووکەڵەیەک بەدەست ئێران، ئا لەوکاتە خەڵکی کوردستان بە گەمەیەکی قێزەون خەریک دەکرێت و نیگاکانی لەسەر مەسەلە بنەڕەتیەکان دوور دەخرێتەوە، هەموو کێشەکان لە ململانێ لەگەڵ پارتی کورتدەکرێتەوەو هەموو میدیاکان باسی گەندەڵیەکانی دەسەڵات و بە قاچاخبردنی نەوت و کۆنترۆڵکردنی گومرگەکان و ... هتد خەریکن.

نیگاکان هەمووی ئاڕاستەی پارتی دیموکراتی کوردستان کراوەو وەک سیناریۆیەکی قێزەون دەیانەوێت خەڵکی پێ فریو دەن.

دیارە زۆرینەی هەرە زۆری ئەوانەی دەربارەی پارتی دەگوترێت راستین و خەڵکی ئاسایی هەستی پێدەکات، با گریمانی ئەوە بکەین پارتی هەموو ئەو شتانەی کردووە، کە باس دەکرێن، ئەمە نیوەی هاوکێشەکەیە، بەڵام ئێستا نیوەکەی تر یەکێتی و گۆڕانن، کە خۆیان باسی کۆیلایەتی دەکەن و کەچی تۆوی کۆیلایەتی لەناخی خۆیاندا چێنراوە، بۆ دەبێت بەس پارتی تاوانبار بکرێت لەکاتێکدا ئەو دوو حزبە هەردووکیان بەشدارن لە حکومەت، وەزیرو بەرپرسەکانی ئەو دوو حزبە هیچیان لە وەزیرو بەرپرسەکانی پارتی باشتر نین ئەگەر خراپتر نەبن، ئەوان بۆخۆیان هەموو شتێک دەکەن و مێچکە مێچکە بۆ پارتی دەکەن بۆ ئەوەی سڵاوێکیان لێبکات، ئەوی ئەوە سەرۆک و هاوسەرۆک و رێکخەرە گشتیەکان نین لەبەردەم چاوی کامیراکان بۆ تەوقەیەک لەگەڵ ئەندامێکی بنەماڵەی بارزانی وەک هەولێریەکان دەڵێن سۆزگ بووینە!، ئەوە ئەوان نین باسی هەموو شتێک دەکەن، لەسەر هەموو شتێک لەگەڵ بنەمالەی بارزانی ناکۆکن بەڵام لەسەر پارەو دابەشکردنی سەروەت و سامانی کوردستان نوقەیان لێوە نایەت، ئەمەش واتای ئەوە نیە وەک برابەش هەموو شتێکیان لەگەڵدا بەش کردوون. هەرکاتێکیش هەست بە مەخدووری خۆیان بکەن میدیاکان و پەرلەمان دەخەنە کارو مێشکی خەڵکی پێ خەریک

دەکەن، لەکاتیکدا خەڵک خۆی ماندووەو لەوپەری خراپیدایە! یەکێتی و پارتی خۆیان لە حکومەت نین، ئەگەر راست دەکەن با وەزیرو بەرپرسەکانی ئەوان ئەو دۆخە چاک بکەن! بۆ چاکی ناکەن. پێیانکرێت؟ ئەگەر دەڵین پارتی هەموو دەسەڵاتەکانی قۆرخکردووە بۆ قبووڵی دەکەن؟ بۆچی لە حکومەت ناکشێنەوە، ئەگەر پەرلەمان وا بێبەها بووە بۆ لەپەرلەمان ناکشێنەوەو داوای هەڵبژاردنی پێشوەختە ناکەن؟ ئایا لە خۆتان نەپرسیوە بۆچی وەزیرەکانتان سەرباری ئەوەی دەسەڵاتەکەیان لە چوارچێوەی ژوورەکانیان رەتناکات، کەچی وەک ئەوەی دنەیان گرتبێت بێدەنگن! پارتی هێز دەجولێنیت و تورکیا بەردەوامە لە داگیرکردنی کوردستان، کوا هەڵوێستی وەزیری پێشمەرگە، خۆ ئەو وەزیرەش یەکێتیەو پارتی نیە، ئەگەر هیچ دەسەڵاتێکی کردەیی نیە خۆ دەتوانێت دوو قسە بکات و راستیەکان بۆ خەڵک ئاشکرا بکات، بۆی نایکات؟ ئەگەر دەڵێن وەزیرێکی بێدەسەڵاتە بیگۆڕن، دواتر ئەوە ئیوەن داتاننناوە! ئایا تواناو دەسەڵاتی گۆڕینی وەزیری خۆشتان نیە؟ ئەگەر دەڵین پارە نیەو مووچە دابەش ناکرێت خۆتان وەک بەرگری کار لە خەڵک و قووتی خەڵک نیشان دەدەن، ئەوە وەزیری دارایی هی گۆڕانە، بۆچی کەس گوێی لە دەنگی نابێت، ئەگەر دەسەڵاتی نیەو وەک هەندێک لە رۆژنامەنووسەکان دەڵێن تەنیا ژمێریارێکی پارتیەو ئەرکی ئەوەیە مانگانە ئەو پارانە دابەش بکات ، کە پارتی دەیداتێ بۆچی قبووڵی دەکەن، نازانن ئێوە بەرپرسن؟ نازانن

خەڵک تاقەتی ئێوەی نەماوەو ئەگەر ئێوە رەخنە لە پارتی دەگرن، ئەوا ئێوە لای خەڵکی کوردستان دەهێندەی پارتی ناحەزو دزێو بووینە!.

بەڕاستی کاتی ئەوە هاتووە ئەو گەمە قێزەونە راگرن، دڵنیا بن ئەگەر هار گۆڕانکاریەک روویدات ئێوە بەر لە پارتی بەر شەقی جەماوەرو تۆڵەی خەڵک دەکەون، خەڵکی کوردستان هوشیار بۆتەوەو ئێستا کەس بەو سیناریۆیە قێزەوانە فریو ناخوات، ئەگەر راست دەکەن یا لە حکومەت بکشێنەوەو پەرلەمان چۆڵ بکەن یا بێدەنگ بن، ئەوە ئێوەن بە مانەوەتان لە و حکومەت و پەرلەمانە شەرعیەت بە رەفتارە دزێوەکانی پارتی دەدەن، ئەوە ئێوەو حیزبەکانتانن پارتیان کردۆتە کەڵەگا بەسەر خەڵک، ئەگینا پارتی لە لاوازترین دۆخی خۆیدا دەژی، ئەوە ئێوەن فریاد ڕەسی پارتین و لەپێناو بەرژەوەندیە کەسی و بنەماڵەییەکانی خۆتان هەموو شتێک قبووڵ دەکەن، دەمەوێت راشکاوانە روونیبکەمەوە ئەوە بەهێزی پارتی نیە دۆخەکەی بەو رۆژە گەیاندووە، بەڵکو ئەوە لاوازی و بوودەڵەیی ئێوەیە، ئەوە بەرپرسەکانی ئێوەن بەرامبەر پارە دەڕووخێن و لە ئاست پارتی چاویان هەڵنایەوەو قرقەپ مووچەو خەڵاتەکانی خۆیان وەردەگرن، ئەوە بەرپسەکان ئێوەن شانازی بەو کۆشک و تەلارانەوە دەکەن، کە پارتی بە سەدان دەفتەر دۆلار بۆی کڕیون، ئایا ئەو شتانە نازانن؟ هەرمیدیا سێبەرەکانی خۆتان نیە وەک بەشێک لە ململانێیە ناوخۆییەکانتان ئەو زانیارانە بۆ خەڵک دەگوازنەوە؟ گۆڕانەکان و

یەکێتیەکان لەخۆیان نەپرسیوە بۆچی هەرکەسێک دەنێرنە ناو حکومەت دوای ماوەیەک پارتی بوونی خۆیان رادەیەگەیەنن و دەبنە دەستە راست و دەستە چەپی بنەماڵەی بارزانی؟ ئەوە لە بەهێزی پارتیە، یا لە لاوازی و هەڵپەرستی و دووڕوویی ئیوەیە؟ باشە ئەگەر پارتی هێندە بەهێزە بۆ دان بەو راستیە نانێن و راستەوخۆو راشکاوانە بەیعەتی پێنادەن؟ بۆئەوەی خۆتان لە بەرپرساریەتیەکە بدزنەوەو ئەو کاتە هەرچەیک بڵێن و هەموو شانەکان لەسەری پارتی بشکێننەوە خەڵک باوەڕتان پێدەکات، یاخود دەتانەوێت هەمیشە بەردەوام بن لە فریودانی خەڵک و لە میدیاکان بەناوی رەخنەوە جنێو بەپارتی بدەن و لەژێرەوە پۆست و پارەی زیاتری لێوەربگرن! دڵنیا بن لەو قۆناغە هەستیارەی کۆمەڵگاکەمانی پێدا ڕەتدەبێت، ئەگەر ئێوە لە پارتی زیاتر بەرپرسیار نەبن، کەمتر بەرپرسیار نین، بۆیە یا هەڵوێستێکی جدی وەرگرن، کە دڵنیام لەو ئاستەدانین ئەو هەڵوێستە وەرگرن، یا چیتر خەڵک لەرووی دەروونیەوە ماندوو مەکەن، کە خۆی لەهەموو لایەکەوە شەڕی دەروونی لەگەڵ دەکرێت، بەردەوام بن لەو کاروانەی هێناوتانەو هەرگیزرێگای زبڵدانی مێژوو بەرمەدەن، کە تانزە ناتوانن بەرییدەن!.

2020\11\30

## پێکهاتن لەگەڵ بەغدا یا تەسلیمبوونەوە بە بەغدا...!

کۆمەڵێک پێوەر هەیە بۆ ئەوەی هێزێک، بچێتە ناو گفتوگۆو دانوستانەوە دەربارەی کێشەیەک لە کێشەکان، رەنگ بێت گرنگترین و سەرەکیترین پێوەر پەیوەست بێت بە دۆخی هێزی هەر یەک لەلایەنە دانوستانکارەکانەوە، بەواتایەکی تر پەیوەست بێت بە هاوسەنگی هێزەوە، هەر کاتێک لایەک لە لایەکان هەستیکرد هاوسەنگی هێز لەبەرژەوەندی ئەودایە، هەوڵدەدات مەرجەکانی خۆی بسەپێنێت، بۆیە باشترین دانوستان و رێکەوتنامە، کە بەرژەوەندی هەردوولا بپارێزێت لەو کاتانەدا دەبێت، کە هێزەکان هاوسەنگ بێت هیچ لایەک هەست نەکات دەتوانێت لەرێگای بەرکارهێنانی هێزەوە ئامانجەکانی خۆی بێنێتە دی، هەر کاتێک تێچوونی بەکارهینانی هێنانی هێزکەمتر بوو لە دەستکەوتەکان، بێگومان لایەنی بەهێز پەنا بۆ بەکارهێنانی دەبات، لەو حالەتەشدا لایەنی لاواز ناچیتە ناو دانوستانەوە بۆ ئەوەی بەرژەوەندییەکانی خۆی بێنیتە دی، بەڵکو دەچێتە ناو دانوستانێک بۆ ئەوەی ئەو مەرجانە قبووڵ بکات، کە لایەنی هێزدار بەسەری دەسەپێنێت!

لەو روانگەیەوە، ئەوەی ئێستا لەنێوان هەولێرو بەغدا دەگوزەرێت، کە جێگای داخە بەشێکی زۆری خەڵکی لە کوردستان بە پێکهاتن لەگەڵ

بەغدا ناوزەدی دەکەن، مەسەلەکە بەهیچ شێوەیەک پەیوەندی بە پێکهاتنەوە نیە، ئەوەی ئێستا لەنێوان بەغداو هەولێر دەگوزەرێت ناکەوێتە چوارچێوەی رێکخستنی بەرژەوەندیەکانەوە، بەڵکو دەکەوێتە چوارچێوەی مل پێکەچکردن و تەنانەت تێکشکاندن، لەبەرئەوەی هاوسەنگی هێز لە ئێستادا تا رادەیەکی زۆر لەبەرژەوەندی بەغدایە، بەرامبەر ئەمەش دۆخی هەرێم لە هەموو ئاستەکاندا لەوپەری شپرزەییدایە، لەپێشەوەی هەموان مەسەلە ئابوریەکە، کە بۆتە چەکێک بەدەست بەغداو هاوکات بەدەست ئەو هێزە ناوەخۆییانەی خۆیان وەک ئۆپۆزسیۆن دەردەخەن و بەناوی بەرگریکردن لە مووچەو بژێوی خەڵک داوای پێکهاتن و چوونە بەغدا دەکەن.

بەرلەهەموو شتێک پێویستە نکووڵی لەو راستیە نەکەین، کە پێویستە پەیوەندیەکان لەگەڵ بەغدا لە چوارچێوەی دەستووری ئێراقدا ئاسایی بکرێتەوە، هەرچەندە ئێراق بەهیچ شێوەیەک لەگەڵ جێبەجێکردنی دەستووردا نیەو نزیکەی 15 ساڵ بەسەر دەرچوونی ئەو دەستوورەدا تێپەڕیوە، ئامادە نەبووە مادەی 142 جێبەجێبکات، کە بە روحی کێشەکانی نێوان بەغداو هەرێم دادەنرێت. لەکاتێکدا لە سەرەتای دەرچوونی ئەو دەستوورە، هاوسەنگی هێز لەبەرژەوەندی هەرێمدا بوو، بەغدا ئامادە نەبوو ئەو کێشانە چارەسەر بکات، ئێستا چۆن چارەسەری

بکەن، کە هاوسەنگیە نەک لەسەر ئاستی ناوخۆیی بەلکو لەسەر ئاستی هەرێمی و جیهانیش لەبەرژەوەندی ئەواندا گۆڕاوە!

زۆر سەیرە، هەموو کێشەی کورد لە مووچەو چوونە بەغدا چڕ کراوەتەوە، لەکاتێکدا بەغدا یەکێکە لەسەرچاوە سەرەکیەکانی کێشەکە!. گومانی تیا نیە، کە حزبە دەسەڵاتدارەکانی کوردی نەک هەر لەئاستی ڕووداوەکاندان نەبووینە، بەڵکو ئەوەی ئەوان بە میللەتی کوردیان کردووە دوژمنیش هێندەی نەکردوە، بەڵام کارەساتەکە لەوەدایە مەسەلەی نەتەوەیەک لەچاوی چەند حزبێکەوە بخوێنرێتەوە!.

چوونە بەغدا لەو ئێستادا نەک کێشەکان چارەسەر ناکات، بەڵکو قووڵتری دەکاتەوە، ساویلکەییە وا تێبگەین ئەگەر شاندی حکومەتی هەرێم بچێتە بەغدا بەگوڵ پێشوازیان لێدەکرێت و بەغدا پارە بەسەر هەرێم دادەبارێنێت!، لەکاتێکدا بۆ هەمووان ڕوونە بەغدا خۆی لە قەیرانێکی ئابوریدایە، مەسەلەی نەوت و تەسلیمکردنی دەروازە سنووریەکان لە ژێر پەردەی جێبەجێکردنی دەستوور، تەنیا تەکتیکێکی سیاسیە و بەغدا دەیەوێت سوود لەو دۆخە وەربگرێت بۆ ئەوەی قەوارەی هەرێم هەڵوەشێنێتەوە، ئەگینا ئەگەر نیازیان جێبەجێکردنی دەستوور بوایە کێشەکان نەدەگەیشتە ئەو ئاستەی ئێستا، ڕاستە دۆخەکە ئێجگار سەختە، بەڵام لەو قۆناغە هەستیارە پێویستە نیشتمانیانەو نەتەوەییانە بیر بکەینەوە نەک حزبیانە، ڕەنگ بێت ئەو دۆخە ئاڵۆزە وایکردبێت

نەتوانرێت راستیەکان ببینرێت، بەڵام تێکچوونی هەرێم دۆخەکە باشتر ناکات، بەڵکو دەیگەڕێنیتەوە ژێر خاڵی سفر، ئێستا خەڵکی کورد لە ژێر کاریگەری میدیای نابەرپرس روی لە بەغدا کردووەو دەستی بۆ بەغدا پان کردۆتەوە، بە بێئەوەی بیر لەوە بکاتەوە، کە بەغدا دەیەویت تا سەر ئیسقان ریسوای بکات و چۆکی پێدابدات، ئەو شەڕەی لەگەڵ هەرێم دەکرێت لە راستیدا شەڕە لەگەڵ خەڵکی کوردستان، نەک لەگەڵ پارتی و یەکێتی، چونکە ئەو حیزبانە بەرژەوەندیەکانی خۆیان پاراستووە، بەڵام ئەوە خەڵکی کوردستانە دەبێت باجەکەی بدات، دەبێت مەسەلەی چوونە بەغدا بۆ ماوەیەک رابگیرێت و کورد وەک تاوانبارێک و دۆڕاوێک نەچێتەوە بەردەم بەغدا، دەبێت هەولبدرێت کێشەکان لە ناوەخۆ چارەسەر بکرێت، دەبێت تێگەیستن و لێکنزیکبوونەوەی زیاتر لەنێوان هێزەکانی ناوەخۆ هەبێت تا لەسەر ئاستی نێو دەوڵەتی گۆڕانکاریەکان دەگەنە قۆناغێکی تر، دەبێت لەیەکەوە بەرپرسیارەتی قۆناغەکە هەڵبگرن، ئەوەی ئێستا داوا دەکرێت پیکهاتن نیە بەڵکو تەسلیمبوونەوەیە بە بەغدا، ئەمەش واتای لەگۆڕنانی خەونی میللەتێکە، کە هەزاران قوربانی لەپێناو ئەو رۆژە داوە.

2020\12\1

## دیکتاتۆریەتی یاسا

کاتێک ڤلادیمێر پوتین لە ساڵی (2000) جڵەوی دەسەڵاتی لە روسیا گرتە دەست، لە جیاتی دروشمەکانی دیموکراسی و مافی مرۆڤ، واتە لەجیاتی پرەنسیپەکانی لیبراڵی، کە دوای روخانی سۆڤیەت روسیا، بە تایبەتی لەسەردەمی یەلتسین هەوڵیدەدا خۆی لەگەڵیدا بگونجێنێت، دروشمی دیکتاتۆریەتی یاسای بەرزکردەوە. لەو کاتەدا رووسیا لەدۆخێکی ئابوری سەختدا دەژیاو کۆمەڵێک کەسانی مشەخۆرو مافیاو بەرژەوەندیخواز، کۆنترۆڵی ئابووری ئەو وڵاتەیان دەکردو بەرەو هەڵدێریان دەبرد. پوتین وەک خۆی لە زۆر شوێندا ئاماژەی بۆ کردووە، دیموکراسی بە بێبوونی دادپەروەری کۆمەڵایەتی هیچ بەهایەکی نابێت، بۆیە دەیویست لەرێگای سەپاندنی یاساوە جۆرە یەکسانی و دادپەروەریەک بێنێتە دی، یاخود بەلایەنی کەم وڵاتەکەی لەو پاشا گەردانیە رزگار بکات، لەمەشدا رووبەرووی هەموو هەرەشەیەک بووەوەو ئامادەی هەموو قوربانیدانێک بوو. بۆیە سەرکەوتنی بەدەستهێناو دوای چەند ساڵێک روسیا لە ناوەخۆ خۆی گرتەوە، بە گورپوتینێکی نوێوە گەڕایەوە سەر تەختەی شانۆی نێودەوڵەتی و هەمدیس بووەوە بە یاریزانێکی بەهێز لە سیاسەتی جیهانیدا. کەواتە مەسەلەی بەهێزکردنی بەرەی ناوخۆو کارکردن لەسەر دادپەروەری کۆمەڵایەتی و ئابووری تاکە رێگایەکە بۆئەوەی ئەو گەلانەی لە رۆژهەلات

دەژین بتوانن بەسەر کێشەکانیاندا زاڵ بن و دیموکراسی راستەقینە لەو رێگایەوە دابین دەکرێت.

ئەمە ئەوەمان بۆ روونده‌کاتەوە، کە لەکوردستان، بە بێبوونی و یاساو دەستێکی بەهێز بۆ جێبەجکردنی یاسا، بەهیچ شێوەیەک ناتوانرێت کێشەکان چارەسەر بکرێت، ئەو خزبانەی ئێستا لە گۆڕەپانەکەدان نەبوێری و نەتوانای جێبەجێکردنی یاسایان هەیە، دروستکرنی دیکتاتۆریەتی یاسا تواناو لێهاتوویی زۆری دەوێت، دەسەڵات بەڕێوەبردن بە هەست و سۆزو پاراستنی بەرژەوەندی کەسی و بنەماڵەیی ناکرێت، یا دەبێت بۆ وڵات و نیشتمانەکەت هەوڵبدەیت، یا دەبێت رەچاوی بەرژەوەندیەکانی خۆت و بنەماڵەکەت بکەیت، ئەم دوو رەهەندەش بەهیچ شێوەیەک لەگەڵ یەکتردا یەکناگرنەوە. سوڵتانەکانی عوسمانی لەپێناو سەقامگیرکردنی دەسەڵات کوڕو براکانی خۆیان دەکوشت، راستە لەمێژوودا زۆر رەخنە لەو رەفتارە دەگیرێت، بەڵام ئەگەر بەوردی خوێندنەوەی بۆ بکەیت، ئەوپەڕی قوربانیدان و لە خۆبووردەییە لەپێناو سەقامگیری وڵات، کەس هەیە دەستی بچێتە خوێنی منداڵەکانی خۆی یاخود برای خۆی ئەگەر ئامانجێکی ئێجگار لەو هەست و سۆزە گەورەتری نەبێت!؟ لە سەردەمی حکومەتەکەی شێخ مەحمود، کاتێک سمکۆی شکاک هاتە سلێمانی یەکێک لە ئامۆژگاریەکانی بۆ شێخ مەحمود ئەوەبوو، کە پێویستە شێخ عەبدولقادری برات بکوژی، چونکە پێی وابوو عەبدولقادر هۆکارێکی

گەورەی ناعەدالەتی و گەندەڵی بوو لە حکومەتەکەی شێخ، شێخ دەستی نەچووە ئەو کارە، بەڵام دواتر سەری حکومەت و دەسەڵاتەکەی خۆی لەسەر دانا!.

دیکتاتۆریەتی یاسا یەکێکە لەو ئامرازە گرنگانەی دەتوانێت رۆڵێکی گەورە بگێڕێت لە چارەسەرکردنی بەشێکی زۆری کێشەکانی هەرێم، بەڵام ئایا ئەو ئیرادە هەیە؟ جێگای داخە ئەوانە خۆیان پێ سەرکردە بووە کەسایەتی ئەوەیان نەبووە لێپێچینەوە نەک لە کوڕوبراو کەس و کاریان بکەن، بەڵکو لە پیاوەکانیشیان بکەن، تاوانەکانیان هەرچەندەو هەرچۆنێک بووبێت، بە پێچەوانەوە تاوانەکانیشیان بۆ شاردوونەتەوەو بەرگریشیان لێکردوون، ئەوان لە پەنای ئەو دروشمەوە کاریان کردووە، کە :" پیاوەکانی خۆیان شەرمەزار ناکەن!"، ئەو دروشمەش هەرگیز لەگەڵ یاساو دەوڵەتداریدا یەکناگرێتەوە. ئەگەر بەناو سەرکردەکانی کورد نیشتمانپەروەرو وڵاتپارێز بوونایە، بەم چەشنە مامەڵەیان لەگەڵ وڵاتەکەیان نەدەکرد، با بارزانی یا تاڵەبانی کوڕێک یاخود برایەکی خۆیان نەک بکوشتبوایە، کە دەبوایە لەپێناو نیشتمان ئەو کارە بکەن، تەنیا سزا بدابوایە، ئەو کاتە ئەوانەی خوارەوە کەس زاتی نەدەکرد بەم شێوەیەی ئێستا وەک دڕندە بەربێتە گیانی خەڵک و چارەنووسی نەتەوەکەی، ئەوان نەک هەرئەوەیان نەکرد بگرە بەپێچەوانە چاویان لێپۆشین و تەنانەت هانیشیان دان بۆ ئەوەی یاری بەچارەنووسی

ئەم میللەتەوە بکەن. بۆیە کێشەی سەرەکی و بوونی گەندەڵی، ئۆباڵەکەی بەپلەی یەکەم دەکەوێتە ئەستۆی کەسی یەکەمی دەسەڵات، ئەگەر ئیرادەی چاککردنی دۆخەکە هەبێت فەرموو یاسا جێبەجێ بکەن، لە کەسە نزیکەکانی خۆتانە دەستپێکەن تا عیبرەت بدەنە ئەوانەی تر، ئایا ئەوان ئامادەن ئەو کارە بکەن؟ بێگومان نەخێر، ئەمەیە کێشەی بنەڕەتی کورد!.

2020\12\5

## خۆپیشاندانەکان و تووڕەییەکی پیرۆز

خۆپیشاندان و تەنانەت دەتوانین بڵێین سەرەتای راپەڕینێکی تر دەستیپێکردووە، گەنجان رژاونەتە سەرشەقام و تووڕەیی خۆیان بە داروبەرد دەردەبڕن و تۆڵەی ئەو بێهەستی و نابەرپرسیاریەتیەی دەسەڵاتی کوردی لە هەموو شتێک دەکەنەوە، چاویان هیچ نابینیت و تەڕو وشک بەیەکەوە دەسووتێنن، لە راستیدا ئەمە تەنیا تووڕەیی چین و توێژێکی گەنج نیە، بەڵکو تووڕەیی بێهیوا بوونی زۆرینەی کۆمەڵگایە، کە پەڕاوێز خراون، دەرئەنجامی ئەو ناعەدالیەتیە یە، کە لەماوەی 30 ساڵی رابردوودا لەو هەرێمە گوزەراوە، کەمینەیەک دەستی بەسەر هەموو شتێکدا گرتووەو زۆرینەی خەڵکیش ، لە هەموو شتێک بێبەشکراوە و بە تەواوی پەڕاوێز خراوە، ئەو چینە باڵا دەست و نابەرپرسە لە پێناو هێنانەدی خەونە نەزۆکەکانی خۆیان خەونی هەموو تاکێکی ئەو کۆمەلگایەیان زیندە بەچاڵ کرد، ئەوان لە دۆڵێکدا دەژین و خەڵکیش لە دۆڵیکی تر، بۆیە هەرگیز ناتوانن لە ئازارو مەینەتیەکانی ئەو گەنجە تووڕەو یاخیانە تێبگەن، کە هەموو هەوڵێکیان نەک بۆ رزگارکردنی ئێستایە بەڵکو بۆ رزگارکردنی ئایندەو خەونەکانیانە، ئەو گەنجانە چیتر بە پاساوە بێسەرو بەرەکانی ئەوان فریوناخۆن، ئەوە ئەوان نین شتەکان بێبەها دەکەن، ئەوە ئەوان نین رێزی هیچ شتێک ناگرن و بارەگاکان و دەزگاکانی حکومەت دەسووتێنن، بەڵکو ئەو حزبانەن، کە بەهایان بۆ هیچ شتێک نەهێشتەوەو هەموو شتێکیان سووک کردوە، ئەو گەنجە تووڕانە بەسەر کەلتوورێک داکەوتوون، کە هەموو پیرۆزیەکانی ئەم نیشتمانەی سووک کردووە، ئەوان بەرامبەر

کەسانێک راپەڕیون، کە لە ماوەی 30 ساڵدا بەردەوام ئەو نیشتمانە هەتک دەکەن، ئەو گەنجانە ئەگەرچی زۆر تووڕەن، ئەگەرچی هەندێک کار دەکەن، کە نابێت بیکەن، بەڵام ئەو گەنجانە سەرەتایەک بۆ قۆناغێکی نوێ دادەڕێژن، کە چیتر بارەگاکانی حزب و سیخوڕەکانی حیزب لەناو کۆلان و تەنانەت لەناو خێزانەکاندا نەمێنێتەوە، ئەوانە رێز بۆ نیشتمان دەگەڕێننەوەو بەها بۆ کۆمەڵگا دروست دەکەنەوە، هیچ تووڕەییەک نیە وەک فریشتە ئاسا هەڵس و کەوت بکات، ئەوان خۆپیشان دەکەن و ژانە بێسوێیەکانی خۆیان دەردەبڕن، هیچ کاتێکیش و لە هیچ کۆمەڵگایەکیش ئەو تووڕەبوونە فریشتەییانە نابێت، هەرچەندە گومانی ئەوەش دەکرێت، کە کەسانێک بۆ ناشرینکردنی خۆپیششاندانەکان ئەو کارە دزێوانە بکەن!.

بۆیە پێویستە گوێیان لێبگیرێت و داواکانیان جێبەجێبکرێت، دەبێت لوولەی تفەنگە ژەنگاویەکان بەرامبەر ئەو ئیرادە نوێیە چۆکدابدات، ئەو تووڕەییە تووڕەییەکی پیرۆزە، دەبێت رێزی لێبگیرێت، ئەو تووڕەییە تووڕەیی خوێنێکی نوێیە، کە خوێنە پیسەکان هەموو ئاسۆیەکیان لەبەردەم داخستووە، بۆیە پێویستە داواکانیان جێبەجێبکرێت، جگە لەوە چارەی تر نیە، هەزاران هێز کۆبکەنەوەو بیجولێنن، تازە ئێوە ناتوانن چیتر ترس و تۆقاندن بەرهەم بێنن، هێزەکان ئەگەر بتوانن دەیان گەنجیش تیرۆر بکەن، ئەوە ئەو کڵپەیە هەرگیز ناکوژێتەوە، چونکە کڵپەی ئاگری سەردەمێکی نوێیەو سەرەتای قۆناغێکی ترە، کە تیایدا چیتر رێگە نادرێت هەموو بەهاو پیرۆزیەکانی نیشتمان هەتک و ریسوا بکرێت.

8\12\2020

## تورکیاو گرێبەستە 50 ساڵیەکەی نەوتی هەرێم

زۆر دەبارەی مەسەلەی نەوتی هەرێم و گرێبەستی 50 ساڵە دەنورسرێت و گفتوگۆی لەسەر دەکرێت، بەڵام جێگای داخە زۆربەی نووسینەکان دەکەونە چوارچێوەی ململانێیەکی سیاسی ناتەندروست و تا ئێستا خوێندنەوەیەکی وردو ستراتیژی بۆ ئەو بابەتە نەکراوە. بەرلەهەموو شتێک پیویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەم، کە ئەو گرێبەستە هیچ بنەمایەکی یاسایی نیە، لەبەرئەوەی ئەو گرێبەستە ستراتیژیانە پێویستە پەرلەمان رەزامەندی لەسەر بنوێنێت، بەڵام کە ئەمە نەکراوە دیارە بەهۆی هەستیاری مەسەلەی کوردو ئاڵۆزی دۆخەکە دەتوانرێت پاساوی بۆ بهێنرێتەوە، چونکە نهێنی پاراستنی گرێبەستێکی لەم جۆرە لەناو پەرلەمان رەنگ بێت کارێکی ئاسان نەبێت، بۆیە دەتوانین بڵێین دۆخی تایبەتی هەرێمی کوردستان تایبەتەندیەکی جیاواز دەبەخشێتە ئەو گرێبەستە، بەتابەتیش دوای ئەوەی رۆژانە زانیاری زیاتر بڵاودەکریتەوە دەربارەی ئەوەی کەسایەتیە سیاسیەکانی حزبەکانی تریش، یاخود راستتر کەسایەتی یەکەم و بازنە زۆر نزیک و داخراوەکانی دەوروبەریان بەشوەیەک لە شێوەکان ئاگاداری ئەو گرێبەستە بووینەو کەم یا زۆر زانیاریان دەربارەی هەبووە، ئەمە دەکرێت شیکردنەوەی ئەوە بۆ بکرێت، کە بڕیاربەدەستانی پارتی رەچاوی هەستیاری بابەتەکەیان کردووەو هەوڵیان داوە رای ئەوانەی تریش وەربگرن، تەنانەت ئەگەر بۆ تێوە گلاندنیش بێت!. ئەمەش

ئەوە ڕووندەکاتەوە، کە تارادەیەک کۆدەنگیەکی دەستەبژێری سیاسی، ئەگەر ژمارەیەکی کەمیش و تەنانەت بۆ پاساو هێنانەوەش بێت لەسەر هەبووە.

مەسەلەی هەرزانفرۆشکردنی نەوتیش تا ڕادەیەک بەرامبەر بەگەورەیی ستراتیژیەتی بە پیشەسازیکردنی نەوت و شوێنکردنەوە لە بازاڕی سەرچاوەکانی وزەی جیهانی کارێکی زۆر سادەو ئاساییەو دەبێت تاکی کورد بە ئاسانی هەزمی بکات، لەبەرئەوەی هیچ کۆمپانیایەک و دەوڵەتێک ئامادەنیە خۆی بخاتە گێژاوی ئەو بابەتە ئاڵۆزەو وەبەرهێنان لە شوێنێکی ستراتیژی هەستیارو ئاڵۆزی وەکو هەرێمی کوردستان بکات، ئەگەر بە قازانجێکی گەورەو زۆر سەرنجی ڕانەکێشرێت و ختووکەی نەدرێت، هیچ کۆمپانیاو دەوڵەتێک ئامادە نیە سەرەڕۆیی بکات و نەوتی هەرێم بە نرخی یازاڕ بکڕێت، لەکاتێکدا دەتوانن لە دەیان وڵاتی نەوتی، کە پێگەیەکی یاساییان هەیەو بەبێئەوەی تووشی هیچ سەر ئێشەیەک بن، وەک کارێکی بازرگانی نەوتەکە بە نرخی بازاڕ بکڕن، کەواتە هەرزانفرۆشکردنی نەوتی کوردستان لە پەنای بەرژەوەندیە ستراتیژیەکان، کە بەپلەی یەکەم مانەوەی قەوارەی هەرێمی کوردستانە، تا ڕادەیەکی زۆر پاساوی خۆی هەیە!.

ئەگەر وابێت کێشەی ئەو گرێبەستیە 50 ساڵیە لەگەڵ تورکیا لەکوێدایە؟ لێرەدا دووستراتیژیەتی جیاوازو دژ بە یەک ڕووبەڕووی یەکتر دەبنەوە. ستراتیژیەتی تورکیا، کە لەڕێگای ئەو گرێبەستەوە سەرچاوەی سەرەکی داهاتی کوردستان، واتە ڕوحی ئابووری کوردستان بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە، بۆئەوەی هەرکاتێک ویستی وەک ئامڕازێکی سیاسی بەکاریبێنێت و جڵەوی سیاسی لە هەرێم بخاتە ژێر هەژموونی خۆیەوە!. بەرامبەر ستراتیژیەتی

هەرێم دێتە پێشەوە، کە مەبەستی سەرەکی لەو گرێبەستە 50 ساڵیەدا مسۆگەرکردنی مانەوەی خۆیەتی وەک قەوارەیەکی سیاسی.، ئەمە لەبنەڕەتدا کاریکی ڕەواو ئاوەزمەندانەیە، لەو روانگەیەوە ئەو گرێبەستە کارێکی باشەو دووربینیەکی ستراتیژی نیشان دەدات، ئەی کەواتە کرۆکی کێشەکە لە کوێدایە؟

لە راستیدا کرۆکی کێشەکە لەوەدایە، کە بەرپرسانی هەرێم درکیان بەوە نەکردووە، کە تورکیا نەوتەکەو قازانجی نەوتەکەی وەک تەکتیک بەکارهێناوە بۆ ئەوەی ئەو روانگەیە بۆ بەرپرسە کوردەکان روونبکاتەوە، کە لە کاتی تەنگانەدا دەتوانێت ببێتە فریادڕەس و پشتگیری هەرێم بکات، ئەمەش تا رادەیەکی زۆر ساویلکەیی و کەمئەزموونی سیاسەتمەدارانی کورد نیشان دەدات، چونکە ئەم هەنگاوە نەک بەرژەوەندیەکانی کورد ناپارێزیت، بەڵکو دەیخاتە ژێر هەڕەشەیەکی هەمیشەییەوە، ئەم دۆخە بۆ هەرێمی کوردستان وەک ئەوە وایە مەڕێک چاوەڕوانی ئەوە لە گورگ بکات بیپارێزێت!. کە لەکاتی تەنگانەدا نەک هەر نەیپاراست، بگرە بە هەموو توانەکیەوە دژی وەستا، باشترین نمونەش هەلوێستی تورکیا بوو بەرامبەر مەسەلەی ریفراندۆم

بۆ ئەوەی لە ستراتیژیەتی تورکیا تێبگەین دەبێت بە وردی درک بەوە بکەین، کە لە بنەڕەتدا ئەوەی لای تورکیا گرنگ نیە نەوتی هەرێمە، جا بڕەکەی هەرچەندێک بێت و جۆرەکەی هەرچۆنێک بێت، چونکە روانگەی تورکیا بۆ هەرێم روانگەیەکی ئابووری نیە هێندەی روانگەیەکی جیۆپۆلەتیکی و ستراتیژیە!. بۆیە دەبێت لەوە تێبگەین، کە تورکیا نەوتی کوردستانی وەک تەکتیک دەوێت، بۆئەوەی قازانجێکی ئابووری گەورە بەدەستبێنێت، بەرپرسانی کورد وەڵامی ئەو

تەکتیکەیان دایەوەو ئەو قازانجەیان بۆ تورکیا مسۆگەر کرد، بەڵام لە بەرژەوەندی جیۆپۆلەتیکی تورکیا تینەگەیشتن، کە چاوی لە خاکی هەرێمە و بە بەشێک لە وڵاتەکەی خۆی دەزانێت. بۆ زیاتر روونکردنەوەی ئەو بەرژەوەندیە جیۆپۆلەتیکیەی تورکیا با دانیشتنێکی کۆنگرەی لۆزان (1923) بە نمونە بهێنینەوە، لە یەکێک لە دانیشتنەکانی کۆنگرەی لۆزان سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا (لوید جورج) ئاماژەی بەوە کرد، کە لەکاتێکدا کۆنگرەکە خەرێکی گفتوگۆکانیەتی، کۆمپانیا تورکیەکان لە لەندەن لە دەرگای کۆمپانیا نەوتیەکانی ئێمە، واتە بەریتانیا دەدەن و کاغەزی سپیان دەخەنە بەردەم و ئامادەن هەموو گرێبەستێک ئیمزا بکەن تەنیا بۆ ئەوەی ویلایەتی مووسڵ بۆ ئەوان بێت. وەک مستەر جۆرج ئاماژەی پێکرد بەرپرسە تورکەکان راستەوخۆ بە بەریتانیەکانیان دەگوت نەوت بۆ ئێوەو ویلایەتی مووسڵێش بۆ ئێمە!. بۆیە تێگەیشتن لەوەی کەوا لەرێگای بەرژەوەندیە نەوتیەکانەوە دەتوانرێت تورکیا رازی بکرێت ببێتە هاوپەیمانی هەرێم و لەکاتی تەنگانەدا بە فریای کەوێت، یەکێک بوو لەو کێشە مەعریفیانەی، کەوا بەرپرسانی کورد لەو گرێبەستەدا دووچاری بوون!.

کەواتە سیاسەتی تورکیا لەرووی جیۆپۆلەتیکیەوە گەڕاندنەوەی ویلایەتی مووسڵ، واتە هەرێمی کوردستان بووە بۆ سەر تورکیا، ئەگەر بەهۆی دۆخی ئاڵۆزی هاوسەنگی و سیاسەتی جیهانی ئەمەی بۆ مەیسەر نەبێت، ئەوە بەلایەنی کەم دەتوانێت سیاسەتی دۆخی دیفاکتۆ پراکتیزە بکات و ئەو ناوچە سنووریانەی ئێستا داگیری کردووە، کە خەتێکی ستراتیژی گرنگە بۆ بزووتنەوەی کورد، لە بن دەستی خۆیدا بهێڵێتەوە، ئەمەش بەرێکەوتن لەگەڵ بەغدا بێت

یاخود بەسەرلەنوێ داڕشتنەوەی سنوور، بە تایبەتیش ئەگەر هاتوو ئەوەمانزانی، کە لەکاتی یەکلاییبوونەوەی ویلایەتی مووسڵ لەبەرژەوەندی ئێراق لە ساڵی (1925) و دیاریکردنی سنووری نێوان تورکیاو ئێراق، تورکیا داوای ئەو ناوچانەی دەکرد، کە ئێستا داگیری کردووە، بەڵام لەژێر فشاری بەریتانیەکان ئەمەی بۆ نەچووە سەر!

لەلایەکی تر، ئەگەر تورکیا نەتوانێت ئامانجەکانی خۆی بەتەواوی بێنێتە دی، ئەوا دەتوانێت لە رووی ستراتیژیشەوە کار بۆ دروستکردنەوەی مەنزومەی هەرێمی بکات و سەرلەنوێ قەوارەی هەرێم بە بەغدا ببەستێتەوە، بەشێوەیەک هەموو بەرژەوەندیە سیاسی و ئابووریەکانی خۆی مسۆگەر بکات و مەترسیەکانی مەسەلەی کوردیش بۆ ماوەی چەند ساڵێکی تر لە ناوچەکە دووربخاتەوە. لە ساڵی (2008) کار بۆ ئەم ئامانجە دەکات، کاتێک لێژنەیەکی هەماهەنگی هەرێمی لەگەڵ ئێراق و ئێران دروستکردووە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ دۆزی کورد، بانگهێشتکردنی سەرۆک وەزیرانی ئێراق لەمڕۆژانەدا، لەکاتێکدا دانوستان لەنێوان هەرێم و بەغدا بەردەوامە، رێک دەکەوێتە ئەو چوارچێوەیە، بەتایبەتیش ئەگەر هاتوو ئەوەمانزانی، بەشێکی زۆر لەو بابەتانەی بڕیاردراوە گفتوگۆی لەسەر بکرێت، پەیوەندی بە نەوت وەبەرهێنان و بواری ئابوری و ستراتیژیەوە هەیە، کەواتە تورکیا ئەو دەستکەوتە ئابوریانەی لەرێگای گرێبەستی 50 ساڵەوە بەدەستیهێناوە، زۆر بە ئاسانی دەتوانێت لەمەش زیاتر لەرێگای ئێراقەوە بەدەست بێنێت، لەبەرئەوەی ئێراق لەلایەک بەدۆخێکی ئابووری هەستیاردا تیدەپەڕێت، لەلایەکی تر چوونەوە بۆ ناو ئەو مەنزوومە هەرێمیە

دەبێتە هۆکارێک بۆ بەهێزبوونەوەی و گەڕاندنەوەی دەسەڵاتی خۆی بۆ سەر تەواوی خاکی وڵاتەکەی، واتە بە هەریمی کوردستانیشەوە، هەڵوێستی حکومەتی ئێراق لە دانوستانەکانی ئێستا و بە تەواوی ئەو راستیەی لێدەخوێنرێتەوە!.

کەواتە تورکیا لەوە گەیشتووە، کە رەنگ بێت گەڕاندنەوەی ویلایەتی مووسڵ لە ئێستادا کارێکی ئاسان نابێت، بە تایبەتیش لە دۆخێکی نێودەوڵەتی و جیهانی ئاڵۆزو ئەو گۆرانکاریە خێرایانەی ئێستا روودەدەن و قۆناغێکی نوێ لەشەڕی سارد دەستیپێکردۆتەوە خەریکە هەمدیس کوردستان، مەبەستم لە باشوورو رۆژئاوای کوردستانە دەبێتەوە ناوچەیەکی تامپۆنی لەنێوان چەند بەرەیەکی جیهانی جیاوازدا و دەشێت لە هەرچرکەیەکدا بێت دۆخەکە بە پێچەوانەی بەرژەوەندیەکانی ئەو بشکێتەوە. بۆیە دەبینین سیاسەتی تورکیا زۆر بەوردی لەسەر دوو ئاست کاری کردووە، لکاندنەوەی هەریمی کوردستان بە تورکیا بۆ هێنانەدی خەونە لەمێژینەکەی و نوێکردنەوەی ئیمپراتۆریای عوسمانی نوێ، یاخود گەڕاندنەوەی هەرێم بۆ باوەشی ئێراق، بەمەرجێک هەموو ئەو دەستکەوتە ستراتیژیانە بۆ خۆی مسۆگەر بکات، کە لەگەڵ هەرێم بەدەستی هینابوو، دیارە دوای بەهێزبوونەوەی روسیاو بووژانەوەی چین، ئەو سیناریۆیە لە واقع زۆر نزیکترە، کەواتە تورکیا لە هەردوو ئاستەکەدا براوە دەبێت، ئەوەی لێرەدا زەرەمەند دەبێت تەنیا کوردو مەسەلەی کورد دەبێت.

شایەنی ئاماژە بۆ کردنە بەتەنیا ئەو کورتبینیەو کەموکوڕی مەعریفی ستراتیژی و شارەزا نەبوون نەبووە بە سیاسەتی تورکیا، بەڵکو کارکردن لەسەر ئاڕاستەی بەخێڵکردنی دامودەزگاکانی هەرێم و بە کەسیەتی کردنی

پەیوەندیەکان لەگەڵ تورکیا، کارەساتێکی تر بووە بۆ کورد، ئەو گرێبەستە لەجیاتی ئەوەی بۆ بەهێزکردنی دامودەوگاکانی هەرێم بەکاربهێنرێت، بۆ بەهێزکردنی بنەماڵەو دامودەزگاکانی خێڵ بەکار هاتووە، بۆ قۆرخکردنی سیاسەتی ناوەخۆو جڵەوکردنی هێزو کەسایەتیە سیاسی و رۆشنبیریەکانی تر بەکارهاتووە، تورکیاش لەو گرێبەستەدا مامەڵەی لەگەڵ هەرێم وەک قەوارەیەکی سیاسی و یاسایی نەکردووە، بەڵکو لەروانگەی خێڵێکەوە رەفتاری کردوە، بەمەش گرنگی ستراتیژی پیشەسازی نەوتی بۆ مەسەلەی کورد لە بنەماوە چرووک پێکردووە. هەبێت، رێک پێچەوانە بۆتەوە، تەنانەت لەرووی ئابووریشەوە، لە جیاتی ئەوەی داهاتی نەوت بۆ بونیاتنانەوەی ژێرخانی ئابووری هەرێم بەکاربهێنرێت، بەهۆی گەندەڵی و کۆنترۆڵکردنی داهاتەکە لەلایەن تورکیاوە، نەتوانراوە تەنانەت بۆ مووچەی فەرمانبەرانی هەرێمیش سوودێکی ئەوتۆی لێببینرێت!

لەکۆتایدا دەتوانین بڵێین تورکیا لەو گرێبەستە سوودمەندی یەکەمەو ئەگەر توانی هەرێم، یاخود بەشێکی هەرێم بە بەخۆی بلکێنێتەوە، ئەوە هەرێم و نەوتەکەی دەکەوێتە ژێر دەست، ئەگەر لەمەشدا سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا، ئەوا نەک بە تەنیا رێگای لەگەشەسەندنی قەوارەی هەرێم گرت، بگرە لە هەموو بنەماکانی سەربەخۆبوون و تەنانەت مانەوەشی داماڵیوە.

2020\12\14-15

**تێبینی:** ئەم وتارە بە دووبەش بڵاوبووەوە، لێرەدا هەردوو بەش بەیەکەوە دانراوە

## قۆناغێکی هەستیارو چارەنووسئامێز

لە دوای راپەڕینەوە هەریم لە هەستیارترین و لاوازترین دۆخیدا دەژیت، هەرگیز وەک ئێستا پشتی تێنەکراوەو نەدراوەتە دەستی قەدەر، لە ناوەوە دۆخی ئێجگار شڕە، حزبەکان لەگەڵ یەکتر ناکۆکن و بەردەوامن لە چاڵ هەڵکەندن بۆ یەکتر، خەڵکیش لە هەموو حزبەکان بێزارەو وەک دەڵێن تووڕەیی گەیشتۆتە سەری لووتی و چاوەڕێی دەرفەتێک دەکات تۆڵەی خۆی لەو دەسەڵاتە بکاتەوە، بە بێئەوەی بیر لەوە بکاتەوە دواتر چی دەبێت و چی نابێت. گەندەڵی و لاموبالاتی هەموو جەستەی حکومەتی هەرێمی گرتۆتەوە و گەیشتۆتە قۆناغێک تازە هیچ پزیشکێک ناتوانێت چارەسەری بکات و دەبێت چاوەڕوان بین، کەی دواهەناسە هەڵدەمژێت و دەچێتە ناو لاپەڕە خوێناویەکانی تری مێژوو، هاوسەنگی هێز لەبەرژەوەندی بەغدا گۆڕاوەو بەرامبەر گەمە هەرێمەیەکە هەرێم تا ئەوپەڕی بچووک بوونەوە بچووک بۆتەوە، دەوڵەتە رۆژئاواییەکانیش بەرامبەر ئەو سیاسەتی برسیکردنەی لەلایەن بەغداو دەسەڵاتی کوردیەوە دژی خەڵکی کوردستان جێبەجێدەکرێت بێدەنگە. دەستی حزبەکانی کوردستان بەگشتی و یەکێتی و پارتی بە تایبەتی لەلایەن دەوڵەتانی هەرێمیەوە، تورکیاو ئێران بە توندی کەلەپچە کراوە. هاوسەنگی هێزی جیهانی گۆڕاوەو

قۆناغێکی نوێ لەشەڕی سارد لەنێوان زلهێزەکان دەستیپێکردۆتەوە، هەمدیس کوردستان بۆتەوە ناوچەیەکی تامپۆنی و خەریکە دەرهاویشتەکانی ئەو شەڕە نوێیە لەباریەکی هەڵدەوەشێنێتەوە. سەرکردەو بنەماڵەکانی کوردستان گەیشتوونەتە ئاستێک، کە تەنیا لە خەمی رزگارکردنی سەری خۆیان و ئەو سەروەت و سامانەدا بن، کە لەماوەی 30 ساڵی رابردوودا کۆیان کردۆتەوە، سەرباری ئەمەش لەژێر فشاری هێزە هەرێمیەکان خەریکە دووچاری قۆناغێکی تری شەڕی بەوەکالەت دەبنەوەو ناچار دەکرێن دەست لە هەوکی یەکتر بنێن. بە داخەوە سەرەتاکانی ئەو شەڕە بەکردەیی دەستیپێکردووە، ئەگەر درێژە بکێشێت و بەردەوام بێت، رەنگ بێت دوا بزمار بێت لە تابووتی قەوارەی هەرێم بدرێت. ئێستا سالآنی نەوەدەکان نیە، ئەمریکاو رۆژئاوا بێنە سەرخەت و لە پاریس و دبلن و واشنتۆن، هەوڵبدەن دەستی نەوەکانی بارزانی و تاڵەبانی بخەنە ناو دەستی یەکتر، ئێستا بەهۆی گۆڕانی هاوسەنگی هێزەوە، وا پێدەچێت لێیانگەڕێن بۆ دەستی قەدەر، ئەو بێدەنگە جیهانیەی ئێستا بەرامبەر ئەو رووداوانەی لە کوردستان روودەدات، تەنیا ئەو خوێندنەوەی بۆ دەکرێت

هەر چارەنووسێکی نەخوازراو روبەڕووی هەرێم بێتەوە، جگە لە کورد خۆی کەسی تر بەرپرس نیە، بەپلەی یەکەم یەکێتی وپارتی بەرپرسی یەکەمن و لە داهاتووتدا هیچ کەسێک، یاخود مێژوونووسێک

بیەوێت دەربارەی ئەو قۆناغە بنووسێت، ناکرێت پاساو بۆ ئەو شکستانە بێنێتەوەو وەک قۆناغەکانی تری مێژووی کورد ئۆباڵەکەی بخاتە ئەستۆی فاکتەری دەرەکی، چونکە لەماوەی رابردوودا ئەو حیزبانە گەورەترین دەرفەتی مێژووییان کردە قوربانی بەرژەوەندیەکانی خۆیان و هەر خۆشیان دەبێت بەرپرسیاریەتی هەر چارەنوسێکی نەخوازراو لە ئەستۆ بگرن.

2020\12\16

## دروستکردنی هەڵوێستێکی نوێ بەرامبەر مێژوو

جیاوازیەکی زۆر هەیە لەنێوان نوسینەوەی مێژوو و دروستکردنی مێژوو، ئەوانەی مێژوو دروست دەکەن، جیاوازن لەوانەی مێژوو دەنووسنەوە، هاوکات پەیوەندیەکی پتەویش لەنێوان مێژوونوسان و دروستکەرانی مێژوو هەیە، ئەوە مێژوونوسەکانن رووداوەکان هەڵدەبژێرن و تۆماری دەکەن و بۆ نەوەی داهاتووی دەگێڕینەوە، ئەوە دروستکەرانی مێژوون مێژوو دەخوێننەوەو سوودی لیوەردەگرن و زۆر جارانیش لاسایی دەکەنەوە.

کەواتە مێژووی هەموو نەتەوەیەک دەوەستێتە سەر دوو لایەن، ئەوانەی مێژوو دروست دەکەن و ئەوانەی مێژوو دەنووسنەوە، بەلام نابێت ئەوە فەرامۆش بکەین، کە تای تەرازوەکە هەمیشە لەبەرژەوەندی مێژوونوسەکاندایە، لەبەرئەوەی راستە رووداوەکان کەسانی لێهاتوو و بەتوانا دروستی دەکەن و هەنگاوی یەکەمە بۆ نوسینەوەی مێژوو، بەڵام ئەوە مێژوونوسەکانن لەنێو کۆمەڵێک رووداودا یەکێک هەڵدەبژێرن و تیشکی دەخەنە سەرو دەیکەن بەمێژوو، رەنگ بێت هەزاران کاری گەورەو رووداوی گەورە لەمێژوودا کرابێت و روویدا بێت، بەلام لەبەرئەوەی مێژوونوسان لایان لێنەکردۆتەوە نەکەوتوونەتە ناو مێژوو فەرامۆشکراون.

نوسینەوەی مێژوو بە پلەی یەکەم دەوەستێتە سەر ویژدانی مێژوونوس دواتر سەر دنیابینی و ئاستی تێگەیشتن و رۆشنبیری مێژوونووس، لەبەرەئەوە وەک خاڵی یەکەم ئاماژەمان بۆ ویژدان کرد، چونکە هەمیشە دەسەلاتداران کاریان لەسەر مێژوونوسان کردووەو ویژدانیان کڕیون بۆ ئەوەی کارە ناڕەواو تاوانەکانیان و ترسنۆکیەکانیان، وەک کاری رەواو مرۆڤانەو قارەمانیەتی بۆ بنووسنەوە، مێژوو ئەو بابەتە بووە، کە هەمیشە دەسەلاتداران لە دەوری خولاونەتەوەو هەوڵیانداوە فریوی بدەن.

ئەوەی لەمێژوودا مەترسیدارە بە تەنیا مامەڵەکردن لەگەڵ رابردوو نیە، بەڵکو لەزۆربەی کاتدا مێژوو ئاڕاستەی داهاتووش دەکات، بۆیە ئەو گەلانەی دەیانەوێت داهاتوویەکی گەش بۆخۆیان دابین بکەن، پێویستە بزانن چۆن مێژوو دەنوسنەوە و مامەڵەی لەگەڵ دەکەن. کلۆلی لەنوسینەوەی مێژوو ئایندەیەکی نادیار دروست دەکات، رەخنەگرتنیش لەمێژوو، ئەگەر بێتوو ئەلتەرناتیڤ و روانگەی نوێی بۆ ئایندە پێنەبوو، ئەوا فەوزاو سووککردن دروست دەکات، ئەستوندەی ئەو بەهایانە هەڵدەتەکێنێت، کەوا کۆمەڵگاکەی لەسەر بەندە. بۆیە چۆن دەبێت لەنوسینەوەی مێژوو هوشیار بین، پێویستە لەخوێندنەوەو رەخنەگرتنیش لەمێژوو هوشیار بین!.

جێگای داخە لەناو کایەی رۆشنبیری و تەنانەت ئەکادیمی کوردیش هیچ بایەخ بەو دوو رەهەندە نەدراوە، هەربۆیە دەبینین ئێستا کۆمەڵگای کوردی لە فەوزاو بێبەهاکردنێکی ترسناک دەژی، لەپەنای رۆشنبیری و رەخنەوە خەریکە کورد بەدەستی خۆی هەموو شتێکی خۆی بێبەهاو چرووک دەکات، دەرئەنجامی ئەمەش هاتنە کایی نەوەیەکە، هیچ بەهایەکی لا نەماوە تا بتوانێت وەکو پێویست رێزی خۆی بگرێت و شانازی بەخۆیەوە بکات، ئەمە کارەساتێکی گەورەیەو جێگای هەڵوەستە کردن و بەخۆداچوونەوەیە، دەبێت کار لەسەر ئەوە بکەین مێژوو بەشیوازێک بنووسینەوە بە تەنیا شکست و ناشرینیەکان وێنا نەکات، بەڵکو دەبێت جوانیەکانیش نیشان بدات و زەقیان بکاتەوە، کۆمەڵگای ئیمەو مێژووی ئیمە پرە لەکاری جوان و هەڵوێستی جوان، ناکرێت لەپەنای رەخنەوە هەمووی سووک و بێبەها بکرێت، دەبێت هەڵوێستێکی نوێ بەرامبەر مێژوو وەربگرین، دەبێت لەمێژووەوە ئایندەیەکی وا هەڵێنجین، کە دابڕینێک دروست بکات لەگەڵ قۆناغی درێوی و شکستەکان، دەبێت کار لەسەر نووسینەوەی مێژوو بکەین بەشیوازێکی تر، بۆ ئەوەی ئایندەمان بخەینە سەر رێچکەی ئاڕاستەیەک، کەبەرەو بنیاتنان و سەرکەوتنمان ببات.

2020\12\29

## نوسەر لە چەند دێڕێکدا

کامەران احمد محمدامین (کامەران مەنتک)

قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی لەشاری هەولێر تەواو کردوە .

ساڵی 1982 ئامادەیی پیشەسازی بەشی کارەبای لەهەولێر لەتەواو کردوە .

ساڵی 1992 بەشداری لەتاقیکردنەوەی دەرەکی بۆ پۆلی شەشەمی ئامادەیی بەشی وێژەیی کردوە .

ساڵی 1997 بەکالۆریۆسی لەمێژوو ، لەکۆلیژی ئەدەبیاتی زانکۆی سەلاحەدین بەدەست هێناوە .

ساڵی 2000 ماستەر لەمێژوو ، هەر لەهەمان کۆلیژو زانکۆدا .

ساڵی2007 دکتورا لەفەلسەفەی مێژووی پەیوەندییەنێودەوڵەتییەکان ، زانکۆی موسڵ.

-ساڵی 2000 بەکالۆریۆس لەیاسا ، زانکۆی سەلاحەدین.

- لە ساڵی 2011 پلەی زانستی بەرزکراوەتەوە بۆ پلەی پرۆفیسۆری یاریدەدەر.

- ساڵی 2017 پلەی زانستی بەرزبۆتەوە بۆ پلەی پرۆفیسۆر لە بواری فەلسەفەی پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکان.

**ئەزموونی وانەبێژی**

لە-2004 لەکۆلیژی مافی زانکۆی سەحەدین وانەی گوتوەتەوە

وەک وانەبێژێک لەبەشی راگەیاندنی پەیمانگای تەکنیکی هەولێر وانەی گوتوەتەوە.

ئێستا مامۆستایە لەکۆلیژی زانستەرامیاریەکان لەزانکۆی سەلاحەدین - هەولێر

**بەرهەمەبڵاوکراوەکانی**

**بەزمانی کوردی**

**ئەدەبی**

فرمێسکی ئەستێرە،- شعر- 1988

پریاسگەی رێگای سەرکەوتن ، چامە1992

بێوار ، رۆمانێکی مێژوویی ، بەرگی یەکەم _کۆچ- 2004

بێوار ، رۆمانێکی مێژوویی ، بەرگی دووەم ، گێژەن – 2005

**فەلسەفەی پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکان**

- کوردستان لەنێوان ململانێی نێودەوڵەتی و ناوچەییدا ، توێژینەوەیەکی سیاسی – ئابووری. بڵاوکراوەکانی دەزگای سەردەم، 2000

-کوردستان لەسیاسەتی هەرێمایەتیدا 1932-1955، بڵاوکراوەکانی سەنتەری نما، 2010.

-بازرگانی رەشی نەوت و دارشتنەوەی پەیوەندیە هەرێمایەتیەکان، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، 2017

-دارمان و بەکۆتا هاتنی ئیمپراتۆریای ئەمریکی، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، 2017

- کوردستان بەرەو کوێ، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، 2018

- کورد لە پرۆژەی رێگای ئاوریشمی نوێدا – توێژینەوەیەک لە دیپلۆماسیەت و ستراتیژەتی چین لە دەستپێشخەری -پشتێنەو رێگا، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، 2020.

- پەیوەندیەکانی نێوان تورکیاو رێکخراوی داعش لە روانگەی کۆمەڵگای نێودەوڵەتیەوە، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، 2020

**فەلسەفەی مێژوو**

- ئازادی لەنێوان فەلسەفەو یاسادا ، توێژینەوەیەک لەفەلسەفەی یاساو سیاسەتدا، بڵاوکراوەکانی دەزگای سەردەم، 2005
- دیالێکتیکی زەمەنی مێژوویی و خوێندنەوەیەکی تر بۆ زانستی مێژوو، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر 2017
- شیکردنەوەو هارمۆنەتیزەکردنی مێژوو، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر 2018

**وەرگێڕان**

-سوسیالیزمدا ئێستاو لەداهاتوو ، 1984.

**بەزمانی عەرەبی**

**فەلسەفە**

-السیاسە الدولیە فی ضوء فلسفە الحضارە، دراسە تحلیلیە نقدیە، دار المعرفە، لبنان ، 2009.

**بەرهەمە بڵاونەکراوەکانی**

**ئەدەبیەکان**

-بێوار، بەرگی سێیەم، گەڕانەوە. رۆمان

-تۆڵە، رۆمان.

-گوڵی ئەفسوناوی ، کورتەچیرۆک گوڵی ئەفسوناوی ، کورتەچیرۆک.

-هاواری بێدەنگ، کۆمەڵەشیعر

### توێژینەوە(کتێب)

- کوردستان لە قۆناغی تێکشکانی سیستەمی تاک جەمسەری و دەستپێکردنی شەڕی دووەمی سارد

-کۆبانی و مملانێیەنێودەوڵەتییەکان

-تورکیاو کۆمەڵگای نێو دەوڵەتی

-ئازادی و شارستانیەت ، توێژینەوەیەک لەفەلسەفەی مێژوو.

-نەتەوایەتی و بزاڤی نەتەوایەتی کوردی.

-راپەڕینەکانی کوردی لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم لەژێر رۆشنایی گۆڕانکاریەئابوریەکاندا.

-کۆمۆتراژیدیاکانی هەرێمی کوردستان و مانیفێستی قۆناغێکی نوێ

-کوردو بەدیموکراتیزەکردنی کۆمەڵگای کوردی

-زانکۆ یا نەزانکۆی سەلاحەدین، نوقورچێکی توند لەجەستەیەکی مردوو

### بە زمانی عەرەبی

-إنحطاط الامبراطورية الأمريكية وسقوطها - دراسة في ضوء فلسفة الحضارة.
-النفط وإعادة صياغة العلاقات الاقليمية في الشرق الاوسط، دراسة في ضوء فلسفة العلاقات الدولية
-ثلاثية القوى العظمى(روسيا، الصين، الهند) ومستقبل أوراسيا
-دراسة تاريخية سياسية تحليلة

-تغير طبيعة القوى وأثره في العلاقات الدولية- دراسة في ضوء فلسفة العلاقات الدولية
-الحرية بين جدلية العقل والارادة - دراسة فلسفية تاريخية

**وتار**

-لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لەوتارو نووسین لەگۆڤارو رۆژنامەو ماڵپەڕەکوردیەکاندا.

**ئیمەیلی نووسەر:**

Kamaran.amin1@su.edu.krd

k.mentk@yahoo.com

